دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- بەرمیلی قوپاو (ڕۆمان)
- نووسینی: حەمەکەریم هەورامی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- پیتچنین: فەوزی مەعروف
- بەرگ: هۆگر سدیق
- ژمارەی سپاردن: 386
- نرخ: 3000
- چاپی دووەم 2008
- تیراژ: 500
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (235)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## (1)

دوو ڕۆژ مابوو بۆ جەژنی نەورۆز، بارام ئەفەنی وای دانابوو بەو بۆنەوە شتێك دەربارەی جەژن و کارەساتەکەی هەڵەبجە و ئەنفال و ڕزگارکردنی شاری بابا (گوڕ گوڕ) بنووسێ.. بەڵام کارەساتی بەرمیلەکە هەموو نەخشە و پرۆسەیەکی ڕۆژانە و حەفتانەی لێ تێکدا و دوکانچەی هۆش و مێشکی بەسەر ژێرخانی هەناویدا تەپان و دەستخەڕۆی کرد..

خۆ مەسەلەی بەرمیلەکە، شتێکی وا نەبوو، ئەگەر ئەو بە کارەساتە گەورەکەیەوە نەبەستایە. ئەوەی دەهاتە ڕێی بەچمکێکی ئەو کارەساتەی دەزانی، لە وەختی خواردندا پاروی لە قوڕگ گیر بوایە، یان لە ڕێدا قاچی هەڵزەنیایە، هەر دەیبردەوە سەر ئەو کارەساتە.. کارەساتە گەورەکە..کارەساتی وڵاتی داگیراو.

هەر دەم دەیوت: خۆ کارەساتی ئێمە هەر ژێر دەستەیی و داگیرکراوی و ئەنفال و کیمیاوی باران و تالآن و بڕۆکردن و بێ دەرەتانی و کۆیلایەتی ئەم سەردەمە نییە. ئەوانە و هەزارانی وەك ئەوانەش لق و پۆپی کارەساتە گەورەکەن کە نەبوونی قەبارەو خۆ لەدەسدانە، خۆ ئەگەر پێشینانمان گیرۆدەی ئەو ستەمە نەبوایەن ئێستا ئێمەش وا نەدەبووین.. ئەو کارەساتە، چونکە بەر لە بوونمان چۆکی لەسەر سنگمان داناوە، ئەگەر بیری لێ نەکەینەوە لە وانەیە بە کارێکی ئاسایی بزانین، ئەگەر نەی بزوێنین لە وانەیە ئازارەکانی پەردەی خامۆشی بپۆشن و برینەکان قانگ بدەن و سڕیان بکەن، بۆ بەرژەوەندی ژیانی کۆیلایەتی سەر شۆڕی دروست بکەن، ئافەرین بۆ ئەو کەسەی کە وریایە و بەو فێڵە دەروونییە تەفرە نادرێ..

وردە ڕوداوە ناهەموارەکان، چونکە بنجی خۆیان لەسەر کارەساتە گەورەکە داکوتاوە و زادەی ئەون لەمە دەهروژێن وشکە کەڵەکی ئازاری برینە خەفەبووەکان لە ناخەوە دەڕمێنن و بەسەر برینەکاندا دەکەون و خۆیان خەست دەکەنەوە و زاوزێ دەکەن و دەبنە دۆزەخ..



ئەو قوڕ بەسەرانەی کە وەك بارام ڕووداوەکانیان لێکدەدایەوە، ژیان تاڵ و نەگونجاو بوون، هەمیشە لە ڕاپەڕین و ڕەتکردنەوەی شتە باوەکاندا بوون..

ڕۆژانە بارام ئەو شتانەی بە بیر خۆیدا دەهێنا و دەبرد، لە سەرەوە بۆ خوارەوە وەك تەزبێح ژمار بکەی بە فیکری خۆیدا دەی هێنان و دەیبردن، خەمی هەموو کەسی بە کۆڵ خۆیدا دابوو، دەنا بۆ خۆی چ کەمییەکی وەهای نەبوو، بەزەیی بەو خەڵکەدا دەهاتەوە کە چۆنیان توانیوە وا خۆیان لە گێلی بدەن، گەلێ جاریش بەزەیی بەوانەدادەهاتەوە کە ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن و برینەکانیانی دەهێنایەوە سوو، خۆی وا ڕاهێنابوو کە هەمیشە لەناو کورخانی ئازارە دەروونییەکانیدا خۆی دەمە زەرد بکاتەوەو جۆش بخوا، لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی لەسەرخۆ بوو کەباسی کارەساتەکان دەکرا، سوور دەبووەو جۆر کرژییەك لە وتەکانیدا هەست پێ دەکرا..

وەنەبێ بەزم و ڕووداوی بەرمیلەکە تاکە کارەساتی ژیانی ڕۆژانەی بارام ئەفەنی بووبێ، ئەو بەو جۆرە ڕووداوانە قاڵ ببوو، خۆئەگەر ڕۆژەکەی وانەبوایە، ئەو ڕووداوە لەناو ڕووداوەکاندابێ بایەخ بوو..

ئەوەی پتر بارامیان نارەحەت دەکرد، ئەو قسە بێ سەروو بنانەی ناو کۆمەڵ بوون کە ئەگەر یەکێك گەرەکی بوایە داخی دڵی خۆی لەسەر شتێکی نالەباری قەوماو دەربدات خەڵکەکە قسەی سڕ و ڕزیویان بەسەر داخەکاندا دەکرد و دەیانوت: دیارە بەختی خۆتە ..! وات لەچارە نووسراوە.! بەو جۆرە پینانە برینەکانیان سڕدەکردن و وایان دەزانی ئازارەکانیان هەتا هەتایە سەرکوت دەبن..

بارام دەیزانی خەڵکی بەو جۆرە پینانە خۆیان لە ڕاستیەکان دەدزنەوە دەسەڵاتیان لغاو دەکرد.. ئەو جۆرە بۆچوونانەش لای بارام لە مەسەلەی بەرمیلەکە کەمتر نەبوو، ژیان لای خەڵك تەخت و ڕەخت بوو، تەنها سەرەلەقێی دەویست کەچی لای بارام خۆشییەکەی لەوەدابوو پڕ بە کۆسپەو مرۆڤ وریا دەکەنەوە.. خۆی لا مەبەست نەبوو، هەمیشە خۆی لەناو جەنگڵستانی کوێرەوەری و کلۆڵی میللەتەکەیدا بەدی دەکرد، لای خەڵك ئازارەکان سڕ دەبوون، لای ئەو گەشەیان دەکرد، لەو باوەڕەدا بوو خۆ تلان بەسەر نەشتری کولانەوەی برینەکاندا جۆرێکە لە هۆشیاری و خۆ بە ئاگاخستنەوە، لەو بارەوە بەتووندی گلەیی ڕەوانەی پێشنیان دەکرد، کە تووڕەش دەبوو نەفرەت بارانی دەکردن و دەیوت:

ئەگەر ئەوان کەمتەرخەمیان نەکربایە، هەڵبەتە ئەمڕۆ ئێمەیش خاوەن ماڵ و حاڵی خۆمان دەبووین و خۆمان گێڕەمان بۆ خۆمان دەکرد، ئەو کاتەش ئەو وردە ڕووداوانەمان دەخستنە ئەستۆی خۆمان و خۆمان بەرامبەریان دەدۆزییەوە..

ئەم کارەساتانە بە گەورە و بچووکیانەوە دەسکردن و بۆ ونبوون و ڕەتاندنی خەڵك دروست کرابوون، تا هەر خجڵ بن و نەیان پەردەژێتە سەر خۆیان..

دەنا بەرمیلێك چییە لەو ڕۆژانەدا پیاو سەر نوگم بکات و شتەکانی لێ تێك بدات.. ئەگەر وا نەبووایە بارام بەسەرخۆیدا نەدەشکایەوە و هەر هیچ نەبووایە لەو ڕۆژەدا گۆڕانییەکی بە باڵای نەورۆزدا دەچڕی و پڕ بە دڵ بۆ شەهیدانی کیمیا بارانی هەڵەبجە، فرمێسکە خوێناوییەکانی بە نووکی خامەکەی دەرردەدا و لەناو تاوەی یادگارەکانیدا دەیقرچانەوە و وێنەی کاوەی شۆڕشگێڕی پێ دەنەخشان..

ئای بەرمیلەکە ئەوەی تۆ کردت کەس نەی کردووە..

بارام ئەفەنی لە نووکەوە کارەساتی بەرمیلەکەی گێڕایەوە:

لە دڵەوە دەیزانی ڕووداوی بەرمیلەکە شتێکی ئاساییە و پێویست بە گێڕانەوەی ناکات، بەڵام لای ئەو بەزمێکی وای دروستکرد سەروبنی گەلێ شتی لێ تێکداو بەرەو ڕەوتێکی تری وا رایکێشا وەرچەرخانێك بوو لە ژیانی ئەودا.. خەریك بوو بیخاتە سەر ئەو باوەڕە کە وابزانێ ڕووداوە مێژووییەکانی مرۆڤ لە شتێکی بێ بایەخی واوە سەریان هەڵداوە دەنا خۆیان شایستەی ئەوە نەبوون باس بکرێن..ئەوانەش کە لەم وڵاتەدا دەقیان ژیانەوە گرتبوو، یان هیچ میللەتێکی تریان نەدیبوو کە چۆن دەژین، ڕەنگە ئەو جۆرە ڕووداوانە بەکارەسات نەزانن، دەنا دەبوو بە زووترین کات هەرایەکی گەورەتر لە ڕاپەرین و شۆڕش کردن ڕوی بدایە..

بارامێکی فەرمانبەر، خاوەن کۆشێ منداڵ مووچەکەی بەشی چەند ڕۆژێکی نەدەکرد، لەبیست و یەکی مانگدا کە یەکەم ڕۆژی جەژنی نەورۆز بوو نەیدەهێشت وەك ڕۆژێکی ئاسایی لەسەری بگوزەرێ، ئێوارەی نەورۆز ئاگرەکەی دەکردەوەو هەندێ خواردن و بتڵە نەوتێك و شاپلیتەیەکی دروست دەکرد لە بۆرییەکی دەئالاندو لەسەر نەردەوانی خانووەکەی قیتی دەکردەوەو لەمە تاریکی ئێوارەی جەژن دەهات پەیتا پەیتا نەوتی پیادەکردو ئاگری تێبەردەدا و یادی ئاگرەکەی کاوەی پێ دەکردەوەو لە دڵی خۆیدا دەیوت ئەمە یادی ئەو ڕۆژەیە کە ئادەمیزاد بۆ یەکەمجار فێری ئاگر بەکاهێنان بوو..



لەو ڕۆژەدا هەندێ ئالۆگۆڕی لەسەر ڕەوتوو ڕەویەی ماڵدا دەهێنا بۆ ئەوەی منداڵەکانی هەست بکەن جەژنی نەورۆز تازە بوونەوەیە، لەپەناوە ئەوەشی رادەگەیاند کە جەژن، چوونەوە ناو قالبی رابردوو نییە، جەژن گۆڕاندن و وەرچەرخاندنە و ئالوگۆڕە لە ڕەوش و ڕەویەی ئەوەدا کە هەیە دووپاتەو ڕووکردنە لای شتی نوێ..

لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەوت: ئەگەر ئالۆگۆڕێك لەو جەژنەدا نەبێ چۆن بە منداڵەکانمان بڵێین نەورۆز واتە شۆڕش، شۆڕش واتە ئالۆگۆڕ لە ڕەوشتێکەوە بۆ ڕەوشتێکی تر، چۆن گۆڕان لە ڕەوشی مرۆڤدا هەیە وەهاش لە گێتی و گەردووندا هەیە، ئەوە نییە لە نەورۆزدا زەوی لەسەر هێڵی ڕاستی خۆی رادەوەستێ و ناوقەدی خۆی دەکاتە پشتێن و تیشکی ڕۆژ لە ناو کەمەرەی خۆی ڕاست دەبەستێ و تەرازووی شەو و ڕۆژ لەو ڕۆژەدا بێ سەرکردن رادەگرێ، هەردوو جەمسەری زەوی ڕاست دەبنەوەو بەهار دێ و زستان دەڕواو سروشت سەرتاپا خۆی ئارایش دەدات و زەماوەندی زاوزێ کردن هەموو شتێ دەباتەوە تافی منداڵی و چی گەنجینەی هەیە دەری دەداتەوە..

منداڵانی مووچە خۆرانی جاران لە جەژنی نەورۆزدا تاکە منداڵ بوون بەوبۆنەوە جلی ڕەنگاو ڕەنگیان دەپۆشی، بەڵام لەوەتەی ئەنفالچییەکانی جاران گرایان لەم وڵاتەدا داناو لەم سەردەمەدا پتروکان و بەسەر پێ کەوتن و وەربوونە دەورووبەریان زاخاوی بیرە کۆنەکەیان کردە ژەهر پژان و تەڕو وشکیان بەیەکەوە سووتان و بەرەچەڵەك چوونەوە سەر ڕەگەزە کۆنەکەیان کە هەموو دەزگایەکی حەوانەوەو پشوودانیان سەرنخون کردو چی سەرەداوی بەرهەم هێنان و یاسای کۆمەڵ هەبوو بە دەست خەڵکەوە نەیان هێشت و هەموویان قرتان و وای بەسەردا ڕشانەوە کە قەت شین نەبێتەوە..

چەند ڕۆژێك بەر لە جەژن لە ناو فەرمانبەرانی فەرمانگەکەی بارام ئەفەندیدا دەنگێك پەیدا بوو، لە چەند چرکەیەکدا سەرتاسەری فەرمانگەکەی تەنییەوە، گوایا بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە وەك جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان جەژنانەیەك بە مووچە خۆرەکان دەدرێ، جگە لەوەش هەر بەو بۆنەیەوە لیستێك بەناوی هەموو فەرمانبەرەکانەوە دەنووسرێ، هەر فەرمانبەرێکی ناو ئەو لیستە نیو بەرمیل نەوتی دەدرێتێ، ئەم هەواڵە خۆی لەخۆیدا مژدەیەکی دڵ فێنکەرەوە بوو بۆ سەرجەم فەرمانبەرەکان، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە بەردەست و کار گوزار بوون، چونکە لەو بۆنانەدا خۆیان وەك فەرمانبەرەکانی تر دەدیبیەوەو لە مافدا یەکسان دەبوون..

هەواڵەکە ئەوەشی دەگەیاند کە لێپرسراوە گەورەکان بەتەواوەتی لە فەرمانبەرە بچووکەکان دانەبڕاون و هێشتا خاوەن لوتف و میهرەبانن و جارانی خۆیان لەبیرماوە..

هەر فەرمانبەرێك لە هۆشی خۆیدا چەندین پرۆسەی خەیاڵاوی بۆ خەرجکردنی ئەو جەژنانەیە دانابوو، دەیانوت خۆ جەنابی وەزیر خۆی دەزانێ پارە ئەو نرخەی جارانی نەماوە، پێویستییەکانی رۆژانەی ژیانیش دەیان قات و قورستر و گرانتر بوون، کەواتە جەژنانەیەکی وا دەدات کە کەلێنێ پڕ بکاتەوە، نیو بەرمیل نەوتیش لەو رۆژەدا کەم نەبوو، لەکاتێکدا کڕینی لیترێ نەوت لە ویزەی مووچە خۆراندا نەمابوو کە هەموو رۆژێ بیکڕن، با زستانیش پشتی لەسەرما کرد بێ، بەڵام هێشتا باران و لێزمەی بەهار بەدەمییەوە مابوو، کێ ناڵی زستانەکەی دوا ناخات:؟.

منداڵە سەرمابردووەکانی ئەو زستانەیان لەم دواییەدا تێر لەبەر سۆپەی گەرمدا خۆیان دەکەنەوەو دەمارە سڕبووەکانیان خاو دەکەنەوەو خۆیان دەوەژن.

نەوت هەم گەرمایە و هەم رووناکی، خوا لەدەستی جەنابی وەزیری بەزیادکا، دیارە شیری حەڵاڵە و هێشتا رەگی نیشتمان پەروەری لە لەشیا ماوە..

لە جەژنەکانی رەمەزان و قورباندا خێرات زۆر دەکرێ و خوێنی قوربانی کردن بەبێ بەزەییانە دەرێژرێ، خوای قوربانی پێ رازی دەکرێ، مانگێ بەر لە هاتنی ئەو دوو جەژنە خەڵك خۆیان بۆ ئامادە دەکەن، هەروەسە لەو جەژنانەدا کورد لە دایك بووبێ، یان ئیمپراتۆریەتێکی کوردی لە رۆژی ئەو جەژنانەدا پێکەوە نرابێ..

بارام گەلێ جار لەبەر خۆیەوە دەیوت بەڵکو وەزیرەکانمان، کاربەدەستەکانمان ئیرەتی کوردایەتی راستەقینەیان تیا مابێ، بۆیە وا بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە، جەژنانە دەبەخشن، هەرچەند لە گیرفانی خۆیان نەبوو، بەڵام هەستێکی کوردانەی تیا بەدی دەکرا، ئەم باس و خوازە، رۆژانە دەوترا و دەوترایەوە، جۆرە بزاڤێکی هێزداری خستبووە بەر چالاکییەکان و کارەکانی فەرمانبەران، کە باسەکە دووبارە دەبووە جۆرە درەوشانەوەیەکی تری دەخستە ناو دەروونەوەو، دەم و چاوە خەماوییەکانی دەگەشاندەوە..

دەنگ و باسەکە، ئەوەندە دەوترا خەست ببووەوە، بە دەیان شێوە دەوترا و دەرازرایەوە، تا وای لێ هاتبوو لای هەندێکیان مسۆگەر ببوو، وای لێ هاتبوو فەرمانبەرانی وەزارەتەکانی تریشی هەڵ نابوو کە هەمان داوا بۆ وەزیرەکانیان بەرز بکەنەوە..



مەسەلەکە لە سەرەتادا وتەیەکی لە دەم دەرپەڕیوی سکرتێری وەزیر بوو هەر بۆ کۆڕ خۆشکردن قسەکەی کردبوو، لە دوایشدا خۆی بڕوای پێ هێنابو، تەنانەت گەیشتبووەرادەیەك جەنابی وەزیری ناچار کردبوو شان بداتە بەری.

هەردوو فەرمانبەر تەگبیریان هاتبوە سەر ئەوە بە دوانیان بەرمیلێك ئامادە بکەن و دوای وەرگرتنی نەوتەکە بیبەنەوە لە ماڵ یەکێکیاندا یان لە نێوان ماڵی هەردووکیاندا دایبنێن و بە مەنجەڵ دابەشی بکەن.

لەو رۆژانەدا دەنگی ئەوەش هەبوو کە کابینەیەکی تری حکوومەت دادەمەزرێت، ئەو وەزیرانەی کە دەخرانەوە ناو ئەو کابینە نوێیەوە هەر ئەوانە بوون، کە گۆزەیان بە دەرخۆنە کردبوو..

ئەگەر وەزیر ئەو دوو هەواڵەی بە درۆخستبان بەر نەفرەتی گەورە و بچووکی وەزارەتەکە دەکەوت، لەوانەش بوو پڕوپاگەندەی ساختەی ئۆباڵ بدرایە، لە رەگەوە هەڵیان تەکاندایە.. بۆیە وای بە پەسند زانی، هەوڵ بدا نیو بەرمیلە نەوتەکەیان بۆ دابین بکات. خۆشبەختانەی وەزیر و فەرمانبەرەکان لەو کاتەدا ئەو نەوتەی کە لە نەوت خانەکاندا هەبوو بازاڕی فرۆشتنی و بۆ دەرەوە ناردنی گەلێ کز ببوو، بۆیە وەزیری پیشەسازی و وزە بەوە رازی بوو کە نیو بەرمیل نەوت بەهەر یەکێ لە فەرمانبەرانی ئەو وەزارەتەی کە بارامی تیابوو بفرۆشێ، هەم باری عەمبارەکانی نەوت سووك دەبوو هەم لە وەزیری برادەری نزیك دەبوەوە, لەناو فەرمانبەرەکانیشدا بە دڵسۆز دەدرایە قەڵەم و لە هەمانکاتیشدا دەمکوتیانی دەکرد.

مەسەلەی جەژنانەکە وەك دانی نیو بەرمیل نەوتەکە نەبو، کام وەزیر؟ کام لێپرسراوی حکوومەت ئەم جەژنەی کردووە بە جەژن؟ ئەی ئەم بۆ لەسەر خۆی بیکات بە ماڵ، تا ئێستا کێ جەژنانەی بەو بۆ نەوە داوە تا ئەو بیدا.. ماڵی وەزیری پیشەسازی ئاوەدانتر بێ وا مەسەلەی نیو بەرمیل نەوتەکەی بۆ چارەسەرکرد، ئەی بۆ جەژنانەکە چی بکات،خۆ ئەمە نەجەژنی رەمەزانە و نە قوربانە.! ئەم دەرگایە بۆ بکاتەوە! ئەو بەپێی رێنماییەکان وەزارەت بەرێوە دەبا، کوا شتی وا رووی داوە!..

جەنابی وەزیر وا لێکی دەدایەوە، ئیتر ئەوەی بەبیردا نەدەهات کە ئەو رێنماییانە داگیرکەر دایناون و ئەو شۆڕشی کورد کردوویەتی بە وەزیر، ئەو پێویستە شتێکی نوێ، هەنگاوێکی تازە بنێ و دۆڵی داگیرکەران نەکوتێتەوە و رێگەیەکی نوێ بۆ رەوتی حوکمڕانی و کارگێڕی کوردی بدۆزێتەوە، مەسەلەی جەژنانەکە کێچی لە کەوڵی کردبوو، بۆیە هەوڵیدا زوو لەگەڵ هاتنی

رۆژی جەژنی نەورۆزدا نیو بەرمیل نەوتەکە بدرێ، کە جەژن بەسەرچوو جەژنانە مانای نامێنێ، بەو جۆرە بەیەك تیر دوو نیشانە دەپێکێ..

فەرمانبەرەکان لە بارەی چۆنیەتی وەرگرتنی نەوتەکەوە ببوون بە سێ بەشەوە:

بەشێکیان دەیانوت: رەنگە تەنکەری نەوتەکە بێتە بەردەمی وەزارەت و بۆ هەردوو کەس بەرمیلێك پڕ بکات.

بەشی دووەم دەیانوت: هەردووو کەس بەرمیلی خۆیان دەبەنە نەوتخانەکەو لەوێ وەری دەگرن.

بەشی سێیەمیان پێشبینییەکەیان خەیردار تر بوو، دەیانوت: رەنگە تەنکەری دابەشکردنی نەوتەکە بەسەر ماڵی هەمووواندا بگەڕێ و هەردوو فەرمانبەر کەماڵیان لەیەکەوە نزیك بێ بەرمیلێکیان بۆ پڕ بکات، پارەی عارەبانەو کرێی بەرمیل هێنان و بردنەکە و ترومپای پڕ کردنیان بۆ بگەڕێتەوە.

بەراستی بیرو بۆچوونی ئەم بەشەیان دڵ خۆشکەرە بوو، چونکە سەرەڕای کرێی عارەبانە و ترۆمپا، تەقە تەقی بەرمیل هێنان و لە تەك عارەبانە هاتن و چوونەوەیان لە کۆڵ دەبووەوە.

بەشی دووەم خۆیان بە دڵسۆز دەنواند، پێیان وابوو ئەگەر تەنکەرەکە بێتە بەر دەرگای وەزارەت، دەبوو ئەو رۆژەی کە وەری دەگرن، بەر دەرگای وەزارەت ببێ بە مەیدانی نەوت فرۆشەکان..

بەشی یەکەمیش سەبارەت بەڕای دووەم دەیانوت جا ئەگەر وابێ دەبێ هەموومان وەزارەت چۆڵ بکەین و لە نەوتخانەکە سەرە بگرین.. ئەوانەی کە ماڵیان لە نەوتخانەکەوە نزیك بوو راو بۆچوونەکەی بەشی دووەمیان لا پەسندبوو ئیتر هەر کەسەی بەزاری بەرژەوەندی خۆی راو تەگبیری بۆ دابەشکردنەکە دادەنا.

بارام ئەفەنی، لەبەر ئەوەی پیاوێکی دامەزراو خاوەن ئەزموون و هۆشمەند بوو، تێکەڵاوی ئەو بگرەو بەردەیە نەدەبووخۆیشی لێ کەنار نەدەگرت، ئەوەش لەو بارەوە رووی ئاخاوتنی تێ دەکرد بەروێکی گەشەوە گوێی بۆ دەگرت و وای پیشان دەدا کە قسەکەی راستەو ئەگەر بێتەدی خراپ نییە، کەچی لە دڵەوە دەیوت: ئەو راو بۆ چوونانە وەك گوێ ناڵکردنی ئەسپێکە کە دیار نییە..

خۆی بەلای هیچ یەکێك لەو بەشانەدا نەدەشکاندەوە. چونکە دەیزانی ئەو پیر خەنێنەیە پاش کولاندنی دەرخواردنی ئەوان دەدرێ، ئیتر قسەکردن لەو شتانە تەنها بۆ پڕکردنەوەی کاتی بێ کارییەو هیچی لێ سەوز نابێ..



باسی نیو بەرمیل نەوتەکە و جەژنانەکە، ئەوەندە هەڵگێڕ و وەرگێڕی تیاکرابوو وا خەست بووبووەوە چەقۆ نەی دەبڕی, کرابوو بە پاڵەپەستۆیەك، سەرشانی ئەوانەی کە چاو و گوێگری وەزیر بوون، وەك خوێ بەسەر بریندا بکەی فەرمانبەرەکان ئەوەندە چاوەڕوانی دوا مژدەی وەزیریان کردبوو ئۆقرەیان لێ بڕابوو, قسەیەك لە قاتی خوارەوەی تەلارەکە بکرایە و پەیوەندی بەو مەسەلەوە هەبوایە دوای چەند چرکەیەك بەناو هەموو تەلارەکەدا بکرایە و پەیوەندی بەو مەسەلەوە هەبوایە دوای چەند چرکەیەك بەناو هەموو تەلارەکەدا بڵاودەبووەوە، ئەوەی ختوورەی دەخستە دڵەوە نەخشەی وەرگرتنی ئەو جەژنانەی لە هۆشدا تێك دەدا ئەو قسانە بوون کە دەوترا: ئایا نەوتەکە وەك جەژنانەکە بەخشینەو بێ پارەیە، ؟ یان بە پارەیە؟.

هەندێك هەر بۆ تێکدانی ئەو خەیاڵ پڵاوانە کە لە سەر جەژنانەکە بینا دەکران، ئەو قسانەیان دەهێنایە پێشەوە! بە تایبەتی کە دەیانوت: قەت بیستوتانە حکوومەت خەیرات و سەدەقات بکات؟!.

ئەو جۆرە قسەو خۆتێهەڵقۆتانە دڵی ئەو فەرمانبەرانە کە ئەسپێ لە باخەڵیاندا سەوزەڵە خانیان دەوت، سەخڵەت دەکرد..

هەندێکیان لەبەر خۆیانەوە هەندێکی تریان بە تووڕەییەوە دەیانوت: قابیلە وەزیر، یان بەڕێوەبەری گشتی نەزانێ بەرکی ئێمە وەك تەڵەی تەقیوە..

ئەوەندە قسەیان لەسەر ئەو شتانە کردبوو تامی نەمابوو..

ئەحمەد ئەفەنی کە لە هەموو فەرمانبەرەکان بە تەمەنتر بوو لە هەمووشیان خزمەتی زۆرتربوو، لەوەختی قسەکردن لەسەر ئەو شتانە خۆی بەجێ گۆڕکێی قاقەزو فایل و قەڵەمدان وئەو شتانەوە کە لەسەر مێزەکەی بوون خەریك دەکرد و گوێشی بۆ وردو درشتی قسەکان شل دەکرد، حەزی دەکرد رای وەربگیرێ، کە پێیان دەوت: کاك ئەحمەد تۆ رات چییە؟ ئەویش پڕ بە متمانەوە، دەهاتە قسەو دەیوت:

– لەمنی وەرگرن، جەنابی وەزیر وەك باوکی هەموومانە

– خۆ مەسەلە تەمەن نییە- باوکیش مەفروزە،حالی منداڵەکانی خۆی بزانێ، مادامەکی گفتی داوە دەیکا و پەشیمان نابێتەوە..

وەختێ کە ئەو قسانەی دەکرد رووی دەکردە ئەوانەی کە قسەیان دەهێناو دەبرد، جۆرە ریتمێکی تێکەڵاو بەقسەکانی دەکرد، پیاو پێی وابوو دەنوزێتەوە..

یەکێك لە فەرمانبەرەکان بە مخەنەتی قسەکەی لە دەم وەردەگرت و دەیوت:

- چۆنی دەکا؟ هەم جەژنانەش دەدا هەم نیو بەرمیل نەوت؟!

باشە بەرمیل نەوتەکە بە پارەیە یان نەء؟.

ئەحمەد ئەفەنی نەبادا زمانی بەلای خراپەدا هەڵ خلیسکێ دەیوت:

- من دەڵێم دەیکات.

وای وەوت و دەستی دایە قەڵەمەکەی و خۆی بە نووسینێکەوە خەریك کرد..

فەرمانبەرەکان لەو بارەوە ڕێس و گوریسەکەیان خاو دەکردەوەو هەر یەك سەرەداوێکی بە دەستەوە دەگرت:

- باشە بۆ زوو ساغی نەکەینەوە، ئەم بەرمیلە نەوتە بەبێ پارەیە یان نەء؟.

- ئەگەر جەژنانەکەمان بەر لە نەوتەکە بدەنێ ئاسانە..

- جا ئەگەر وەها بێ جەژنەکەمان دوو جەژنەیە،بە پارەی جەژنانەکە نەوتەکە وەردەگرین و هەندێکیشمان بۆ دەمێنێتەوە، چی لەوە باشترە..

یەکێك لە فەرمانبەرەکان دەیویست ئەو بابەتە زۆر بژاورێتەوە، بۆیە رووی لە هەمووان دەکردو دەیووت:

- یانی بەقسەی ئێوە بێ، دەبێ نەوتەکە بە پارە بێ!.

- گریمان وابوو!..

- یانی چی گریمان وابو! گریمانی تیا نییە.. شتەکە دیارەو بڕایەوە.. بارام بەدرێژایی ئەو گفتوگۆیە، گوێی هەڵخستبوو، بەڵام سەرەداوی قسەی لەدەست خۆی نە ئالآندبوو، چونکە دەیزانی شتێك لە خۆیا نەبێ وەك پێوانەیە بەکلاوی خەڵکانێك کە بەدەم ئاوەوە درابێ..

یەکێك لەوانەی کە حەزی لەو گەڕەلاوژەیە بوو ویستی بارام ئەفەنی راکێشێتە ناو بابەتەکەو پێی وت:

کاك بارام تۆ بۆ شتێ نالێیی! ئەویش حەزی دەکرد گوێی لەو ژاوە ژاوە بێ تا بزانێ چی لێ سەوز دەبێ، بۆیە نەویست رووی بابەتەکە بەلایەکی تردا وەرچەخێنێ، هەر ئەوەندەی وت:

- وا گوێم لێتانە و لە گەڵتانم..

- یەکێکیان وەك کلوورە هەنگوێنی دۆزیبێتەوە، دەمی هێنایە پێشەوە و وتی:

- کوڕینە ئەوە هەمووی ئاسانە، من مەسەلەی بەرمیل هێنان و بردنەوەکەیم لابووە بە گرفت، ئەوە بۆ باسی ناکەن؟..

ئەگەر لێرە بیدەن، دەبێ ئەرکی هێنان و بردنەوەکەی چەند بێ؟!.



گەلێ لای مەبەست بوو وەڵامی قسەکەی بدرێتەوە بۆیە سەر لە نوێ دووپاتی کردەوە "دەی پێم بڵێن بزانم چەند دەکات" یەکێکیان ویستی چێژ لە قسەکەی وەرنەگرێ، قسەیەکی وای کرد سەر دڵی بگرێ..

- ئەگەر نەوتەکە بەپارە بێ لەگەڵ هێنان و بردنی بەرمیلەکەدا نزیکی ئەو پارەیە دەکاتەوە کە خۆت لە بازاڕدا بیکڕێت..

یەکێکی تریان زوو هاتە دەم و وتی:

- نا،نا!. ئەوەندە ناکات، راوەستە بابۆت ئەژمار بکەم.. گریمان لێرەوە تا ماڵی ئێمە عارەبانە بە سی دینار بەرمیلەکە دەهێنێ و دەباتەوە.. بەسەر دوودا دەکاتە پانزە دینار، با بڵێین پەنجا دیناریش دەدەین ئەمە شەست، بەرمیلی نەوت لە بازاڕدا بە چەندە؟ بە (2000)دینارە..

یەکێکی تریان سەری قسەی بۆ لای خۆی راکێشاو وتی:

ئەی ئەگەر لەنەوت خانەکە وەری بگرین، خۆ دەبێ ئەو رۆژە مۆڵەتی بۆ وەربگرین و سەرەی بۆ بگرین، ئەوجا وەرە سەیرکە، ئەو هەموو بەرمیلە بێنەو تەماشای شەرە شەقی دابەشکردن بکە..

یەکێکی تریان پشتگیرێکی بۆ قسەکەی هێنایەوەو وتی: بەسەری تۆ دەبێ رۆژێکی سەرتاسەری مۆڵەتی بۆ وەربگرین، ئیتر خوا دەزانێ کەی بەرت دەکەوێ و بە چ حاڵ رزگار دەبێ، یەکێکی تریان بە کەسەرەوە وتی:

- ئەوەی واستەی نەبێ دەبێ لە دوورەوە بڵێ ئەم نانە بەو رۆنە..

یەکێکی تریان وتی:

- کوڕە واستەی چی، سەرە بە بەرمیلە، ئیتر واستەی چی!.

ئەوەی پێشوو وەڵامی دایەوە:

- راستە واستەی چی؟، بەنیمچە تێزێکەوە پێی وت:

- دەڵێیی لەم ولآتەدا ناژیت!.. بەسەری تۆ ئەگەر بتەوێ سەلکە تووریێك بکڕیت دەبێ پێشەکی واستەیەك ئامادەبکەی..

دیار بوو رەئووف ئەفەنی گومانی لە دانی جەژنانەو نیو بەرمیلە نەوتەکەدا هەبوو، بۆیە هەر دەیوت"گریمان، وابوو.." ئەو هەمیشە لەو باوەڕەدا بوو شتێك بە هەموو هەستەکانی

لەشی پێ نەحەسێ، نەی بینێ و نەی بیسێ و نەی چێژی و نەیەتە ناو لەپی دەسی بڕوای پێ نەکات، هەر پارەیەك لە بەرکیا نەبوایە بەهی خۆی نەدەزانی ..

بە درێژایی گەڕەلاوژەی جەژنانە کە و نیو بەرمیل نەوتەکە بەشداری دەکردو لەناو روومەتە لۆچدار و چاڵ و قۆپاوەکانیدا جۆرە نیشانەیەکی سەرسورمان و گاڵتەجاڕی دروست دەبوو، ئەوەی بیزانیایە بیخوێنێتەوە، دەیزانی لە دڵەوە پێیان دەڵێ:(بەخوا کەر بازاڕێکی خۆشە).. لەگەڵ ئەوەشدا پەردەی دڵی کەسی نەدەژاکان و بەهەوەس و ئارەزووی بەرامبەرەکەی ئاخاوتنی دەکرد، قسەو باسی ئەوانەی کە گەڕەلاوژەکەیان دەکرد بە هیچ لایەکدا نەدەشکاندەوە، هەر لەژێرەوە قسەیەکی پڕ بە تیژی لە بابەتەکە دەسڕەواندوو، خۆی دەکشاندەوەو بە تیلایی چاوێکی گومان لێ کراوەوە سەرنجی بارام ئەفەنی دەداو جاروباریش بۆ قسەکردن دەیبزواند و دەیزانی ئەویش لەناخەوە گاڵتەی بەو مەسەلەیە دێ..

بۆ ئەوەش مەسەلەکە وا تیژ ببێ و کەوچك نەیبڕێ، بە جۆرە محەنەتییەکەوە رووی دەکردە هەمووان و دەیوت:

– گریمان هەردووانمان بەرمیلێکمان هێنا خۆ دەبێ لە دواییدا بەشی بکەین، دیارە ئەوەش کارێکی ئاسان نییە، خۆ ئەگەر هەر لە نەوتخانەکە وەربگیرێ، لەو دوو کەسەی کە بەیەکەوە وەری دەگرن، یەکێکیان مۆڵەت وەردەگرێ و پێزانەی ئەویتر دەبات و کارەکە جێبەجێ دەکات، بەو جۆرە هەم کارەکە سەردەگرێ و هەم وەزارەتەکەش چۆڵ نابێ..ئەو مەبەستی لە هێنانە پێشەوەی دیوێکی تری مەسەلەکەتەنها کەوچك تێوەردانی بوو دەنا چ مەبەستێکی تری نەبوو، هەر چەند حەزی لە چارەی وەزارەتەکەی نەدەکرد، چونکە تەمەنێك بوو لەو وەزارەتە کاری دەکرد جگە لە مووچەکەی کەرەنجی ماندوو بوونی خۆی بوو چ خەیر و چاکەیەکی لێ نەدیبوو، لە دڵەوە کوردێکی پاك بوو، حەزی نەدەکرد زەمی بکات، نەوەك زەرەر لە کوردایەتییەکەی بدات، بۆ ئەو وەزارەتی کوردانی ئەمڕۆ و دوێنێ چ جیاوازییەکیان نەبوو، هەر ئەوەندە هەبوو ئەمڕۆ بەناوی کوردەوەیەو دوێنێ بەناوی داگیرکەرانییەوە بوو، ئێدی لغاوی کورد پەروەری رێی زەمکردنی لێ گرتبوو..

قسەکەی رەئووف ئەفەنی خەیاڵی بارامی بزواند بۆیە بەشێوەی وتەکانی ئەو لە دڵەوە دەیوت:



– گریمان ئەم پروپاگەندەیە، راست دەرچوو، خۆ من لە گەڕەکەکەی خۆماندا تاکە کەسم.. ئەگەر کار بگاتە ئەو رادەیە دەبێ رۆژێ مۆڵەتی بۆ وەربگرم، دەبێ خۆم بڕۆم و بەرمیلی خۆم ببەم و وەری بگرم..

لە گەرمەی ئەو دان و سانەدا بوو، سکرتێری بەڕێوەبەری ئەو بەشەی کە بارام تیایدا فەرمانبەر بوو، سەری کێشایە ژوورەکەیان و پەردەی بێ دەنگی بەسەر وتووێژەکەدا دراو هەر یەك لەپشت مێزی خۆیەوە خۆی سەقامگیر کرد، هەموو خۆیان بۆ بیستنی قسەی سکرتێر ئامادە کرد، ئەویش بە شێوازێکی مژدە ئامێز و بەخشندەوە رووی تێکردن و وتی:

– نەوتەکە رۆژی پێنج شەممە دەدەرێ، لیستی ناوەکانیش لە بەنزینخانەکەی ناو بازاڕە، هەردوو کەس بەرمیلی خۆیان دەبەن و نەوتی خۆیان وەردەگرن، ئەمەی وت و ویستی بڕوا..

یەکیك لە فەرمانبەرەکان بەم پرسیارە رای گرت:

– ئەرێ بەپارەیە یان بێ پارەیە؟..

– چۆن بێ پارەیە!.هەر یەك (50) دیناریش لە تەك خۆیدا دەبا..

هەواڵدانەکەی سکرتێری بەڕێوەبەر سەبارەت بە نەوتەکە سەری هەموو قسەو ئەگەرێکی تری قاپات کرد.. ئیتر کەس دەمی نەکردەوە لێی بپرسێ و بڵێ: ئەی جەژنانەکە چی لێ هات؟..

یەکێك لەو فەرمانبەرانەی ژوورەکەی بارام ئەوەندە بایەخی بەدانی نەوتەکە نەدەدا بەقەد ئەوەندە کە جەژنانەکەی لا مەبەست بوو، ئەو بەدرێژایی رۆژانی بڵاوبوونەوەی دانی نیو بەرمیل نەوت و جەژنانەکە، سەری قسەو بنی قسەی بەلای جەژنانەکەدا دەشکاندەوە، لەبەر ئەوە نەبوو کە بەهۆی خزمێکیەوە دەیزانی نەوتەکە دەدرێ بەڵکو ئەو خزمی نزیکی ئەوانە بوو کە لە نەوتخانەکاندا کاریان دەکردو دەستی قاچاخچیەتییان لەگەڵ کاربەدەستانی نەوتدا تێکەڵاو بوو دەیزانی نەوت بە فەرمانبەران دەدرێ و هۆی دانەکەشی نەدەوت، مەسەلەش پیاوەتی سەخاوەت نەبوو بەلکو عەمباری نەوتەکان و بەنزینخانەکان پڕ ببوون لەسەر سنوورەکانیشدا جۆرە کرژییەك رووی دابوو بە ئاسانی نەوتەکە ئاودیو نەدەبوو، خۆ دەبوو بۆ وەرگرتنی ئەو بڕە نەوتەش کە سەرەمڕە قاچاخچییەکان دەیان هێنا جێی بکەنەوە، ئەو راستیانەی باش دەزانین، بەڵام لای کەس نەی درکاندبوون، جگە لەوەش خوشکەکەی لە کۆمپانیای دابەشکردنی نەوتدا کارمەند بوو، خۆی لەو جۆرە بابەتانە دەپاراست دەنا چەند بڵێی پیاوێکی دەم شڕو زۆر بڵێ بوو..

بارام کەوتە ناو مشووری خۆیەوە، سبەی بیستی مانگەو پێنج شەممەیەو ڕۆژی هەینیش نەوتخانەکان نەوت دابەش ناکەن و دوو سبەیش نەورۆزە، کەواتە دەبێ مۆڵەتێك لە بەرپوەبەر وەربگرێ تا بەرمیلەکەی بباو بەشە نەوتەکەی خۆی وەربگرێ, بەڕێوەبەری بەشەکەی لە پاش ڕووداوە سەختەکەی براکوژی ئەو پایەی پێ درابوو، دیار بوو یەکێك بووە لەوانەی کە فووی کۆنە بەعسییانی بە خۆشکردنی ئاگری کوردکوژیدا کردبوو، بەلالووتەوە قسەی لەتەك بارامدا دەرکرد، ئەویش حەزی لە چارەی نەدەکرد، سروشتی لە فەرمانبەرەکان نەدەچوو، ناشیرین ترین ئادگار لای ڕووپامایی و دوو ڕوویی بوو، وەك هەندێ فەرمانبەر ماستاو سارد کەرەوە و تۆزی سەرشان تەکێنەری خەڵك نەبوو..

وەك هەندێکیش نەی دەتوانی بێ دەنگ بێ و دەست بەکڵاوی خۆیەوە بگرێ، ئان بێ دەر بەست بێ و چۆنی بۆ هات لێی خوڕێ..

جگە لەوەش بارام ئەفەنی ڕابردوویێکی پاك و نیشتمان پەروەرانەی هەبوو، لە پێناو نیشتمان و مسۆگەرکردنی مافی نەتەوایەتیدا سەری بۆ کەس دانەنواند بوو، ڕاستگۆو بێ پێچ و پەنا بوو، بیروڕای تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام کەم کەس لێی حاڵی دەبوون، کارو فەرمانەکانی، بەراستی و پوختی ئەنجام دەدان، گوێی لەوە نەبوو خەڵك چۆنی لێ تێدەگەن، گرینگ لای ئەو ئەوەبوو لە کارەکانی خۆی دڵنیا بێ کە لە جغزی خزمەتگوزاری خەڵك و نەتەوەکەی دەرنەچن و زەرەریش لە کەس نەدەن، ڕکی لە ڕەویەو نەریتی لە قاڵبدراوی ئامادەکراوی ڕابڕدوو بوو، قسە جوینەوەی خەڵکی لا جوینەوەی جاجکی ناوزاری مردوان بوو، شەیدای تازەگەری و بە شوێن داهێنان و نەخشەی نوێدا دەگەڕا، ئەو پێی وابوو ژیان نابێ وێنەو دیمەنی ئامادەکراو بێ و مرۆڤ خۆی تیایاندا سەخڵەت بکات، یان خۆی لە تەنگە بەرانیاندا بترەنجێنێ، ژیان ئاسۆیەکی لە بن نەهاتوی کراوەیە، مرۆڤ خۆی بۆ خۆی نەخشە بۆهەنگاوەکانی دادەنێ، هەر خۆشی بەرپرسیاری هەنگاونانی خۆیەتی..

ئەو ئادگار و فەلسەفە تایبەتییەی خۆی وای لێکردبوو لەگەڵ هەڵوێستە نوێکاندا درەنگ بگونجێ و ترێزیان لێبکات. لەسەر مۆڵەتی ڕۆژی پێنج شەممە لەگەڵ بەرێوەبەردا خەریك بوو بەیەکدا بێن، ئەم بەلا لووتێکەوە، بە نووسراوێکی کورتبڕ داوای مۆڵەتی لەو کرد.. ئەویش تەنها یەك بۆڵەی لێوەهات و داخوازیەکەی بە بێ ئیمزاکردن و بەبێ بایەخانەوە لەکەنار مێزەکەیدا داینا.. نە بە ئەرێ، نە بە نەرێ پەیڤ لەدەمی نەترازا..



بەرێوبەر وەك فەرمانبەرەکانی تر بارامی وادەدایە قەڵەم کە هەواداری لایەنێکی شەڕی براکوژییە، چونکە هەمیشە دەربارەی دەیووت:

- ئەی ئەوە نییە هەمیشە تف و نەفرەت بۆ چارەی ئەوانە ڕەوانە دەکات کە شەڕی براکوژیان بەرپاکرد.. چی لەوانە بوو لە هەڵوێستی وەهالەدا مرۆڤ دەبێ قوفڵ لە دەمی خۆی بدات و بێدەنگ بێ! چی لە بارامیش بوو بێدەنگ بوون لەو کارەساتە ناهەمووارە پیشەی ولاغ و جڕوجانەوەرە..

جگە لەوەش بەوە تۆمەتی دەدایە پاڵی، دەیانوت:

- ئەی ئەوە لەوانە نەبوو کە پێش ڕووداوەکانی ئەو کارەساتە ویستیان بە خۆسوتاندن ئاوێك بەسەر ئاگرەکەدا بکەن! سەرانی شەڕخوازان خەجالەت بکەن.. ئێستاش خۆی گۆشەگیر کردوەو نایەتە پێشەوە، کەواتە هەواداری ئەوانی ترە! ئا بەو چاوە تەماشا دەکرا، چاوێکی تەسك بین و پڕ خەوش و خار، لای بەرێوبەریش هەر وایان بۆ تێگووشی بوو.. لەلای ئێمەش ئەوەی لە هەر قەوارەیەکدا دانرا درەنگ لەو قەوارە دەیهێننە دەرەوە..

بەرێوبەریش دەستە خوێناوییەکانی خۆی بەپشتێنی هەردوو لایەنی شەڕی براکوژی پاك دەکردەوە خۆی لەنێوانیادا مەڵاس دابوو، بەسمێڵی بۆزی هەردوو لا قەشمەری دەکرد، لەوانە بوو بەر لافاوی چاکسازی بکەوێ، کە وێڵ و پاشەڵە بۆگەنییەکانی لە گەردنە زیرگاوییەکەی بکرێ، بەڵام دووبەرەکی بوو بەخێرێك بەسەر ئەو جۆرە کەسانەدا ڕژا، خۆیان لەپێستی مێشنەدا مەڵاس داوە، ئاگری شەڕیان نایەوەو دەستی خۆیان وەشان، وا ئێستاش وەك دەمەی کورخان هەر فوو بە ئاگرەکەدا دەکەن، داخۆ لەبنەوە چی تریان نیاز بێ..

ئەوانە بەر لەوەی چاکسازی لەدژیان بکرێ، گورزێکی جەرگ بڕی وایان ئاراستەی کورد کرد کە برینەکەی درنگ سارێژ ببێ، وا ئەمڕۆ پێچکەی مێزو کورسییەکانیان لەسەر گڵکۆ و خوێنی چەندان شەهید و پاڵەوانان و خەباتگێڕانی بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەی کورد دامەزراندووە و بزەی سمێڵیان دێ و دەبێ یەکێکی وەك بارام لەبەردەمیاندا ڕاوەستێ و منەتباریان بێ..

ئەوەی پتر ڕکی بارامی کرژ دەکردەوە، ئەوە بوو، ئەوانە لەناخەوە دوژمنداری ئەوانەیان دەکرد کە بەزمی کوردایەتیان داهێنایەوە.. ئەوانە مشتەی ناو هەمانەکە بوون، گورزی ژەهراویان لە هەردوولا دەسرەوی.. ئەوەی ڕۆژانە وەك چقڵ لەچاوی دەچەقی ئەو نووسراوانە بوون کە بە کوردی دەنووسران، هەر جارەی بەهانەیەکی بۆ دەدۆزییەوە، جارێ دەیوت، ئێمە بە

کوردی نەمان خوێندوە، جارێ دەیوت زمانی یەکگرتوومان نییە، جارێکیش دەیوت: ئایا ئێمە بە سۆرانی بنووسین یان بە بادینانی، لە کاتێدا نە سۆرانی نە بادینانی نەدەزانی.. ئەو یەکێك بوو لەوانەی کە حەزی لە قالبە کۆنەکان دەکرد، نووسین بە کوردی بەلای ئەوەوە ئەو هەیبەت و سەیبەتەی زمانی عەرەبی نەبوو، زمانی عەرەبی زمانی لێ خوڕین و ترس و تۆقێن و دکتاتۆریەت و مووچرکە بە لەشدا هێنان بوو، بە کوردی نووسین، پیشەی فەرمانبەران نییە دژوێن و هەرەشەی پێناکرێ، ئاوا جەنابی بەرێوبەر فیکری دەکردەوە، هەر لەو رووانگەوە سەیری بارامی دەکردو لە دڵی خۆیدا دەیوت چ بەڵایەکمان لێ قیت بووەتەوە..

بارامیش لە دڵی خۆیدا، کە چاوی بەو جۆرە کەسانە دەکەوت دەیوت:

– ئایا ئێمە بۆ ئەوە رەنجماندا نموونەی ئەوانە سواری کۆڵمان بن!.یان بۆ ئەوە بوو ئەمانەمان هەتا هەتایە لەبەر چاو بزر بن، سوار تا کەی هەر سوار بێ و لێ خوڕێ، ئەمانە چۆن ئازا قاچیان لە وێزەنگی گیربوو، لەپڕ لە تافی غاردا خۆیان هاویشتە سەر پشتی ئەم ئەسپە شێییە! هەی هەزار نەفرەت لە دوو بەرەکی و دژایەتی، ئەگەر ئەو بەڵایە نەبووایە کەی ئەمانە دەیانتوانی وا جێی پێی خۆیان گیر بکەنەوە.. تۆ بڵێی ئێمە ئەوەندە دەبەنگ بین، شتەکانمان بەزەبری خەبات لە دوژمنانی دەرەکیمان وەریان بگرینەوە و وا بە ئاسانی بیان دەینەوە دەست دوژمنەکانی ناو خۆمان، خۆ دوژمنی دەرەکی بە قەد دوژمنی ناوەکی بەدفەڕ نییە.. کەزۆر لە خۆی تووڕە دەبوو ئەوجا خۆی هێور دەکردەوەو دەیوت:

– دیارە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کە دێنە ئاراوە، وەهانە، دوای شەن و کەوکردن و تەتڵەو لە بێژنگدانێك، ئەوجا باڵفتەکەیان دەردەکەوێ و پوخت دەبنەوە.. واتە بوونی ئەوانە لە ناوکۆمەڵدا شتێکی کاتییە و لەکەیەکی تێکدەرانە نییە! یاخوا وابێ.. گرنگ کاروان بەسەلامەتی بڕوا و بگاتە کاروان سەڕا، ئەوانە لە رەوتی رێدا خۆیان هەڵدەوەرن و دەکەون.. تۆ بڵێی وابێ!؟.

ئەم جارەش مۆرانەکانی ناو لەشمان کونا و دەرمان نەکەن؟..

تۆ بڵێی نەبنە هۆی دەرفەت لە کیس دانمان.. تۆ بڵێی نەگەینە ئاوات؟! ئەوکاتە لەسەر خۆ پاك و پیس لە کۆزی خۆماندا جیا نەکەینەوە؟..بارام زۆرجار ئەو وردە پرسیارانەی لەدڵەوە لە خۆی دەکرد، لەوەش دڵنیا بوو بەئاوات گەیشتن مسۆگەرە.. ئەی ئەوانی کە رێی هەزار ساڵەیان پەك داین!؟ جا کەوا بێ ئێمە پەند لە دیرۆك وەرناگرین، کەواتە ئێمەو گیان لەبەرێکی بێ ئاوەزوو چیمان فەرقە؟، ئەوەی ئەو دوو زیندەوەرە لێك جیا دەکاتەوە پەند وەرگرتنە لە مێژوو..

## (2)

بارام بەر لەوەی خۆی بگۆڕێ، هێشتا منداڵەکانی لە خەو هەڵنەسابوون، ئەو بەرمیلە بەتاڵەی کە لە کۆگای شڕەو پڕەی ماڵەوەدا هەیبوو دەری هێناو، کۆنە پەڕۆیەکی تەڕ کردو بەجوانی سڕییەوەو، بەبێ ئەوەی غلۆڕی بکاتەوە، بەئاستەم بردییە بەردەرگای دەرەوە و ئامادەی کردو خۆیشی لە تەنیشتی ڕاوەستا و قوڵاخەی کرد، بۆ ئەوەی ئەگەر عارەبانەیەك رابوورد بە کرێی بگرێ.. چەند بڵێی عارەبانە زۆر بوون، شەقامەکان و ناو گەروی شارەکە وەك شارە مێروولە عارەبانە تیایدا جمەی دەهات، هەموو کارو کاسبی و رسق و رۆزییەك کەوتبووە سەر شانی عارەبانە، چونکە لەو رۆژانەدا نرخی بەنزین ببوو بە خوێنی سیاوەحش، ئیتر ئەو ماشێنانەی کە بە بەنزین و گازوایڵ کاریان دەکرد لەماڵەوە وەك دابەستە ڕاگیرابوون، ئەرکەکانیان خرابووە سەرشانی عارەبانە، هەر خاوەن ئۆتۆمبێلێك لە ماڵی خۆیدا تایەی ئۆتۆمبێلەکەی دەرهێنابوو لەسەر چوار بلۆك رایگرتبوو، بەو جۆرەش لە دزین دابین کرابوون، دزی ئۆتۆمبێل گەیشتبووە رادەیەك هەندێ کەس ماشێنەکانیان بە سلَنگ لەسەر بان دانابوون.

عارەبانەکان دوو جۆر بوون، هەندێکیان بە کەر و ولاغ رادەکێشران، هەندێکی تریان بە زەلام و منداڵ و مێرد منداڵ رادەکێشران، رۆژانە دەیان عارەبانە بە بەر دەرگادا دەهاتن و دەچوون شتی کۆنینە و پڕو پیتاڵ و وردەنان و شتی نیوداشت و رزیویان دەکڕین و دەیان فرۆشتنەوە، یانیش دەگەڕان کرێباریان دەکرد، کە چاویان بە زەلام دەکەوت رادەوەستان و بە چاویاندا نیازەکانیان دەخوێندەوە و دەیانزانی چی دەوێ.. عارەبانەیەك گەنجێکی شرواڵ دڕاوی سەرو پۆتەلاك دڕاو دەیڕانی، لەبەردەم بارام دا رایگرت:

– فەرموو لە خزمەتدام..

– ئەم بەرمیلەم بەچەند بۆ دەبەیتە بەنزیخانەکەی ناو بازاڕو بۆمی دێنیتەوە؟..

– هەرچەند دەدەی بەزیاد بێ..

– ئەوەش بزانە لەوێ نزیکەی چارەکە سەعاتێك چاوەروان دەبین و دەگەڕێینەوە..



وشەی ( دەگەڕێینەوە) دڵی کوڕە عارەبان چییەکەی لە ناخەوە خۆش کرد، لەدڵی خۆیدا دەیوت:

– چی لەوە باشترە، لەناو ئەو هەموو عارەبانەی شاردا لە رۆژێکی وەهادا کارێکی ئەمسەر و ئەوسەریت دەست کەوێ.. دەرو دیمەن و گفتو لفتی بارام ئاماژەی ئەوەی دەدا: ئەگەر کرێی زیادی نەداتێ کەمی ناداتێ، بۆیە یەکسەر وتی:

– چەند دادەنێ بە زیاد بێ..

– ئەمسەر و ئەوسەر بیست دینار باشە؟..

– چەند دەدەی بە زیاد بێ..

بیست دینار بۆ هەردووکیان زۆر بوو، هەرچەند شتێکی وای پێ نەدەهات کارکردنیش چووبووە کەلی دێوان. ئەو پارەیەش چارەکە کیلۆیەك شەکری پێ نەدەهات.

کوڕەی عارەبان چی بە تاسەوە بەرمیلەکەی خستە سەر عارەبانەکە، بۆ ئەوەی لەنگەری بگرێ, پارچە بلۆکێکی کردە ددانەی و پاڵی پێوە نا..

– کاکی خۆم لەسەر خۆت بڕۆ، وا منیش خۆم لەبەر دەکەم و بە شوێنتا دێم.. بۆ ئەوەی خۆی بگۆڕێ بە پەلە خۆی بەژوورا کرد، کە دەرگای کەنتۆری جلەکانی کردەوەو رەفەی سەرەوەی دی کە جاران پارەی خەرجی ماڵەوەی تیا دادەنا یەکسەر پەیداکردنی پەنجا دینار بۆ نرخی نیو بەرمیل نەوتەکە وای پەشۆکاند، جل و بەرگ لەبەر کردنەکەی لێ ئاڵۆز کرد، ئەو کراسەی کە دەیویست لەبەری بکات نە دەکەوتە بەر دەستی ئەوەش بە دەستییەوە دەهات وای دەزانی ئەو نییە، وا پەشۆکا بوو، قۆپچەی کراسەکەی یەك دوو جار هەڵ دەپێکاو دەیترازاندەوە، قەت خۆی وا نەدیبوو، لەبەر چوونی بەرمیلەکەش حەزی نەدەکرد بانگی پەریخانی ژنی بکات بۆ ئەوەی یارمەتی بداو بەرێی بکات.

لە هەمووی نا لەبارتر گۆرەوەکانی بوون، چووبوونە کەلی شەیتانەوەو لێی بزر ببوون، دەستی بەهەر لایەکدا دەگێڕا گۆرەوە شڕەی سەر و نووك پەنجەو پاژنە دڕاوی دەهاتنە ناو دەست و فڕێی دەدان، کە دەستی دەگێڕایەوە، هەر ئەوان دەهاتنەوە ناو دەستی، بە شوێن ئەو جووتە گۆرەوەدا دەگەڕا کە چەند رۆژێك لەوە و بەر پەریخانی ژنی بۆی کڕیبوو، دەیوت: تۆ بڵێی نەی شووشتبێ، سەرێکی حەوشەی داو چاوێکی بە رستەکاندا گێڕا دیار نەبوون، ئەو لە دڵ خۆیدا سوێندی خواردبوو کە گۆرەوەی پاژنەو سەرەنووك پەنجە دڕاو لەبەر نەکات. لە داخ ئەو رۆژەی لەگەڵ هەندێ فەرمانبەرانی فەرمانگەکەی خۆیدا چوو بۆ تازییەی حاجی حەسەنی ناسیاوی،

پێی وابوو ئەو لە مزگەوت پێڵاو داناکەنێ، کەچی کە چوونە ئەوێ زانی ئەو مزگەوتە شوێنی فاتیحەخوانی تایبەتی نییەو دەبوو هەموو پێڵاوەکانیان داکەنن و لە ژووری مزگەوتدا دانیشن، کە دی گۆرەوەکانی لە پاژنەو سەرەنووکی پەنجەوە دڕاون زۆر تەریق بووەوەو هەر دوو پێی لەژێر خۆی نان و شاردنیەوە، کابرایەك بەرامبەری دانیشتبو، ئەویش سەرەنووکی گۆرەوەکانی دڕابوون، هەوڵی دەدا کەس پێی نەزانێ و خۆی لە گێلی دابوو، سەرەنووکی پەنجە دڕاوەکانی دەنوقاندەوە و هەوڵی دەدا بیان شارێتەوە.. بۆیە بارام هەر گۆرەوەیەکی لەبەر دەست دەکەوتن ئەگەر کونێك یان داوێکی لێ دەرهاتبێ تووڕی دەدان و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- نا.. لەپێی ناکەم نەوەك ڕێکەوت بۆ مزگەوتێك، یان بۆ ماڵی برادەرێك راپێچم بکات و تووشی پێڵاو داکەناندن بم و ئەو کاتە گۆرەوێی سەرپەنجە دڕاو ناچارم بکات پەنجەکانی پێم لە ژێر خۆمدا گرمۆڵە بکەم و بەسەریاندا کڕکەوم.. هەر لەو کاتەدا ئەوەشی دەهاتەوە یاد کە باوکی رەحمەتی پێی وتبوو:" دۆست سەیری سەرت دەکا و دوژمن سەیری پێت".

بەهەر حاڵ بوو خۆی لەبەر کرد، بەبێ ئەوەی دەست بە سەرو گوێلاکی خۆیدا بێنێ، لە دەرگا دەرپەڕی و سەیرێکی درێژایی شەقامەکەی کرد، دیار بوو عارەبانچییەکە پێچی کردبووەو گەیشتبووە راستە شەقامەکەی ئەودیو خەستەخانەکە, کە زانی وایە دەستێکی بەسەرو سەکوتی خۆیا هێنا و ویستی یەخەی کراسەکەی راستکاتەوە، ئەوجا زانی بۆیمباخەکەی لە مل نەکردووە، خۆی حەزی لێی نەبوو، زۆر جار گاڵتەی پێ دەکردو بە برادەرەکانی دەوت:

- دەزانن ئەم بۆیمباخە چییە؟.. ئەمە قەرەبووی کلکی ئەو مەیموونەیە کە داریۆن بە باپیرە گەورەی مرۆڤی دەزانی!.. چوونە نەوتخانەش ئەوەندە پیاوی تیف تیفەداری نەدەویست، خۆ ئەگەر نەوتەکەی زوو وەرگرت، ئەوا دەگەڕێتەوە, ئەو کاتە لەسەر خۆو بە کەماڵی ئیسراحەت خۆی رێکوپێك دەکات و ئەوجا بەرەو فەرمانگەکەی دەڕواو ئیجازەکەی دەکاتە کاتی و مینەتی کەس هەڵ ناگرێ..

بە لەچاو بزربوونی عارەبانەکە پتر پەشۆکا، بەڵام بۆ منداڵەکانی وەك خۆی تووشی ئەو حاڵەتە نەبن خۆی هێور کردەوە و لەسەرخۆ و بە ئاستەم داوای لە کچە گەورەکەی (شلێر) کرد کە بیست دینار لە دەخیلەکەی دەربێنێ و بیداتێ، ئەویش وەك کچێکی سەلارو گوێ رایەڵ زوو دەخیلەکەی خۆی شکاندو بیست دیناری کردە دەست باوکی..

بارام کە بیست دینارەکەی سەفتە کرد، لەبەر خۆیەوە دەیوت:



خۆیشم سێ دینارم پێیە، ئەمە بیست و سێ دینار بیستی بۆ کرێی عارەبانەکە، سێی بۆ خەرجی خۆم، ئەی پەنجا دیناری نیو بەرمیل نەوتەکە لە کوێ پەیدا بکەم!؟.

جگە لە شیلانی کچی دەخیلەی دانابوو ئەوانی تر نەیان بوو، ئەوەبوو ئەویش کە دەخیلەکەی شکاند، چەند جار نزای دەکرد کە بیست دیناری تیابێ، بە جڕەجڕە پارەکان بیست دیناری لێ تەواو بوو، هەندێ خوردەی تیابوو ئەوەندە نەبوو باخەڵی منداڵێکی پێ گەرم بکرێ..

بارام هەرگیز لەو جۆرە هەڵوێستانەدا گوزەری نەکردبوو لەوەتەی لە بیری بێ پارەی لە کەس قەرز نەکردووە، دیارە قەرزکردنیش پیاوی خۆی هەیە، جۆرە یاراو پەرکێشییەکی دەوێ، هەموو کەسێکیش هی ئەوەنییە پارەی لێ قەرز بکرێ..

لە چاو بزربوونی عارەبانە و بەرمیلەکە، بارامی ناچارکرد زوو بڕیارێ بداو پەنا بەرێتە بەر قەرز کردن.. خۆ قابیلە یەکجار دنیا نەبووەتە چەرمی چۆلەکە، ئەو هەموو هاوسێیانە بۆ رۆژێکی وەها نەبن ئەی بۆچی باشن! بەڵام ئەوەی کە پتر ناڕەحەتی دەکرد ئەوەبوو هەموو هاوسێکانی وەك ئەو مووچەخۆر بوون، کامیان کۆنترین مووچە خۆر بوو مووچەکەی بەشی خەرجی دووسێ رۆژ زیاتری نەدەکرد.. رەنگە بەهەر یەکێکیانی بووتایە پەنجا دینار قەرزم بدەرێ خۆی لە پێش ئەودا وەرامی نەبوونی بدابایەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو سەر بە ماڵی یەکێکیاندا بکات.

مارف ئەفەندی هاوسێیەتی و زۆر رێز لە یەکتری دەنێن، لەوەتەی هاوسێن دڵیان لە یەکتری نەشکاوە، بەڵام هەرگیز پارەیان لەیەکتری قەرز نەکردبوو..بارام لێی شك دەبرد پارەی هەبێ، چونکە ماوەیەك لەمەوبەر خەسوی مردبوو، حەلاوی ژنی میراتێکی زۆری بۆ هاتبووەوە، مارف ئەفەنی گەلێ جار بە بارامی وتبوو: کە هەرگیز پارە لەکەس قەرز ناکا، ئەگەر ناچاری وای لێ بکات قەرز بکات، لەمە سەرە مانگ مووچەی وەرگرت، یان هاتە دەستی دەست بەجێ قەرزەکەی بداتەوە، زۆر جاریش هەبوو کە بەیەکەوە قسەیان دەکرد زەمی ئەو کەسانەیان دەکردکە پارە قەرز دەکەن و پارەی سپیان بۆ رۆژی رەش و تەنگانە پاشەکەوت نەخستووە، بارام بەوە دڵی خۆش بوو کە مارف ئەفەنی لە نان کڕینی بەیانیان گەڕایەوە، بەچاوی خۆی دی عارەبانچییەکە بەرمیلەکەی دەخستە سەر عارەبانەکە..

بارام ئەفەنی دەبوو بە باخەڵی پڕەوە بکەوێتە شوێن عارەبانەکە، وا ئیستا پێویستی بە پەنجا دینارە، هەڵوێستەکە تەکی پێ هەڵ چنیوە، بۆیە پێی بە جەرگی خۆیدا ناو بەرەو دەرگای

مارف ئەفەندی چوو، قەرز کردنی پارە بۆ ئەو کارێکی ستەم بوو، چوونەکەی وەکو چوونی ئەوە بوو دەتوت داخۆ بۆ کفن کڕینی ئازیزێکی دەچێ..

لەبەر دەروازەکەیاندا هەڵوەستەیەکی کردو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- لە دەرگا بدەم نەدەم؟.. لەو ڕۆژانەدا کارەبا نەبوو، لەبەر دەرگا راوەستان مانایەکی نەبوو، چەند جارێك بەئاستەم لێیدا سوودی نەبوو، چەند جار مستەکۆڵەی ئاراستەی لێ دان دەکردو دەیگێڕایەوە، لەبەر ئەوەی ماڵەکەیان لە سەروی باخجەکەیانەوە بوو درەنگ گوێیان لە لێدانی دەرگای دەرەوە دەبوو، هەر جارێ کە یەکێك لە دەرگایان دەیدا هاوسێکانیان گوێیان لێ دەبوو، خەمی ئەوەی لێ نیشتبوو کە ئەگەر بەتووندی لێی بدات، منداڵەکانی خۆی بە ئاگا بێن و سەرەتاتکێ بکەن و بزانن کێ لەدەرگای مارف ئەفەنی دەدا، کات بەخێرایی لەسەری دەڕۆی و چەند دوا بکەوتایە ئەوەندە عارەبانەکەی لێی دوور دەکەوتەوە، رکی لەخۆی بووەوە کە چۆن لە بیری چوو بە کابرای عارەبانچی بڵێ:

بەیەکەوە دەڕۆین، وا ئیستا لەبەر ئەم دەرگایە دایە، کەوتووەتە نێوان دوو دەمە مەقەسەوە لێ دەدا لەوانەیە مارف ئەفەنی وەك پێویست بەدەمیەوە نەیێ، لێی نادا بەرمیلەکەی لێ دوور دەکەوێتەوەو دەڕۆویی، لەو ڕۆژانەشدا بەرمیلی وا لەسەر ئاو دووسەد دینار دەکات. تەماشای کاتژمێرەکەی دەستی کرد، چارەکێکی مابوو بۆ هەشت، مارف ئەفەنی مامۆستایە، ئەگەر دەرسی یەکەمی هەبێ دەبێ ئیستا بێتە دەرەوە، پاش چارەکێکی تر زەنگی وانەی یەکەم لێ دەدات، کەچی هەر نەهاتە دەرەوە، لەوانەشە وانەی یەکەمی نەبێ یان شتێکی تر دوای خستبێ.. هۆشی ببوو بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ پەلە کردنی هاتنە دەرەوەی مارف لەکاردابوو، بەشەکەی تریان بەشوێن عارەبانەو بەرمیلەکەدا بەناو ئاپوورەی قەرەباڵغ و جەنجاڵی شاردا وێڵ بوو، دەسووڕایەوەو سۆراخی دەکردو هەزار و یەك گومانی دەخستنە سەر دوورکەوتنەوەی عارەبانەی بەرمیل لەسەر.. لە پەراوێزی ئەو دوو بەشەی هۆشدا خۆی لەو شوێنەدا، لەبەر دەرگای خەڵکدا دەدییەوەو تروسکەیەك خۆشی بەدڵی خۆیدا پەخش دەکرد، کە کارێکی باشی کرد پێشەکی پارەی کرێکەی نەدابوو.دەنا ئەویش دەبووە خەمێکی تر..

دوای چەند لێدانێکی تووندی دەرگا، مارف ئەفەنی بە تووڕەیی و گرژییەوە هات و دەیوت:

- ئێ.. ئێ.. خواینت هەبێ.. واهات..

بارام داینابوو مارف بەڕوو خۆشییەوە پێشوازی لێ بکات کەچی دەم و چاوی تەڵخ و هەڵپروزکاو بوو. وا خۆی ئامادە کردبوو ئەگەر لێی پرسی ئەوە خێرە هاتووی، راستەوخۆ



مەبەستی هاتنەکەی پێ بڵێ.. کەچی گرژی دەمو چاوەکەی مارف نەخشەکەی لێ تێکداو شتەکەی لێ بەرواژی کردەوە، ناچار بوو ئەو لەو بپرسێ و بابەتەکە بکاتەوە.. لەو ساتەدا بارام حەزی دەکرد بەناو زەویدا بچێتە خوارەوەو نقوم ببێ نەك وەها لەوبەر دەرگایەدا روو بە ئەو دەم و چاوە ترش و تاڵە، بەو جۆرە خۆی ببینێتەوە، لە دڵەوە تفێکی پڕ بە بەڵغەمی لە چارەی ئەو رۆژە رەشە دەکرد..

هەر لەوکاتەدا دزینی قاپاغی بیرەکەی خۆیان و ئەوانی و چەندان سەربووردەی دزی و شەوکوت و راونانی قاچاغچیانی بە فیکردا ڕا دەبوورد نەك هەر قەپاغی سەر بیرەکان بەڵکو مەنهۆڵی بیرەکان و تەنەکە شڕەی بەر دەرگاکان دەبران و دەفرۆشران و ئاودیو دەکران، چەندەها جۆرە دز پەیدا ببوون، دزی ماڵان، شەوکوت، دزی ئۆتۆمبێل، دزی جل و بەرگ، دزی تەنەکەو فافۆن و مس، دزی تراکتەرو لۆری، ترانسفۆرم و جۆرەها مەکینە، هەموویان ئاودیو دەکران، قات و قڕی و بێ دەرامەتی و نەبوونی وای لە خەڵك کردبوو پێخەفی خۆیان و نوێنی منداڵەکانیان دەفرۆشت بۆ ئەوەی نانە وشکەیەك بۆ منداڵە برسییەکانیان دابین بکەن، ئیتر چۆن بەرمیلێك دووسەد دینار بکات کابرا نایباو نایفرۆشێ، بیر کردنەوەی لەو رەوشە نالەبارە پتر پاڵی بە بارامەوە دەنا، کە لە مارف ئەفەنی بچێتە پێشەوەو بڵێ:

- ئەوە بۆچی ناپرسی، بۆ لێرە راوەستاوم؟.

- جا وا پرسیمان.

وەرامدانەوەکەی مارف زۆر تاڵ و گەوجانە بوو، کوتەکێك بوو بەسەر بارامدا درا،لەگەڵ ئەوەشدا، خۆی نەشێواندو وتی:

- کاکە پێویستم بە پەنجا دینار هەیە.

مارف, بە بیستنی پێویستم بە پەنجا دینارە، سەری کاس بوو، دەمی بەیەکدا هات، ویستی شتێ بڵێ، بەڵام بارام نەی هێشت بیترازێنێ و رووی خۆیی لێ قایم کردو وتی:

- بەهەر جۆر بووە دەبێ بۆم پەیدا بکەی، ئەگەر تۆش نەمدەیتێ داوا لە حەلاوخان دەکەم.

مارف دەیزانی ئەگەر حەلاو بزانێ بارام داوای پەنجا دیناری لێ دەکات، قەرزی یەك و بیستی بۆ کردبێ بۆی پەیدا دەکات، بۆیە شل بوو وتی:

- ئەی دوێنێ بۆ پێمت نەوت!. ئێستا بەم بەیانییە زووە لە کوێ پەنجا دینار دەس خەم!.

- ئەمڕۆ، ئەم بەیانییە نەوتەکەمان دەدەنێ، حەز ناکەم لە کیسم بچێ، رەنگە هەر لەوێ بیفرۆشمەوە و پارەکەت بۆ بێنمەوە؟

دوا برگەی قسەکەی بارام بۆ هەڵنان و دڵنیا کردنی مارف بوو، دەنا بارام لەو نیازەدا نەبوو وابکات.

مارف کەلێنێکی لە داواکارییەکەی بارامدا دۆزییەوەو وتی:

- جا ئەگەر نیازی ئەوەت هەبوو، نەپارەی دەویست و نە بەرمیل، هەر لەوێ بە یەکێکت دەفرۆشت و دەگەڕایەوە!.

- قسەکەت راستە.

- ئەی چۆن؟! برۆ بەرمیلکە بگێڕەوە و پسووڵەی وەرگرتنەکە بە یەکێك بفرۆشە و سفت و سۆل بۆ خۆت بگەڕێرەوە، خوا دەزانێ وا باشە.. من بۆ تۆمە!.

- بارام بە وشەی من بۆ تۆمەکەی مارف خراپ دڵی گوشرا، چونکە دەیزانی: بۆ خۆیەتی و دەیەوێ لەیەخەی خۆی بیکاتەوە، خەتاکەش هی خۆی بوو، نەدەبوو فیکری فرۆشتنەکە بدات بەدەست مارفەوە..

بارام خۆی نەدا بەدەست قسەکانی مارفەوە، خۆی جەم کردەوە و وتی:

- کاکە تۆ پەنجا دینارەکەم بدەرێ و حەقت نەبێ، ئەگەر نەمدەیتێ لە حەلاوخان داوا دەکەم.

مارف کە زانی لە کۆڵی نابێتەوە. حەلاویش زۆر خاتری بارامی دەگرت، بۆیە سەرێکی باداو پیشەکی لە سنگی خۆیدا پەنگ دایەوە، پلتۆکت لێ بدایە دەتەقی.. ئیتر زمانی لە هەر دوو لاوە پەنچەر بوو، نە بەلای ئەرێدا، نە بەلای نەرێدا نەسووڕا، هەر ئەوندە بوو منگەیەکی لێوە هات و لەژێر لێوەوە وتی:

- تو خوا ئێستا وەختی پارە قەرز کردنە؟!.

بارام کەزانی مارف ئەگەر ئەو قەرزی نەداتێ حەلاوی ژنی دەیداتێ تەزوی سەرکەوتنی پڕ بە پەشیمانی و بەسەرخۆدا شکاندەوە، رای ماڵی، هەولێدا وەك جاران متمانەو بە خۆدا راپەرمینی خۆی خڕ بکاتەوە، چی هەولێدا وەك شووشەیەکی شکاو وەك خۆی لێ نەهاتەوە، لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- بارام ئەمە تۆیت! دەلێی سەرت بە نووکی نێزەدا هەڵواسراوە، کەی تۆ لە ژیانتا دەست خستووەتە سەرشانی خەڵك و قسەی بەزەیی دارو نەرمت بۆ خەڵك کردووە!. ئەم بەرمیلە پڕ گووە، هەمووو دەمارەکانی لەش و دەروونتی لێك ترازاند..



مارف ئەفەنی دەستێکی لە باخەڵی کوتا. دیار بوو پتر لە پەنجا دینار لە کیفەکەیدا هەبوو، نەیویست پارەکان لەبەر چاو بارامدا دەربێنێ، نەبادا لە قسەکانی پێشووی بکەوێتە درۆوە، یان نەبادا بزانێ پارەی زۆرەو درەنگ قەرزەکە بداتەوە، بۆیە وتی:

- راوەستە پەنجا دینارێکم لای حەلاو بۆ خەرجی رۆژانەی ماڵەوەمان داناوە.. بزانم لەو بۆتی وەرناگرم.. گەڕایەوە ناو ماڵ..

بارام بە دزییەوە لە کەلێنی دەرگاکەوە، سەرنجی چوونە ژوورەوەی مارفی دەدا.. گوێی لێ بوو بە ئاستەم دووجار گازی کرد:

- حەلاو؟. حەلاو؟. کەمێك بێ دەنگ بوو، دیار بوو حەلاوخان بەشتێکی ترەوە خەریك بوو.

بارام لا چاوێکی بە شوێن مارفدا گێڕاو دی کە گەیشتە لای دەرگای ژوورەوە و دەستێکی بە باخەڵیا کردو سەفتە دینارێکی دەرهێنا و پەنجا دینارێکی لێ جیا کردەوە و دووجار ژماردی و خستییە لای چەپی بەرکییەوە.

بارام وەك پڵنگی بریندار ئۆقرەی لێ برا بوو، رۆیشتنی بە خێرایی بەرمیلەکە و بە دەمەوە هاتنی نە بە دڵی مارف سەریان پێ خوار کردبوو بۆیە ئاواتی دەخواست ئەو کابرایە بەرمیلەکەی ببردایە نەك ئاوها لەبەر ئەو دەرگایە راوەستایە، بەڵام مەسەلەکە تەنها لە بەرمیلەکەدا نەمابوو، بارام لە نێوان ئەو دوو بەزمەدا توایەوە، دواکەوتنی مارف و وەخت بەسەرا چوونی بە رۆیشتنی عارەبانەکە و ئەگەری پەشیمان بوونوەی مارف بەو بەهانەوە کە حەلاوی ژنی بە بێ پرسی ئەو پارەکەی خەرج کردووە, ئەو ختوورانە بوونە خەم لەو بەر دەرگایەدا کێچیان لە کەوڵی بارام کردبوو.. خۆ ئەگەر دڵنیا بوایە حەلاو لە ماڵەوە نییە دەستی بەروویەوە دەنا. جا ئەگەر واش بوایە، خەمی ئەو توانەوەو ئەو دابەزینەو ئەو دەست بەروونانەوە، ئەو کات بەفێڕو دانە بارتەقای نەبوو، بارام دڵنیا بوو چوونە ژوورەوەکەی مارف بۆ ئەوە بوو تا وا پیشان بدا، ئەو پەنجا دینارەی کە لەوانەیە بیداتێ هی خۆی نییە بۆ پێویستییەکانی خەرجی رۆژانەی ماڵەوەیە و دەبێ زوو بدرێتەوە.

- حەلاو کە گوێی لە بانگکردنەکەی مارف بوو دوای ماوەیەك بە پەشۆکاوی بە دەمیەوە هات. مارف زوو بەدەست و چاو ئاماژەی دایە و تێیگەیاند کە بانگکردنەکە بۆ چەواشەکردن بوو. بۆیە حەلاو زۆرتر پەشۆکاو لە درزی پەردەی پەنجەرەکەوە سەیرێکی ناو حەوشەکەی کردو

کشایەوەو بە دەست و دەم و چاو لە مارفی دەپرسی مەسەلە چییە!؟ ئەویش تێیگەیاند کە شتێکی وا نییەو بێ دەنگ بێ..

بارام کە ئەوانی بەو جۆرە دی خۆی لەگێلی داو وای پیشاندا بیر لە شتێ دەکاتەوە ئاگای لەوان نییە..

مارف بۆ ئەوەی لێی نەشێوێ پەنجا دینارەکەی دەرهێناو سەر لە نوێ ژماردییەوەو خستییەوە ناو لەپی دەستی, ئەویتری لە بەرکی لای راستیا قایم کرد.

حەلاو پێی سەیر بوو مارف خراپ پەشوکابوو بۆیە پێی وت:

– بۆ وا شێواوی؟.

– هیچ نییە. دوایێ پێت دەڵێم. خۆی ئاسایی کردەوەو بە دەمیش بە دەنگی بەرز دەیوت:

– قەید ناکا، ئەمڕۆ و سبەینمان هەبێ پەك ناکەوێ.

پەنجا دینارەکەی لەبەرچاو بارامەوە ژماردەوە و دایە دەستی.

– کاکە، ئەو پەنجا دینارەم لە حەلاو بۆ وەرگرتی، خوا دەزانێ لەماڵی مندا هەیەو نییە، هەر ئەوەیە. تۆش کەیفی خۆتە.. بە گوێم بکە، خۆت ماندوو مەکە، یەکسەر بیفرۆشەو پارەکە بخە تەنکەی باخەڵتەوە، من لەبەر قەرزەکەی خۆم نییە.. بۆ تۆمە..

بارام لە وتەکانی مارف چاك حاڵی بوو، بۆیە هاتە دەم و پێی وت:

بڕوام پێتە! نایەڵم ماتڵ بن.. سوپاسی حەلاو خانیش دەکەم.. یەکسەر بەرەو راستە شەقامەکە تێی تەقان..



## (3)

بارام کە پەنجا دینارەکەی وەرگرت، پێی وابوو شیربایی یەکێك لە کچەکانی وەرگرتووەو دەستی گلاو بووە، چاری ناچار بوو، بە هەڵەداوان رێی عارەبانەکەی گرتەبەر، لە سیلەی خەستەخانەکە، کە پێچی کردەوەو گەیشتە سەر راستە شەقامەکە، لەبەردەم چوار رێیانەکەدا بەدرێژایی رێی بەرەو بەنزیخانەکە دەیڕوانی، عارەبانەیەکی وای نەدی بەرمیلی بەسەرەوە بێ..

هەندێ راماو کەوتە لێك دانەوە، ئەگەر تەکسی بە دەدینار بگرتایە، لەو حەفتا و سێ دینارەی باخەڵی بۆ کرێی عارەبانە و نەوتەکە دەری نەدەهێنا، لەو پارەیە تەنها سێ دیناری بۆ خەرجی خۆی بوو، پێ نانە ناو تەکسی لە دە دینار کەمتر نەبوو، ئەوانیش ناحەقیان نەبوو، لەو رۆژانەدا لیتری بەنزین لە بیست دینار کەمتر نەبوو، جا ئەگەر تەکسی بەو پارەیە بگرتایە حەوت دینار لە پارەی نەوتەکە کەمی دەکرد، کابرای عارەبانچیش ئەگەر بەرمیلەکەی نەبردبێ ئەویش بەکرێی خۆی نەبێ رازی نابێ.. بۆیە بارام بڕیاری دا بە پاس بڕوا، چشی لێ کردو دەیوت تازە هەرچی بووە، تێپەڕیووە، هاتنی پاسەکەش بەلای کەمییەوە چارەك ساتێکی دەویست، لە وێستگەی پاسەکەدا وەك چۆلەکە پارساییەك بە شوێن دانەوێڵە بۆ بێچووەکانی بگەرێ وا بەبێ ئۆقرە کەوتە چاوەڕوانی، سێ چوار هەنگاو بەرەو ژوور بۆ هاتنی پاسەکە دەیڕوانی و هەنگاوی دەنا و ئەوەندە چاوەڕوانی کرد ملی درێژ ببوو، چاوی رەشکەو پێشکەی دەکرد، لە دوورەوە هەر لۆرییەك هەر پاسێك دەهات خۆی ئامادە دەکرد، کە نزیك دەبوونەوە ئەوانە نەبوون بەلای بەنزیخانەکەدا بڕۆن، زۆر هاتن و زۆر چوون، ئەو کەسانەی کە لەوێ چاوەڕوانی هەمان پاسیان دەکرد وەك ئەو پەلەیان نەبوو، زۆربەیان ناسیاو بوون، بەڵام ئەو لەبەر گوشاری وەقتەکەو پەستی نەهاتنی پاسەکە، با نزیکیش بوو بن نەی دیتبوون، رەنگە ئەوانیش گەلێ تەماشایان کردبێ و نەیانزانیبێ بۆ وایە.. داخۆ چەند جار لەکاتی هاتن و یان تێپەربوونی پاسەکاندا لێوی توورەیی کرۆژتبێ و چەند جار چاوی خۆی هەڵ پرواندبێ، یان داخۆ چەند جار پانتۆڵەکانی شۆڕ بووبنەوە و هەڵی کێشابنەوە و بلوزەکەی بەری بە بەرکەمەریدا راکێشا بێ،

تۆ بڵێ ویقاری خۆی لەو شوێنەدا تێك دابێ؟ لەوانەشە هەندێ کەسی دواند بێ و لەبەر رووانین و چاوەڕوانی دواندنەکەی پچڕپچڕ کردبێ و بەبێ بایخانە وەرامی رۆژ باشییەکانیانی دابێتەوە، کەس ناتوانێ بڵێ لەو شوێنەدا بووە کەسیش ناتوانێ بڵێ وانەبووە، ئایا کەس لەو جۆرە هەڵوێستانەدا دەتوانێ خۆی بکات بە دوو بەشەوە، بەشێکی بکات بە چاودێری بەشەکەی تری، لە دوایشدا بەراستی و بێ پێچ و پەنا وەك، خۆی بیدات بە دەستەوە، هەی رووی زەمانە و زرووف رەش بێ کە رەوشی بارامی وا خولداو گەیاندییە ئەو حاڵە، بارامی جوامێر و خانەدان وا لێ بکات خەمی ئەوەی لێ بنیشێ، ئەگەر هاتوو یەکێك لە پاسەکەدا ناسیاو بێ لەگەڵیدا سوار بێ، لەوە بترسێ پارەکەی بۆ بدات، یان وای لێ هاتبێ دینارێك لە سێ دینارەی خەرجییەکەی خۆی لە مستی بنێ و ئامادەی بکات، لەمە سوار بوو پارەی خۆی بداو لە خەڵکانی تر خۆی گێل بکات؟. بارام وای لێ هات بە خۆی بڵێ:

– لەمە چوومە ناو پاسەکەوە لە پەنجەرەکەیەوە چاو دەبڕمە شەقامەکە و خۆم لە خەڵك دەدزمەوە، بەو بۆنەشەوە سۆراخی بەرمیلەکەم دەکەم لە کوێدا دیتم دادەبەزم و هێدی هێدی لە تەکیا بەرەو بەنزیخانەکە دەچم..

لەو خەیاڵەدا بوو پاسەکە بە ناڵە ناڵ و باری قورسەوە هات، دووکەڵی گزۆزەکەی هەناسەی رێبوارێکی ماندووی پەککەوتەی بار قورس بوو.. ئەوانەی کە چاوەڕوانییان دەکرد هەر یەك خۆی ئامادە دەکرد کە پێش هەمووان بکەوێ و خۆی تێ پەسێنێ.. پاسەکە راوەستا، دەرزیت لەناو هەڵدایە نەدەکەوتە خوارەوە..

بارام لە هەمووان بۆ هاتنی پاسەکە پەرۆش تر بوو، ناچار بوو دەق و ویقاری خۆی بشکێنێ، وەك ئەوانەی دەیانویست سوار بن هەڵپە بکات و پاڵ بنێ، دەنا هەر چاوەڕوان دەبێ.. پاسەکان لەمسەرو لەوسەروە خۆیان پڕ دەکرد ئەوجا دەکەوتنەڕێ، بەدرێژایی رێگەش خەڵکانێك هەبوون سواربن، ئیتر ئەوەی لە نیوەی رێدا سوار بوایە دەبوو شەرم نەکاو خۆی پەساندایە ناوی، یان خۆی پیا شۆربکردایەتەوە.. هەر جۆر بوو، بارام توانی لەدەم دەرگاکەوە نووکی پێی لێ گیرکاو خۆی پیا شۆر بکاتەوە.. هەر چەند کابرای سەکن هاواری لێ کرد:

– مام حاجی جێی سوار بوون نەماوە، ئەفەندی دەرگاکە قەپات نابێ وەرە خوارەوە..

بارام خۆی لێ کەڕ کرد، سنگی بە سمتی ئافرەتێکەوە نا، ئەو کەمێ لەسەرەوە بوو..

پاسەکە وەك خەستەی لەش قورس حینگی بە شەقامەکەی بەردەمییەوە دەناو، تەکانی دەداو دەکوژایەوە، بەو جولان و کوژانەوەیە خەڵکەکەی ناوی دەشڵەقان و بەیەکییەوە دەی



چەسپاندن.. ئافرەتەی بەر سینگی بارام بە تەواوی هەردوو لاسمتی لەسەر هەردوو شان و دەم و سەقەڵی بارام گیر بوون، دیار بوو ئافرەتەکە نەی زانیبوو سواربوونی ئەو جۆرە پاسانە لە نیوەی رێدا مەشکە ژەنەی لە پاش و پێشەوە پێ دەکەن، یان لەوانە نەبوو جیقەڵدان تەنگ و جلڤانە بێ و خۆی بەکاڵایەکی کەم و پیاو بە ئاژەڵێکی بێ ئامان بزانێ و پێی وابێ گورگن کەوڵی ئافرەتان دەکەن، یان لەوانەیە پێی وابوو بێ: ئافرەت روبارێکە چەند لێی بخورێتەوە وشك ناکات.. ئەی خۆ ماستی ناو مەنجەڵی ماست فرۆشەکان نییە هەر کەسێ بێ و پەنجەی پیاکاو بیلێسێتەوە و لێی کەم بکاتەوە، یاخود هەر لەوانە بوو دەیزانی لەناو جەنجاڵێکی وەهادا ئەوشتانە روو دەدەن، مرۆڤیش چ پیاو چ ژن لەو جۆرە شوێنانەدا لێیان ناگیرێ، ئەگەر وانەبووایە، دەبوو بارام ببێ بە فیلمی شۆراوەی ناو پاسەکە، هەر لەترسی ئەوەدا بوو ئەو ئافرەتە پێی بڵێ:

– کابرا ئەوە شەرم ناکەی لە پشتەوە خۆت لێم جووت کردووە، بارام دەیزانی ئەگەر واش بڵێ، خەڵکەکە لێی ناگرن، ئەی خۆ نافرێ، هەر ئەوەندە لێی دەگیرا کە کابرای سەکن وتی:

– مام حاجی جێی سواربوون نەماوە کەچی سواربوو.. دڵی بەوە خۆش بوو رەنگە بە ناوی (مام حاجی) خەڵکەکە وا بزانن مەبەستی ئەو نییە.. ختوورەی دڵ و حەیاچوون لەو هەڵوێستەدا بارامیان راگرت، دەنا هەر کەسێکی تر بووایە لەوانە بوو، بەنەرمی کەفەڵ لووسی لەشی وەك کەرەی ناو تاوەی سوورەو کراو بتوایەتەوە و دەستی بەربوایە و بکەوتایە خوارەوە.. بۆیە لە دڵەوە نزای دەکردو دەیوت:

– ئەی یەزدانی پاك تۆ ئافەریدەی خۆت چاکی دەناسی و تاقیشی دەکەیتەوە، راستە من وەك خەڵکی ئەوەندە ملم بۆت کەچ ناکەم و بە جۆرێکی تر دەتناسم، لەم هەڵوێستەدا فریام کەوە، لەم تەمەنەدا توانای ئەوەم نەماوە ئەو هەموو خەڵکە دڵنیا بکەم و پاکی خۆمیان بۆ دەرخەم.. تۆ ئێستا منت خستووەتە ناو تەنوورێکەوە رەنگە پێشم بڵێی:

– نەکەی بسووتێی!..

لە راستیدا ئافرەتەکە ئەوەندە شل و نەرم بوو ئاسنی دەتواندەوە.

– ئەی یەزدانی مەزن تۆ ئاگاداری، من لە تافی لاویەتیشدا نەموێراوە قسە لەگەڵ ئافرەتاندا بکەم، ئێستاش هەر ناتوانم.. زۆرجار نارەزاییم دەربڕیووەو پێم وابووە تۆ منت لەو بوارەدا بێ بەش و مەحروم کردووە، ئێستا بەم ریشەی ماشوو برنجەوە تووشی چیت کردووم، مەمکە بەگاڵتەجاڕو تیروتانە تێگرتنی دەم رووت و چەقاوە سووی ناو ئەم پاسە..

بارام خۆی ئەو بەزمەی بۆ خۆی سازدابوو کەچی لە یەزدان دەپاڕایەوە نگابانی بکات بەو جۆرەی سەرەوە لە دڵدا نزای دەکرد..

وردە وردە شل و نەرمی ئافرەتەکە بەناو لەشیدا وەك مۆمی تواوە لەسەریەوە بەرەو خوارووی لەشی ئالۆشەکانی رادەمالی.. بارام لەو کەسانە نەبوو دەرەقەتی ئارەزووەکانی خۆی نەبیّ و جەڵەوی هۆشی لیّ بسێنن و لە گێژەنەی بترازێنن و گەمە بەویستی بکەن.

لە پڕ ئافرەتەکە هاواری کردو وتی:

– هەی نا پیاوینە، ئەم پیاوەی بەر دەرگا خەریکە بکەوێتە خوارەوە.. ئافرەتەکە وای وت و پالی بەیەك دوو زرتە زەلامی پێشییەوە ناو تۆزێك سەرکەوت و بارامیش بە تەواوی ڕێی بووەو لە ئافرەتەکە کەمێك ترازا، بەڵام بە دەنگ بەرزکردنەوەی ئافرەتەکە ڕەنگی پەڕی و زەرد بوو، دڵی لەسەر سەد لێی دەدا.. مۆچرکێك لەبن پێیەوە بروسکەی داو لە تەپلی سەریەوە دەرچوو، هەموو گەرماییەکەی لەشی بوو بە هەڵم و مەحف بووەوە.

کەزانی هاواری ئافرەتەکە دژ بەو نەبوو بەڵکو بۆ ئەو بوو، تا توانی هەوا پیسەکەی ناو پاسەکەی هەڵمژی و سییەکانی خۆی پڕ لە هەوا کردن، وای دەزانی نیگای لە بەهەشتەوە بۆ هاتووە، بۆیە پڕ بە دڵ ستایشی خوای کردو دەیوت، ئەی یەزدانی مەزن لەمەودوا لێت دوور ناکەومەوە، دیارە لە تەنگانەدا فریای دۆستانی خۆت دەکەوی. ئەو دۆستانەی کە لە خۆشەویستیدا لە تەنگانەدا نەبیّ ناوت نابەن، وەك ناحەزانت ناتکەن بە کوتەکی دەستی خۆیان، ئەوانەی کە بە ڕواڵەت یاری تۆن و درۆ بە دەمی تۆوە دەکەن و خۆیان بە بریکارو سەفیری تۆ دەزانن..

سوپاس بۆ تۆ کە لەم تەنگەبەرەدا ڕزگارت کردم.. بەلام بۆ بەرمیلەکە لێت ناپاڕێمەوە، کەیفی خۆتە، من ئەوەندە چاکەم بۆت نییە، چونکە دەزانم تۆ پێویستت بە کەس نییە. ئەمەی دەرحەق بەمن کردت مافی ئەوەیە کە لە ناخی دڵەوە چۆن وێنات دەکەم، وەك ئافەریدەیەك نازت بەسەردا بکەم، لە حزووری تۆدا ئەوە نالێم: ئەو ئافرەتە لەبەر سنگ و قاچوقۆڵی ئاگای لە پشتی نەبوو.. نا.. وا نالێم!..

بارام لەبەر ڕەوشی خۆی ئاگای لە بۆلەبۆلی شوفێرەکە نەبوو لە چوار ڕێیانی پەیکەرەکە ی – گاد گرۆس- دا پۆلیسەکانی هاتوو چۆی ناوشار ئەو ڕۆژە لەوێ و لە چەند چوار ڕێیانی تری شاردا تەڵەی گیرفان پڕکردنیان بۆ پاسەکان نابووەوە، ناحەقیان نەبوو ئەوانیش وەك خەڵکی تر خەریکی کاسبی خۆیان بوون، چەند مانگێگ بوو مووچەیان وەرنەگرتبوو، بەڵام ئەوان وەك



فەرمانبەرەکانی تریەکیان نەکەوتبوو، دەیانزانی فەرمانگەی هاتووچۆ نغرۆ بووەو کەس خۆی ناکاتە خاوەنی.. دەیانزانی گەلیّ لە ئۆتۆمبێلەکان ساڵانەیان تازە نەکردووەتەوە، یان ماوەی مۆڵەتەکانی شۆفێرەکان تێپەڕیووە، ئیتر بەو بەهانەوە رایان دەگرتن و دوای هەندێ بینەو بەردەی رووکەشیی فێڵاوی بەبرە نان و کەبابێك دەمیان چەور دەکرا، بەو جۆرە ڕۆژانە گیرفانی خۆیان پڕ دەکرد، ئەو پاسانەش کە زیاد لە رادەی ئاسایی نەفەریان سوار بکردایە، لەمە دەگەیشتنە ئەوێ پۆلیسەکان دەوریان دەدان، ئەگەر هەموو شتێکی تەواو بوایە، هەر وازییان لیّ نەدەهێنان و بەهانەیەکیان بۆ دەدۆزینەوە، چەند کەسێکیان لیّ دەهێنانە خوارەوە یەکدوانێکیان سەردەکەوتن و بەبیّ مەبەستانە سەیری ئەوانەیان دەکرد کە بەپێوە راوەستاون.. لەسەرێکی ترەوە یەکدوێکیان لەگەڵ شوفێرەکەدا دەکەوتنە قسە و داوای مۆڵەتی ساڵانە و مۆڵەتی لیّ خوڕین و شتی تریان دەکرد، هەندێ جرت و فرتیان دەکردو لە کۆتاییدا، لە پشتەوە هێلکەیەکیان بە شوفێرەکە دەجووقان و ئەوجا بەهێما ئەفسەرەکەی خۆیان تێدەگەیاند و دەیانوت:

– هەموو شتی تەواوە..

هەموو پێزانەو قاقەزە شڕوپڕەکانیان دەدایەوە و بەڕێیان دەکرد، هەندێ لە شوفێرەکان دەیانزانی خولیای چیانە، راستەوخۆ برە پارەیەکی لەدەست دەنان و بەڕێیان دەکردن..

دیار بوو شوفێری پاسەکەی بارام لەو سەرەوە، سەری خۆی چاك کردبووەوە، بۆیە پێیانی دەوت، من لەو سەرەوە مۆڵەتم تازە کردووتەوە، بەڵام ئەو قسە لای ئەوان نەیدەخوارد و خۆیان لە گێلی دەداو بەهانەی زۆریان بەدەستەوەبوو، دەبوو کلاوی لەسەر بنێن و شتێکی لیّ بقرتێنن..

شوفێرەکەش پەلەی تۆمارکردنی سەرەی ئەو سەری بوو، بۆیە لەوە زیاتری درێژەی نەدایە شتێکی خستە ناو گیرفانیانەوە و ئەوانیش خاو بوونەوە و ڕێیان بەردا..

یەکێك لە سوار بوانی ناو پاسەکە دەنگی هەڵبڕی..

– بە شوفێرەکەی وت: مادامەکی دەتزانی مەسەلە وایە، زوو بۆ راییت نەکردن؟!..

– خاڵە گیرمان بەدەستیانەوە خواردووە.. ڕۆژ تا ئێوارە ئەمە بەزمیانە.. ئێمە کەسابەت بۆ ئەوان دەکەین.

یەکێکی تر وتی:

– ئەو راوە ڕێوییە بۆ کەوڵەکەی بوو!..

یەکێکی تر:

- بەڵێ بۆ پێنج دینارەکەیە..

یەکێکی تر بەتەوسەوە دەیوت:

کاکە ئەوانیش کەسابەتی خۆیان دەکەن..

یەکێکی تر:

- کاکە لە ئاغام دیتییە و لە گوندێم ریتییە.. گەورەکان ئامێرە قورسەکان ئاودیو دەکەن، ناوەندییەکان بۆیان دەبەن وردیلەکانیش گسکی لێ دەدەن..

یەکێکی تری گاڵتە بازو قسەزان دەمی کردەوەو وتی:

- (وردیلەکانیش گسکی دەدەن)! یەکێکی تر وتی: بۆ قسەکە تەواو ناکەی..

(پۆلیسش کەولّی سایقان دەکەن،سایقیش کەولّی ئێمە دەکەن، ئێمەش خوا رەحمان پێ بکات).

یەکێکی تر رووی دەمی لەوەی پێشوو کرد:

- تۆش تەواوت نەکرد.

- بە خوا من هەر ئەوەندەی لێ دەزانم..

- نا، ماویەتی.. بڵێ:(شەوکوتەکانی شەویش دەکوتنە سەر ماڵان و دەکوژن و تاڵان دەکەن..)

یەکێکی تر هاتە دەم و وتی:

- ئەی باسی ترومپا و کاسەو کەوچك و ئۆتۆمبیل و تایە دزین بۆ ناکەن؟.

یەکێك لە پشتەوە پاڵی دابووەوە خۆی بە پیاوێکی بەویقار دەزانی، لەبەر خۆیەوە هاتە قسە و دەیوت:

- کاکە ئەوانە داخلی ئەو دەفتەرە مەکە! ئەوانە کە شتوومەکی بەر دەرگاو جلی شۆراوی بەرستەوەکراو دەدزن وردەڵەن و ناچنە ناو لیستی گەورەکانەوە..

سوار بووانی ناو پاسەکە کەسیان بە چاك نەهێشتەوەو بەراشکاوی رای خۆیان دەربڕی..

پیاوێکی ریش سپی، دامەزراو، لە گوێ گرتن بەولاوە خۆی تێکەڵاو بەو بەزمە نەکرد، بەڵام کەزانی ئەوانە پێی قسەکردن و تانە و شاندنیان هەڵبڕی، خۆی پێ نەگیراو وتی:

- ئەوە هەمووی پاشماوەو میراتی داگیرکەرە، ئێشی ئەو زامانەیە کە ساڵەهای ساڵە خوێنیان بەسەریەکدا کەوتووەو ئاهوناڵەیان لە شوێن خۆیا پەنگیان خواردووەتەوە وا ئێستا



بەرووی خۆماندا تەقیونەتەوە... بەمن بێ ئەوەی داگیرکەر دروستی کردووە لەبنەوە دەربهێنرێ و نەمێنێ و سەر لەنوێ دروست بکرێتەوە... شۆڕش، ڕاپەڕین.. چییە؟.

هەڵوەشانەوەو بنیات نانەوەیە، لە هەڵوەشانەوەدا چی تۆزو گەنەو کەوێڵ هەن هەموو دەوەرن و دەڕۆن و دەبنە خاپەڕۆك و دەکەونە بەرپێ... هەندێ ڕاما و ئەوجا سەرقاپی قسەکانی بەم وشەیە نایەوە: (جانم بۆ وا پشیتان تەنگە.. یەك دوو رۆژێکی تر ئەوانە مەحف دەبنەوە!.)
.

گەنجێکی دەم رووت رووی تێ کرد:

- بە تەما مەبە خاڵە، ئەمانەش لەکاسەی ئەواندا ئاویان خواردووەتەوە هەتا بۆ ناو گۆڕەکە شۆڕ نەبنەوە واز ناهێنن..

کابرا قسەی کوڕە گەنجەکەی زۆر لاگران بوو، سوور بووەو رووی تێ کردو بە توندی بەرپەرچی دایەوە:

- کوڕم تۆ منداڵی دوێنێ و هێشتا سمێڵت لێ نەڕواوە، دەنا دەتزانی مامی خۆت چی دەڵێ: کوڕم سەگی ئەمانە لە پاشا و سوڵتانەکانی داگیرکەر چاکترە.. تێ گەیشتی کە تێ نەگەیشتی!..

دەم رووتەیەکی تر خۆی دەربڕی و بەشێوەی پلاردان لەو پیاوە وتی:

- خاڵە بەو ئیعتیبارە تۆ منداڵی بەسەر پێریێی تێ دەگەیت و تێ ناگەی ئێمە بەرەو کوێ روو دەنێین!؟..

پیاوەکە پیشی خواردەوە، لە ترس ئەوەی نەبادا بکەوێتە بەر تەشقەڵەی ئەو دەمرووتانە لە شوێن خۆی کپ بووەوە..

بارام تەزووی ئافرەتەکە کەمێ بەری دابوو، گوێی بۆ ئەو قسانەی ناو پاسەکە شل کردبوو، وتەی پیاوە ریش سپییەکەی بەدڵدا چەقی و لێیەوە نزیك نەبوو دەنا بەدڵ ئافەرینێکی وای لێ دەکرد وەك تیشکی پرۆجەکتەر شەوق بخاتە ناو دڵییەوەوگەردەلوولی ئەو پلارە لە هەناویدا بڕەوێنێتەوە.. لەدڵ خۆیدا دەیوت جا ئەگەر بە تاریك بینی ئەمانە بێ، دەبێ ئەو عارەبانچییە کە بەرمیلەکەی منی برد کڵاوێکی وای لەسەر نابم دەیان پینەی پێوەبێ.. قسەو گەرەلاوژەکانی ناو پاسەکەی بە تەقە تەقی بەرمیلەکەیەوە دەچووان، تەنها تەقە تەقێکی بێ مانا بوو، هەر دەنگدانەوەی قۆرتەکانی ناو شەقامەکە بوو..

لەروویێکی ترەوە گەڕەلاوژەی ناو پاسەکە بەڵگەی هۆشیاری خەڵکەکە بوو، لەوانەشە بووتریّ لغاو داڕنینی کپکردنەوەی ساڵەهای دەنگە خنکاوەکان بوو..

ئەو پۆلیسەی پارەکەی وەرگرت بە حیزانەوە بە شوفێرەکەی دەوت:

– ئاخر ئێمە بۆ ئێوەمانە، سەکنەکەش بە تێزەوە وەڵامی شوفێرەکەی دایەوەو دەیوت:

– بەڵێ.. بۆ ئێمەیانە!.. لێخوڕە بڕۆ..

بارام هەرچەند خەمی بەرمیلەکە سەر دڵی گرتبوو، کەچی لە دڵەوە چێژێکی لەو میلۆدرامایەی ناو پاسەکە وەردەگرت، کەم جار وای بۆ رەخسابوو ئاوا گوێی لەرای خەڵکی ناو بازار بێ.. ئەو لەو بڕوایەدا بوو: ئەوەی بیەویّ رای راستەقینەی خەڵك سەبارەت بە مەسەلە کاتییەکانی بزانیّ لەو هەڵوێستانەدا دەتوانیّ رای گشتی خەڵکەکە بە پۆختەکراوی وەدەست بێنیّ، رەفتاری پۆلیسەکان ئاوەژووکردنەوەی رەفتاری ئەوانە بوو کە سەرە گوریسی کاروباری شارەکەیان درابووە دەست، خەڵکی ئێمەش ئەوەندە دووربین نین، هەر لەمە دەمت کردنەوە بەلای خراپەدا دەیسووڕێنن و بەبیّ بەزەییانە چاك و خراپ پێکەوە لوول دەدەن، هەرچەند هەندیّ لە قسەکان بۆ بەرژەوەندی شوفێرەکە بوون، هەندێکی تریان لەرووی کینەو تانەو تەشەرەوە بوون، بەڵام هەموویان بەسەریەکەو هەڵاوی قوفڵ لەسەر گوزارشت دانەوەیان دەر دەدا..

ئەوەی پتر بارامی نیگەران دەکرد ئەوەبوو لە پەنای ئەو گەڕەلاوژییەدا هەندیّ دەمیان کرابووەوە، بەڵام یەکێکیان لە رووی پۆلیسەکاندا منتقی نەکرد، لە دوو تۆی قسەکانیاندا ژەهری کینەیان بەسەر راپەرین دا دەپژان، هەندیّ نەفامیان کە لەوانە بوون (نانی کۆنە ماسییان دەخوارد و پاسی چڕتاویان دەکرد) بەدەمیانەوە دەقلانەوە..

بارام لە هەموو شتیّ چاو پۆشی بکردایە لە مەسەلەی نەتەوایەتییدا تانەو تەشەری قبوڵ نەدەکرد.. گوێی لەوە نەبوو لەناو پاسدایە، لە بازاڕدایە، مێوانە، ئاوانە، ئەو مەسەلەیە لای ئەو قابیلی گاڵتە پیّ کردن و سەودا نەبوو، ئەو پێی وابوو گەل بەگشتی کاری خراپ ناکات، تووشی نەخۆشی دەبیّ، بەڵام نامریّ، لەرەوتی بەرەو پێشەوە چوون گوزەری مێژوودا تووشی نالەباری و تەنگ و چەڵەمە دەبیّ کەچی هەرگیز گیانی بەدەستەوە نادات، نەخۆشییەکانی بەقەد باڵای خۆی درێژە دەکێشن و چاك بوونەوەوخەلەساندنیشیان درەنگ خایەنە، بەڵام بە راپەڕین و شۆڕش لە هەموو دەردێك رزگار دەبیّ..



بەلای بارامەوە ئەو پلارو قسانە لە دوو سەرەوە تەماشا دەکران سەرێکیان گوزارشت دانەوە بوو لە پەیدابوونی گیانی رەخنەو لیّ پرسینەوە، لەسەرێکی ترەوە، نەفامی و بیّ ئاوەزوویی ئەوانەی دەگەیاند کە عیزەتی نەتەوایەتییان تیا نەرسکا بوو، ئەوانە گرۆیەکی ناو کۆمەڵ بوون لەسایەی داگیرکەردا گۆشکرا بوون بۆیە خۆیان و خەڵکی بیانیان پیّ جیا ناکرێتەوە، دەردە کۆمەڵەکەش لەوانەیە پەنگی خواردووەتەوە. ئەمانە هەر دەرفەتێکیان دەسکەوتایە بە فێرۆیان نەدەداو ژەهری ناو هەناوی خۆیان بەسەر سەوزە گیایی راپەڕیندا دەکردو مەگێزە کرمۆڵەکانیان بەسەرە نەقیزەی ناحەزان ناوەژەن دەکرد..

بارام ئاوا دەیرانییە شت، پێی وابوو شتەکانی دەوروبەر، رووداوەکان دەخولقێنن بۆیە کەوتبووە شوێن ئەو بەرمیلەی وائێستا گومانی لیّ دەکا کە جارێکی تر نای بینێتەوە.. ئەگەر بەهۆی ئەو بەرمیلەوە نەبووایە لەو لاوە لەگەڵ بەرێوەبەرەکەی رووبەڕوو نەدەبووەوە لەلای مارف ئەفەندیش کەم نەدەبووەو لەم لاشەوە ئەوەندە تێکەڵاوی شت نەدەبوو, ئەو هەموو قسە بیّ سەرو بەرانەی بە گوێدا نەدەدرا، تا رادەیەکیش بەرەو وەرگرتنی ئەزموونێکی نویّ راکێشکرابوو وا بەرەو شتی تری دەبا داخۆ چی بیّ و لە کوێدا یەك بگرنەوە.. لە دڵیشەوە بە خۆی دەوت:

بۆ خۆت لێخوڕەو بیّ دەنگ بە.. ئەمڕۆ کورد لە دوو رێیانێکی سەختدا تیّ دەپەڕیّ، مرۆڤی هۆشیار ئەوەیە یارمەتی بداو پشتی بگریّ، بەرەو رێگەی رزگاربوونی یەکجاری پاڵی پێوە بنیّ، ئەو جرج و مارمیلۆق و سیسرکەی ناو قەڵای قەسابخانەکانی داگیرکەر رسوا بکات، وا ئەمڕۆ لە ترسی راپەڕین وڕو سەرسام بوون و نازانن خۆیان بە چ کونێکدا بکەن.. ئەگەر داڵدەیان نەدریّ چەند زۆر بن لەبەر تیشکی راپەڕین دا خۆیان ناگرن..

پاسەکە لەتاو پەککەوتەیی خۆی و لەرك ئەو پۆلیسە لەوچانەی ئەویّ وەك پیرە وڵاخی شەکەت و بار قورس و ماندوو بە نەرە نەڕ کەوتە جمەو لەپشتەوە گزۆزێکی رەشی بەدرێژایی و پانتایی ئەو شوێنەی شەقامەکە دەپژان، کەمێکی مابوو بگاتە تەنیشت گەلەری گەل، لە تاسەیەکی داو یەکێك لە تایەکانی تەقینەوە، دەنگی تەقینەوەکە، ئەوەندە گەورە بوو منداڵان و هەندیّ زەلامی سەر شەقامەکە وایان دەزانی هەمدیسان وەك جاران قلێشاوەتەوە خراپ راچڵەکان، خۆیان بۆ هەڕاکردن تاودا، نەزانرا ئەو تەقینەوە لەتاو بار قورسی پاسەکەدا بوو یان ئەو رکە بوو کە لە هەناوی شوفێرەکەدا لەداخ پۆلیسەکانی هاتووچۆ دابوو کە لەمسەرو لەو سەرەوە تەڵەیان بۆ نابوونەوە، دیار بوو کلاجکردن و گێڕ گۆڕینی شوفێرەکە و چاوی زەق و نوقم

بووی ناو رکەکەی هەڵبەز و دابەزی شەقامەکەی لە پاسەکەش شێواند بوو، لەگەڵ تەقینەوەی تایەکەدا پاسێکی تر بەگوڕ دای بەلایدا و پێشی گرت و راوەستا.. چی لە نەفەرەکان بوو ئەو بە تووند راگرتنەی ئەو پاسە، بۆ یارمەتی دانی پاسەکەی ئەوان بوو، ئەوەندە بە گوڕ راوەستا جڕەی ئیستۆپ گرتنی تایەکانی لە تەقینەوەی تایەی پاسەکەی تر رەکێك و نالەبار تر بوو، وەك مێخ چەقی و شوفێرەکەی وەك سیسرکی قانگ دراو دەرپەڕی و بە دژوێن و قسەی ناشرین هاتە سەر شوفێری پاسە پەك کەوتووەکە و پێ وت:

- هەی نا پیاو..

- من نا پیاوم هەی دایك حیز..ئەمەی وت و ئەو پارچە شیشەی کە لە بن سەندڵەکەی خۆیدا دانابوو بۆی راکێشایە دەرەوە..

شوفێرەکەی تریش کەدی شیشی بۆ دەرهێنا بە پەلە گەڕایەوە ناو ئۆتۆمبێلەکەی و درنافیسێکی درێژی هێناو بە تووڕەییەوە هاتەوەو دەیوت:

- ئێستا پیشانت دەدەم کێ دایکی حیزە، من یان تۆ!.

نەفەری هەر دوو پاسەکە شڵەژان، بەتایبەتی ئەوانەی ناو پاسە پەنجەر بووەکە.

زۆربەیان بە پەلە هاتنە خوارەوە، چونکە زانیان تازە کەڵکی ئەوەی نەما بەو پاسە بگەنە مەیدانەکە، تا ئەو پەنچەرییەو ئەو داوایە دەبڕدرێتەوە، ئەوان دەگەنە ناو بازاڕ، هەندێکیان بە پەلە هاتنە خوارەوە، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەو داوا و قڕە قڕەو پەلاماردانە خوێناوییە بدەنەوە، دەستیان بە کڵاوی خۆیانەوە گرت و "ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە" یان کردە پەناو بەبێ لادانەوە رۆیشتن.

بارام خۆی بە پیاو ماقول دەزانی و هەگبەکەی مامە خەمەی بە کۆڵ خۆیدا دابوو، پێی شوورەیی بوو ئەو دوو زەلامە لەو رۆژەدا کە دەسەڵات داوەشا بوو،دەسەڵاتی نوێش هێشتا نەمەیی بوو، بەجێ بێڵی و لەناو خوێندا بگەوزێن!.. بە تەقەی تفەنگ پۆلیس دیار نەبوون، پۆلیسەکانی هاتووچۆش خۆیان تێکەڵاو بەو جۆرە گرفتانە نەدەکرد، بزن سەری بە قنگی مەڕدا بچوایە، گا بەکلکی وشترەوە ببەسرایە حەقیان نەبوو..

لەرۆژی وادا دەسەڵات پاشگەز دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە سەرەتای پەیدا بوونی، پیاو ماقووڵ و دەم راست جەڵەو لە دەست دەبن، ئەی ئەگەر بارام لە رۆژێکی وەهادا سوود بە کۆمەڵ نەگەیەنێ، ئەی کەی؟ دوورکەوتنەوەکەش لەو جۆرە هەڵوێستانەدا پیشەی ترسنۆك و نەفامە..



ئاوا بارام ئەو هەڵوێستەی سەبارەت بە خۆی هەڵدەسنگان، پێی وابوو پێویستی سەرشانیەتی ئاگرێك بەو ئاوەدا بکات، ئەو یەکدوانێکی وەك ئەویش کەوتنە بەینەوە..

واکابرا دەمی کەفی کردووەو مووی سەری وەك تووکی سیخور راوەستاوە، چاوی پەڕیوونەتە تەوقی سەری و بەدرنافیسێکی دەسکداری درێژەوە، وەك ورچی بریندار پەلاماری شوفێرەکەی تریدا.. ئەمیش لەم لاوە شیشێکی گڕنی دەس داوەتێ و ئەوەی بەدەمیا دێ نایگێڕێتەوە.. ناشزانرێ لەبەر چییە، لەبەر هەر شتێ هەبوو، ئەوە ناهێنێ لەو ناوەدا لەبەر چاو ئەو هەموو خەڵکەدا، ئەو ورگی ئەم بەدرنافیس بدڕێنێ و ئەمیش مێشکی ئەو بەشیشەی ئاسن بپژێنێ.

بارام و چەند کەسانێکی تری ناو هەر دوو پاسەکە دەسەداوێنی شوفێرەکان بوون، بارام و چەند کەسانێك ئاڵنگارەی شوفێری پاسەکەی تر بوون، چەند کەسانێکیش دەستەداوێنی ئەم شوفێرەکەی تربوون، بەڵام هیچیان وەك بارام بە گەرمی هەوڵی ناوبژێویان نەدەدا.

سەکنی پاسەکەی بارام کە چاوی بەدەرنافیسی شوفێری پاسەکەی تر کەوت و زانی نیازی خراپە و وا بە چەند کەسانێك ناگیری و خراپ لە پێستی خۆی دەرچووە، پەلاماری ناو پاسەکەی داو دەمانجەیەکی لە بن دشپوولەکەیدا دەرهێنا، ئەوانەی کە لە ناو پاسەکەدا مابوون کە دییان داوا گەیشتە ئەو رادەیە، سەریان لەبن دەسی خۆیان داناو بەم لاو بەلادا  پەرت و بڵاوەیان لێ کرد، وا بارامیش ئاڵنگارەی کابرای درنافیس بەدەست بووەو تووند گرتوویەتی:

- کورە نەکەی عەیبە.. کوڕە لەبەر خاتری ئێمە.. کوڕە وانابێ! کوڕە شوورەییە..

کابرای بەردەستی خەریك بوو سارد بێتەوە، بەڵام کە چاوی بە سەکنەکە کەوت دەمانجەی بەدەستەوەیە، وەك گای ئەسپانی پیشی خواردەوەو خۆی راپسکان و درنافیسەکەی ئاراستەی سەرسنگی بارام کردو نەڕاندی:

- گەوادینە بەرم دەن.. بۆ دەمگرن!..

نەزانرا دەسی کام زەلام بوو یان چ شتێکی تر بوو درنافیسەکەی لادا، دەنا وای وەشاند بوو گەر بەری بکەوتایە تا دەسکەکەی بەناو سنگی بارامدا دەچووە خوارەوە.. بەهەر جۆر بوو ترازاندنی ئەو درنافیسە لەرەوتی خۆی و ئاراستەکردنەکەی بارامی بە زیندووی هێشتەوە.. بارام خۆی کردبوو بە کەوا سووری بەرگەڕەك.. ئەوەی دەزانی لەو جۆرە هەڵوێستانەدا هێزی شەڕ تا لە خوێنی خۆیدا نەگەوزێت پاشەکشە ناکات، کەزانی ئەوەی ئەو دەیەوێ لەوێدا ناخوات، خۆی راپسکان و رۆیشت، کە سەیری خۆی کرد یەکدوو قۆپچەی کراسەکەی هەڵ

پچڕابوون، له پشتەوە قوفڵ بەندی قایش و پانتۆڵەکەی لێك ترازابوون.. دەسێکی بە خۆیدا هێناو بە دەم ڕۆیشتنەوە بە خۆی دەوت:

- بارام بە شوێن چی کەوتووی و بەچییەوە گلاوی.. بەس نەبوو درنافیسەکە لەسنگم نەچەقا.. ئەی رووت رەش بێ زەلام لای وابوو داخۆ من باوکی یان مامی ئەو شوفێرەم.. ناحەقیشی ناگرم.. لەچیم داوە وا بەرەنگاری دەبم و تووند دەیگرم..

دڵی وەك چۆلەکەی بەندکراو لەناو قەفەزەی سنگیدا دەیفڕتان، ڕەنگی وەك هەڵاوەی زەردی لێ هاتبوو.. بەرەو بەنزینخانەکە دەرۆیشت و ئاگای لەرۆیشتن و هەنگاوەکانی خۆی نەبوو، دەرۆیشت و خۆی ڕێك دەخستەوەو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- ئەی رووی بابتان رەش بێ ئەو سایقانە ج توخمێك بوون.. دەیڕوانییە دواوە گەردەلوولی بەزمەکە تا دەهات بەجەنجاڵتر دەبوو، گەلێ ئۆتۆمبێلی تر راوەستان دەنگی نارەزایی هۆڕینەکانیان شەقامەکەیان کەڕ کردبوو، خەڵك ئاپۆوورەی دا باژەل بو، ئاژاوە گەرم بوو، کەس لە کەس نەبوو..

کابرایەك لەناو ئاژاوەکەدا هاتە دەرەوە بە گورجی بەلای بارامدا تێپەڕی و دەیوت:

- لێیان گەڕی با یەکتری داپاچن، تا یەکتری خەڵتانی خوێن نەکەن ئارام ناگرن.. ئەدی!.. هەشت ساڵ، دە ساڵ، تێریان لەشەڕکردن نەخوارد!.. دەنا نەفەرێکی حیز چییە لە سەری شەڕبێن..

بارام بەقسەی ئەو کابرایەدا زانی گوایا شوفێری ئەو پاسەی ئەوی تیا بووە، پێش ئەویتر کەوتووەو نەفەرەکانی ئەوی سوار کردووە، دیار بوو سەرە بڕێی لی کردووە..

- وەرە ئەو هەموو کەر گەلە ببەستەوە، کێ هەشت ساڵ شەڕی کرد؟!.. داگیر کەران یان ئەوانە!.. ناڵێ: ئەو هەموو قڕەو بڕەیە دەڵاندنی خوێن مژینی داگیرکەرانەو لەناو رەفتاری ئێمەدا رەنگ دەداتەوە.. ناڵێ: ئەوە ئەنجامی پەروەردەکرنی هاووڵاتیانێکە کە ئەو خوێنمژانە گەرەکیان بووەو چەندان ساڵە خەریکن خەڵك بەو جۆرە پەروەردە ببێ.. خوێن مژین و خۆ بە گەورە زانین و توخمگەری و نەژاد پەرستی و خەڵك بە کەم زانین دەردێکی کوشندەیە و لە داگیرکەرانەوە هاتووە و ئێمەشی تەنیوەتەوە.. چی لەم کەروگایە بکەم شت لێك نادەنەوە، شەڕی ئەو هەشت ساڵە گەورەترین تاوان بوو دەربارەی سێ نەتەوە کرا، کورد، فارس، عەرەب، هەرچی بارانی رەحمەت و لێبوردن هەیە بەسەر ئەوانەدا کە شەڕەیان بەرپاکرد بباریێ هێشتا



ناتوانێ تاوانەکانیان پاك بکاتەوە.. دیارە ئەو کابرایەش یەکێکە لەوانەی کە خۆی و خەڵك لێك جیا ناکاتەوە.. خۆی تۆزێ تووڕە کردو بە خۆی دەوت:

- مردووت مرێ تاسەرت پان نەکەنەوە واز لەو قسانە ناهێنی.. تاکەی لەسەر ئەو سەکۆیە وازی دەکەی!؟.

دەی تۆش تۆزێ خۆت کەر کەو خۆت بدە بەدەست لێشاوی زەمانەوە.. چیت سەوز کرد!.. ئەو هەموو خەڵکە بە تۆ راست ناکرێنەوە!..

هەندێ مات بوو.. بارام؟! ئەوە تۆی وا دەڵێ؟!.. چۆن خەڵك بە تۆ راست ناکرێنەوە.. تروسکەی ئاگرێك تاریکی چەند دوورو خەست بێ دەیبڕێ..

بارام دەرۆیشت و بەو جۆرەی سەرەوە پچڕپچڕ لەگەڵ خۆیدا دەدواو جاروبار چاوێك بە بەرو کەمەری خۆیدا دەخشان و خەمی ئەوەی لێ نیشتبوو درزێك لە پانتۆڵەکانی لە میانجی کردنەکەدا دروست بووبێ، بۆیە دەسی بە پاشی خۆیدا دەخشان..

لەپڕ زەردەخەنەیەك بە ئاستەم لەسەر لێوی پەیدا بوو کەمێ رووناکی خستە سەر روومەتی و دەیوت:

- تۆخوا من و ئەو کابرا بارۆکە لەسەرەی ناو پاسەکە جیاوازیمان چییە، من ئەوم بە شێت دەزانی کە تاك خۆی لە ناو پاسەکەدا مابووەوە، بۆیمباخێکی گوڵ گەورەی پانی لەبەر بوو، بەقسەکانیدا کارکتەر بوو، تەماشای ئەو گوڵمەزەی دوو پاسەکەی دەکردو دەیوت:

- هیچ رەوا نییە لێرەدا دابەزین، ئەوانە درۆ دەکەن، شەڕ ناکەن جۆرە تەمسیلێکە دەیکەن بۆ ئەوەیە ئێمە لە نیوەی رێدا داگرن و بڕۆن..

- قوڕی بەسەر ئێستا ئەو دوانە دەیکەن بە شاهید، ئەوجا وەرە شاهیدی بۆ کامیان بدە.. ئەوەندە دەیهێنن و دەیبەن دەکەین بە کاراکتەری راستەقینە..

- تۆخوا من و ئەوە جیاوازیمان چییە؟.. ئەو بەو حاڵەو منیش بەم حاڵە..

بارام ئاوا لەبەر خۆیەوە دەدواو زەردەخەنەی دواندنەکەی شاهیدی لێ دەدا..

لەو ماوەدا بە خێرایی هەنگاوی بۆ لای بەنزینخانەکە دەنا, بەرمیلەکەی بەردا بوو، هەناسەیەکی هاتنەوە سەر خۆی هەڵکێشاو دەسێکی تری بە خۆیدا گێڕاو تەماشایەکی تری قاچوقول و پێڵاوەکانی خۆی کردو لە خۆی خاتر جەم بوو، زانی تەواوەو هاتووەتەوە سەرخۆ، دەسێکی بە سەر و گوێلاکی خۆیدا هێنایەوەو خۆی راستکردەوەو متمانەی بە خۆی دایەوە کە ماوەو وەك خۆیەتی و هەنگاوەکانی پتەو کردەوەو بەرمیلەکەی هاتەوە یادو دەیوت:

- ئای بەرمیلەکە ئەمەش بەزمی تۆ.. جا بەس نەبوو لەو گەردەشەدا بە سەلامەتی دەرچووم.. جا خۆ ئەو دەرنافیسەم بەرکەتایە خۆ قالّم دەبڕایەوە.. داخۆ منداڵەکانم ئەو رووداوەیان چۆن لێك دەدایەوە.. تۆ بڵێی خەڵك چ جۆرە پینەیەکیان لە تەرمی مردنەکەم دەدا.. ئەی برادەرە فەرمانبەرەکانم چییان دەوت؟!.

بۆ درنافیسێك لە سنگی چەقیوەو مردووە! ئەمە یانی چی؟..

لەهەمووی نالەبار تر تۆ بڵێی بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەکەمان بە شێوەیەکی رەسمی مۆڵەتەکەمی بۆ کردبم، خۆ ئەگەر وا نەبێ لە دەستی دێ بڵێ بێ مۆڵەت چووەتە دەرەوە، کەواتە سەرپێچی کردووە، هەندێ حەق و مافی فەرمانیەریم هەبو ئەویش دەفەوتا!.. دەی دەی بڕوامەکە ئەوانە ئەوەندە دڵ رەق بن، یەکێ کە مرد هەموو تۆز و بایەکی لەگەڵ خۆیدا دەڕوا.. سەرێکی راوەشان، خەریك بوو بەخۆی پێبکەنێ، بەڵام خۆی گرت.. بەخۆی دەوت:

- تۆ بڵێ من لەسەر خۆم بم.. بەڵێ ئەوم و ئەوەتام.. لەوکاتەدا خۆی لە رۆخ بەنزیخانەکەدا دییەوە، لە یەکەم چاوگێڕاندا بەرمیلەکەی بەسەر عارەبانەکەوە دی، کوڕە گەنجەکە بەدیاریەوە لەبن کۆشکە بەرزەکەی تەنیشت بەنزیخانەکەوە راوەستا بوو چاوەڕوانی هاتنی بارامی دەکرد..

بارام هەناسەیەکی هەڵکێشاو گەشایەوە.. بەو گەشانەوە هەموو ئەجیاو گومانەکانی ناو دەروونی وەك تەمی قەدپاڵی چیایەکی سەخت رەوایەوە و نەما.. هەناوی وەك پەڕەی گوڵ پاکژ بووەوە، بەو پاکژ بوونەوە هەموو شتێکی لا روون و ئاشکرا بوو، بە رووناکی دەیبینین و وێنای دەکردن.. هەستی بە خۆی کرد کە هێشتا ماوەو لەو پەڕی بووندایە..

- ئەوەتام پێم لەسەر گۆی زەوییەو خەڵك بۆم دەڕوانن ئەوە من و ئەو بەرمیلە کە کەواتە هەردووکمان ماوین, بە دیتنی کوڕە عارەبانچییەکەو راوەستان و چاوەڕوانکردنی دەروونی وا کرایەوە جێگەی هەموو شتێکی تیا دەبوەوە، چێژی دەنگ و رەنگەکان لە شوێن خۆیان دامەزرانەوە، هاتووچووی خەڵکەکەی بەجمەیەکی مەبەست دار نرخاندەوە دوای ئەوەی پێی وابوو ئەو هاتوو چووانە بزاڤێکی بێ مەبەست و بێ هودەن، هەستەکان یەکیان گرتەوە، ئەوەی دەبیسرێ و دەبینرێ هەست دەبزوێنێ هەموویان لەیەکەوە نزیکن هەموویان یەك تابلۆ تەواو دەکەن، ئەو هەموو کێشمەکێشەو ئاڵوگۆڕە هەموویان مانایەك بە تابلۆی ژیان دەبەخشن کە بەردەوامی ژیان و رانەوەستاندنییەتی..



بارام هەر لە زووەوە وابیری دەکردەوە، بۆیە لەمە چاوی بەو کۆڕە عارەبانچییە کەوت، هاتەوە سەرخۆی و لەو گۆشەنیگایەوە سەیری گشت شتێکی دەکرد، گشتیان وەك پیت و وشە و رستەی یەك دەستەواژەی پڕ مانا دەهاتنە بەر بیری..

بەڕوێکی گەشاوە لە عارەبانچییەکە چووە پێشەوە پێی وت:

پێم مەڵێ بۆ دواکەوتی! هەر باسی نەکەم باشە..

کوڕە عارەبانچییەکە بە وتەکەی بارام زەردەخەنەیەکی خەماوی لەسەر هەردوو لێوە ماتەکەی دروست کردو دەنگی نەکرد.

بارام لەو پەژارەدا بوو کە ئەو کوڕە بە دواکەتنەکەی نیگەران بووبێ.. یان شتێ بڵێ.. بە زەردەخەنەکەی ئەوەندە دەروونی رووناك بووەوە گەرمایی دڵی و رۆشنایی هۆشی لە پانتایی ئاسمانی مانگی گەلاوێژ فراوانتر بوو.. هەر شتێکی بووتایە لای بارام جێی دەبووەوە.. ئەو بێ دەنگی و ئەو نێو نیگا پاك و روخسار و زەردەخەنە بێگەردوو خەماویەی ئەو کوڕە عارەبانچییە، لە قولایی دەروونی بارامدا نموویەکی بەرجەستەی وێنەی راستەقینەی گەلە داماو و خێر لەخۆ نەدیوو تێکۆشەر و راپەڕیووەکەی بوو کە تا ئەمڕۆ ئۆخەی لە رزگاربوونی ژێر دەسەیی نەکردووە..

## (4)

نەبارام سکاڵای درەنگ گەیشتنەکەی خۆی بۆ کوڕە عارەبانچییەکە دەربڕی، نە ئەویش نیگەرانی خۆی دەرخست، ئەو لەبەر ئەوەی نەدەشیا دڵیخۆی بۆ یەکێکی کرێ گرتە بکاتەوە لە کاتێکدا کە لایەنی بێ دەنگی گرتبوو، ئەمیش پێی جوان نەبوو لەگەڵ پیاوێکی ئەفەنی وەهادا نیگەرانی دواکەوتن نیشان بدا، خۆ بەو دواکەتنەش پەکی بۆ کارێکی تر نەکەوتبوو لە کاتێکدا ئیشەکە ئەمسەرو ئەو سەربوو.

بارام لای عارەبانەکە هەڵوەستەیەکی کرد وەك بەزمانی حاڵ بڵێ:

– ئای بەرمیلەکە ئەمە تۆی؟! چیت لێ بکەم باشە.. چاکترین شت ئەوەیە، بەشە نەوتەکەمت تێکەم وەك بووکە بە بارانە پێشی خۆمت بخەم و پێکەوە بەرەو ماڵ بگەڕێینەوە..

لەو راو و نیازەدا بوو پیاوێکی کەتەی تیکسمڕیاوی سمێل شۆڕ بەرەو لای هات و بە چەند هەنگاوێك ئافرەتێکی شۆخ لە دوایەوە دەڕۆیشت، ئافرەتەکە لە دوورەوە کە بارامی بە دی کرد نیو نیگای لەسەری کلانەکرد..

بارام بە عەباو سەرپۆشەکەی سەریا زانی ئەوە ئەو ئافرەتەیە، کە لە دەم دەرگای پاسەکەدا گیری خوارد بوو، ئەمیش بەناچاری خۆی پێوەی نووساندبوو، هەر لەو هەڵوێستەدا هەموو لەشی وەك پەیکەری مۆم تواندبووەوە.. ئافرەتەکە تا بڵێی شۆخ و باڵا بەرزبوو. هەر چەند ئافرەتێکی کامل دیار بوو تەمەنی بەرەو چل ساڵ هەڵکشابوو، وەلێ تەمەن و رۆژگار جوانییەکەیان نەژاکان بوو، پەنجە سپیە شووشەییەکانی لە تۆی بەیەك گەیاندنی عەباکەی بۆ سەر سنگە پانەکەی دەرخست و بە زمانی حاڵ دەیوت: ئەم پەنجانە نموونەی ئەو لەشە جوانەن کە وەك رۆژ هەوری ئەم عەبا رەشە بەری درەوشانەوەی بەناو ئاوێزەی تیشکی چاوە تیر ئەندازەکانی و روانینە تریفەدارەکەیدا ئاراستەی سەرتاپای بارام کرد..ئەو چێژەی کە مەگێزەکانی ناو لەشی بارامی مەست کردبوون گواستیەوە ناو دڵی.



وەك ئاماژەیەك بۆ ئاگاداری و زانین: کە ئەوەی لە پێشەوە دەڕوا کەسێکی ناسیاوە بۆیە وتی:

– عەزیز با لەو برایە بپرسین؟

ئەوەندە بەناز و ناسکی وتەکەی لە دەم هاتەدەرێ دەتوت لەناو ئەو دەریا سوورەی ناودەمی هەزاران گەوهەر و مرواری تیا هۆنراوەتەوە..

بارام حەزی دەکرد بڵێ: با لەو "پیاوە" بپرسین.. ئەگەر وای بووتایە تیرەکەی کوناو دەربوو، بەڵام وشەی برا لە هەناویدا تەقیەوەو پرشەکانی ماناو مەبەستێکی تریان بەخشی،بەڵام بەمەبەستەوە وتەکەی درکان، گەرەکی بوو عەزیز چەواشە بکات..

ئەگەر ئەو نموونەی جوانی ئافرەتان بوو، بەرجەستەبوونی سۆز و ئەڤین بوو،ئەوا عەزیز نموونەی هێز و شان و باڵ قایمی بوو، بە رۆشتنەکەیدا لە کۆنە بەگزادەکانی ناوچەی هەورامان دەچوو، کە هەڵوەستەیەکی کردو راوەستا، لموزی ئەوەندە بڵند کردبوو خەریك بوو لووتی لە بەیتوونەی تەلارە بەرزەکەی لای ماست فرۆشەکان گیر ببێ..

بە فیزێکەوە وتی:

– ئەرێ برا تەلاری ئاوارەکان کامەیە؟..

– هەموو تەلارەکان ئاوارەیان تیایە.. کام تەلار؟.

– ئەوەی لای ماست فرۆشەکان..

– ئەوەی (لەیلا قاسم) نەڵێی؟..

– بەڵێ ئەوەمان مەبەستە..

بارام ئاماژەی بە تەلارەکەداو ویستی پێشیان بکەوێ..

کابرا بەری لێ گرت و وتی:

– ئا.. زانیمان .. لازم بە تۆ ناکات..

ئاورێکی خۆ بەزل زانینی بۆ ئافرەتەکە دایەوەو بەبێ ئەوەی سوپاسی بکات وەك بەراز ملی بەرەو تەلارەکە نا..

ئافرەتەش روانینێکی پڕ بە مانای بەسەرتاپای بارامدا پەخش کردەوە بە ئاستەم بەدوایدا دەڕۆیشت و زەوییەکەی بەر پێی منەتبار دەکرد.. کابراش زۆر بەبێ زەوقانە ملی بەرەو تەلارەکە نا ..

بارام لە شوێن خۆی راما و ئەو هاتن و پرسیار و وەڵامدانەوە تووشبوونێکی تر بوو خستییە ناو شەتاوەی خەیاڵێکی شێتانەوەو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

– لەناو پاسەکەدا لەشمی کەمەند بەندکرد، لێرەشدا هۆشی لێ سەندم!.. تێ نەگەیشتم ئەوە ئافرەت بوو یان سیحرێکی رووت. یان ئەو نموونەیە بوو کە یەزان، رۆژانە هەموو وێنەی مێیەکان لەبەریا دەگرێتەوەو بەشێك لەویان دەداتێ!..

– لەژیانمدا ئافرەتی زۆرم دەیوون، بەلای هەزار جواندا گوزەرم کردووە.. بەڵام هەرگیز وەك دیمەنی ئەوە کاریان تێ نەکردووم، دەڵێی ئافرەتانی گێتی هەموو جوانی خۆیان کۆکردووەتەوەو بەویان بەخشیووە. هەی کابرای قەپۆز قایم تۆو ئەوەیان نەوتووە، چۆن وا بەبێ بایخانە لە پێشیەوە دەرۆیشتی!. قورم ساغ دەبوو بەرپێی بە پێڵوی چاوت راخەیت و تا بەناز بەسەریدا بڕوات.. چۆن دڵت هات لەناو ئەو پاسەی بسەپێنی.. ئەوە هی ئەوەیە لە ماڵەوە دایبنێی، نەکەیت و نەخۆیت تەماشای بکەی..

بە تەڕ پۆشی ئافرەتەکە و چۆغەو رانکی کۆتدراو و سەرو مشکی پیاوەکەدا لە نەوەی کۆنە خانەدانەکانی ناوچەی ئەردەڵان دەچوو.. وەك بۆ سەردانی هەندێ لە خزمە ئاوارەکانیان هاتبن، یان هەر خۆیان ئاوارە بن و تووشی دەردە کورد کرابن، بارام نەیدەزانی نەفرەت یان رەحمەت ئاراستەی بەرمیلەکەی بکات کە ببوو بەهۆی ئەو هەموو دیماو دیم کردنەی و یان هەڵگێڕو وەرگێڕەی دەرنافیسەکە بوو کە خەریك بوو دوا هەناسەی دەربێنێ یان نێو نیگای ئەو پەیکەری جوانییە بوو کە رۆژگاری ناهەمواری کوردەواری نەیتوانی بوو نیشانەیەکی ئەو چەند ساڵەی خۆی لەسەر دانێ، لەوانەش بوو داخ و کزەی چەندان کەس و خزمی ئەنفالکراو و بەکیمیاوی بارانی لەسەر پەردەی دڵی هەبن، بەڵام خۆیان لەسەر دیمەنە جوانەکەی دەرەوەی رەنگرێژ نەکردبێ..

بارام پتر لەوە سەری سووڕ دەما و دەیوت:

لەبەر چی ئەو ئافرەتە دەم و چاوی وەك سەرجەم ئافرەتەکانی تری ئەم کوردستانە نەژاکاو بوو، نەخارا بوو! جنجرۆکی راونان و تاڵانکردن و ئەنفال بردن کاری تێ نەکردبوو..! ئەو کابرا لموز بەرزە ترنە چی بوو لە پێشییەوە دەرۆیشت و خۆی بە قەیسەری رۆم نەدەگۆڕییەوە.. نا حەقی ناگرم لەسایەی ئەو جوانییەدا بوو بۆیە وا کەپوو بەرز بوو، بۆیە کورد وتوویەتی:(ئەوەی دەزگیرانی جوان بێ لەناو هەرزەکاندا شایە). جا ئەگەر ژنی وەهابێ دەبێ خۆی بە ئیمپراتۆر بزانێ.. دیار بوو ژنیەتی بۆیە پێی وت:(عەزیز لەو برایە بپرسە)..



ئەی ئافرەتە جوانەکە داخۆ مێوانی کێ بی و لەگەڵ ئەو کابرا مل قەویەدا لە کوێ شەو دەبەنە سەر؟.. گوایا مانای ژیانم نەدەزانی بۆیە هاتی لە قوڵایی بوونمدا جێگیر بووی و هەموو دەروونمت رووناك کردەوە، دەتویست فێری نهێنی ژیانم بکەی یان هەر بۆ ئاوەدانی دڵ هاتیتە ناو بوونمەوە، داخۆ چەند بێ دەسەڵاتی وەك منت گیرۆدە کردووە! وا ئێستا بە تەواوی حاڵی بووم بۆچی لەناو پاسەکەدا لە ئاستەم دەنگت نەکرد، دەنا هەموو نەفەرەکان لای تۆیان دەگرت، جوانیت هەموویانی بۆ لای تۆ کەمەند کێش دەکرد، قۆڕ بەسەر ئەوەی ئەو دوو چاوەی لێ نیگەران دەبن کە شەڕیان لەگەڵ ئەختەردا دەکرد..

داخۆ لە نەجابەتی خۆیەوە بوو دەنگی لەگەڵدا نەکردم، یان لە ترسی ئەو زەلامە بوو کە لەتەکیدا بوو، یان لەبەر نەهروژاندنی حەشاماتی ناو پاسەکە بوو؟ هەر کامیان بێ منەتبارم.. خۆزگا من یەکێك لە دانیشتوانی ناو پاسەکە دەبووم، تا بەو میوانەم بوتایە:

فەرموو لەسەر تەختی دڵم دانیشە.. ئەو کاتەش لەحزووریا نوێژم بۆ ئەو جوانییە دەکردو وەك موغانیك دەستە نەزەری دەبووم..

بارام لێرەدا خۆی گرتەوەو پەردەی بەسەر ئەو وڕێنە و خەیاڵاتەدا دادایەوەو بەلای بەرمیل و عارەبانەکەیدا رووی وەرچەرخان و هاتەوە سەرخۆی..

کوڕە عارەبانچییەکە سەرقاڵی کاری خۆی بوو ئەوەندە خۆی لە بوگاری خەڵك نەدەدا، زوو پەی بەشت دەبرد، بەڵام بەلای یەکێکی وەك ئەوەوە گرنگ ئەوەبوو بە جوانی کارەکەی ئەنجام بداو کرێکەی خۆی وەربگرێ.. کە بارام لێی نزیك بووەوە هێشتا بیرکردنەوە لەو ئافرەتە بەتەواوی بەری نەدابوو، کوڕە عاربانچییەکە هەڵەیەکی زمانی لەدەستی دەرچوو وتی:

ئەوانە ناسیاوت بوون؟..

بارام چاوەڕوانی پرسیاری وای نەدەکرد، وەك لە ناکاو هەڵخلیسکێ و خۆی بگرێتەوە وابوو بۆیە وتی:

بەڵێ..! بەڵێ ناسیاوم بوون..

عارەبانچییەکە بە لەپ و لەوسی وەڵامەکەدا لە خۆی و لە بارام حاڵی بوو، بۆیە سەری پرسیارەکەی بۆ لایی خۆی گێڕایەوەو بێ دەنگ بوو.

بارام هەندێ بە پرسیارەکەی کوڕە عارەبانچییەکە دڵ تەنگ بوو، چونکە نەیدەویست کەس سەرقاپی نهێنییەکانی هەڵ بداتەوە، بەبێ ئەوەی دەقی خۆی بشکێنێ، بە زمانی هەردوو لێوی خۆی تەڕ کردەوەو ئەوەی تەڕایی لە دەمیا هەبوو هەمووی قووت دایەوە وەك بیبەوێ ئەوەی

دی و کاری تێکرد لە قەڵارۆژنەی سەربانەوە بۆ خوارەوەی ڕەوانە کردو سەرقاپی نایەوەو بەرەو کارگێڕی بەنزیخانەکە چاوێکی گێڕاو وتی:

- تۆزێ خواپێن بکە تا بزانم نەوتەکە چۆن وەردەگێری.. خۆ دەبوو بەو کوڕە عارەبانچییە بڵێ:(ئەرێ لە کوێ وەردەگیرێ).

کەچی نەیووت، لە دڵ خۆیدا وای لێك دابووەوە، چونکە خۆی بە فەرمانبەرێکی دڵسۆز دەزانی و چەندان ساڵە کاری ئەوانەی سەودایان لەو فەرمانگەی ئەوا ئەنجام دراوە، بەرێکوپێکی گفت و لفتێکی جوان بەرێ کراون، پێی وابوو هەموو کەس وەك ئەو وایە، هەموو کەسیش دەیناسن و لەمە چاویان پێی کەوت فەرمووی لێ دەکەن.. لە هەمان کاتیشدا دەیزانی هەموو شتێ سەرو بن کراوە هیچ شتێك لە جێی خۆیدا نەماوە، بەڵام لەو بڕوایەدا نەبوو ئەو بەو هەموو قیافەتەوە زووکاری بۆ جێبەجێ نەکرێ..

کە چاوێکی بە سەرانسەری بەنزیخانەکەدا گێڕا دی یەکدوو عارەبانەی شەق و شڕو تایە پەنجەر ڕاوەستابوون، ترۆمپای بەنزین تێکردنەکان وەك قەبری جولەکەکانی ناو موسڵمانان هەڵ تەکێنرا بوون، چی وردە ئامێر و جەڕو وایەری ناوەوەیان هەبوو لە یەك ترازابوون وەك ڕیخۆڵەی کەری تۆپیوکە قەل و داڵ و ڕێوی برسی گەمەیان پێ کردبێ وەها بوون لەیەك ئاڵا بوون، ئەوەی بەکەڵکی فرۆشتن هاتبێ دزرا بوو، ئەو زنجیرانەی کە بەینی دینگەکانی پێ دەگیران و هاتووچووی ناو بەنزینخانەی پێ ڕێك دەخرا، یەکدوو ئاڵقەیان نەبێ بە دینگە قورسەکانەوە مابوون، ئەوانی تر دەستی ڕفاندن و تاڵانی وەك پچڕاندنی کۆت و زنجیرەکانی ناو بەندیخانەکانی ڕژێم پسابوون.

جاران لەو شوێنانەدا چەند کەسانێك لەسەر ترۆمپاکان ڕادەوەستان.. سەرەی بەنزین وەرگرتن، ئەو سەری دیار نەبوو، هەر لەو بەنزینخانەیەدا کە ئێستا دەڵێی: کولانەی مریشکانەو ئەنفالچییەکان وێرانیان کردووە.. سالانێك لەمەو بەر شوێنی سوکایەتی کردن بوو بەو خەڵکەی کە ئەمڕۆ خەریکە بەسەر خۆیاندا نەی هێنن و لەبیری کەن.. کە سەرەی بەنزین بەر لە کازێوەی بەیانیانەوە دەبەسترا، هەنگاو بە هەنگاو سەرە دەجووڵا، جاری وا هەبوو یەك سات لە شوێن خۆی دەوەستا و چەقی دەبەست.. شوفێرەکان لە تەنیشت ئۆتۆمبێلەکانیان ڕادەوەستان و لەناوەوە دەکوڵان هەناسەیان نەدەدا..



لانکروزەرو جێبی قیادەو پیاوە دێزەکانی (ئەمن)ی داگیرکەر دەهاتن و نۆبە بڕییان دەکردو بە قەپۆزی بەرزەوە دەیانڕوانییە ئەو خەڵکەی دەوریان و قونیان بادەدا.. قوڕ بەسەر ئەوەی لەو کاتەدا دەمی دانە خستایە..

حەیف ئەم بەنزینخانەیە جاران وابوو ئێستاش وای لێ هاتووە، دەبووایە پاش ڕۆیشتنی ئەو ڕەگەز پەرستانە بکرایە بە یاگەی یەکسانی و ڕێزلێنان، نەك وەك کابرای ناو پاسەکە دەیوت:(دەبێ شوێنی ئەوانە لەبنەوە هەڵ تەکێ و شوێنەواریان بزر بێ) وای لێ بێ

هێشتا بارام هەنگاوی نزیك بوونەوەی بەرەو کارگێڕی بەنزینخانەکە نەنابوو لە پڕ شتێك لە بەلە کۆنەی کوشکەکەوە، کە لە بنیا ڕاوەستابوون و جاران شوێنی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بوو، ڕژایە سەر عارەبانەکەو، پرشەکانی سەر و سنگی هەردووکیانی پیس کرد..

- ئەمە چی بوو..؟

بارام وای وت و عارەبانچییەکە پاڵێکی بە عارەبانەکەوە ناو دوورکەوتەوە و ڕوانینێکی پڕ بەبێزی ئاراستەی ئەو تارمەیە کرد کە شتەکەی لێکەوتە خوارەوە، بەتەوسەوە وتی:

- خێر بەسەر کورداندا دەبارێ!..

بارام لەو میز بارانە ئاگادار نەبوو.. شان و باڵی خۆی لەو تەڕاییە کە پێیدا پژا دەتەکان و دووبارە وتییەوە.

- ئەوە چی بوو!؟..

- مامە ئەو کۆشکە پڕە لە ئاوارە، هەر دە پانزە ماڵ یەك دەسشۆر و ئاودەسییان هەیە.. هەر یەك لە هۆدەی خۆیدا بەلە کۆنەکەی کون کردووەو بۆرییەکی وەك سیلاوکەی تێ خستووە و کردوویە بە ئاودەست، ئیتر لەوێوە هەموو جۆرە چلکاو پیسابییەك فڕێ دەدەنە خوارەوە.. وای وت و بارام بێزی لە خۆی بووەوەو سەیرێکی پڕ بە بێز و قێزی بە باڵای باڵەخانەکەدا خشان و وتی:

- ئەمە بوو ئەنجامی براکوژی!.. بزانە کێ دەستی بە خوێنی برای خۆی سوورەو کێ میز و گوێی بەسەردا دەبارێ.. بارام وەری گرە خێر بێ و بەسەرتا ببارێ..

بارام وا بەو میز بارانە گەلێ سەخڵەت بوو، کە لەو شوێنە دوور کەوتەوەو هەمدیسان چاوێکی تری بە باڵاخانەکەدا خشانەوەو دی قسەی عارەبانچییەکە ڕاستەو هەر بەلە کۆنەکەیەك بۆڕییەکی تێ خراوەو هەموویان ئاو و پیساییان لێ دەچکا، بە شڕەو پڕەو جل و نوێنی ئەو منداڵانەدا کە بەو ڕستانەدا هەڵواسرا بوون بە بەپەتوو و لێفە شڕەکاندا کە درابوونە

بەر هەتاو دیار بوو ئەو ئاوارانە لە ئەسڵدا خەڵکی لادێ و هەمووشیان لە بارێکی نالەباردا دەژیان..

بارام دەیزانی ئەوانە لەو شوێنانەدا نیشتەجێ کراون، بەڵام ئەوەی نەدەزانی باری ژیانیان وای لێ کردبوون کە ئەو جۆرە ژیانە قبول بکەن، زۆربەیان ژێرخان و سەرخانی ئابوورییان رژێمی کۆنەپەرست خراپێ کردبوو، ئەوانیش هیچ دەرێکی تریان نەمابوو، "شەڕ لە بەتاڵی چاکترە" یان بۆ رەخسابوو..

سەیرێکی بەر دەرگای کۆشکەکەی کرد، چڵکاو و ئاوی پیس شوێنی یاری کردن و گەمەی منداڵە ئاوارەکانی گرتبوو، ئەوەی بەوێدا تێدەپەڕی رووی وەردەچەرخان و کەپووی خۆی دەگرت..

بارام خەمی لەو منداڵە چاو گەشانە دەخواردو پێی وابوو ئەو منداڵانە لەو شوێن و رایەدا پێبگەن و دەروونیان دژ بە نەتەوەکەیان دەغزدار دەبێ. سەیر لەوابوو پیاوە ئاوارەکان گەلێ نازیان بەسەر خەڵکی شارەکدا دەکردو پێیان وابوو ئەو خەڵکە بەر لەوە ئەوان بێن هیچیان بۆ کورد نەکردووە! بەلای هەر یەکێکیاندا تێدەپەڕی بوونی ئەو فیکرەی لێوە دەهات، دوا لاپەڕەی مێژووی پڕ سەروەری و شانازی و مرۆڤایەتی کوردییان بە نووکی کلاشینکۆف و نارنجۆکی ماڵکاولکەری و تاڵان هەڵ دەدایەوە. بەنزیخانەکەش رەنگی کۆشکەکەی دەدایەوە، دەتووت هێلانەی قەتێیەو رێوییەکی برسی وێرانی کردووە.. جولەیەکی واش هەست پێ نەدەکرا نیشانەی ئەوە بێ کە نەوت دەدرێ..

بارام بەرەو دەرگای کارگێڕی بەنزیخانەکە رووی نا.. هەرزەکارێکی چەك بەدەست لەسەر کەرەوێتێکی گێڕو شڕو تەپیو لە پشت کۆنە مێزێکی پەرپووتدا گرمۆڵەی کردبوو،بەشڕو شێواوی و بێرییەکەی سەری و کورتەکەکەیدا لە پۆلیسی تۆز و با دەچوو، هەردوو دەسی لەسەر مێزە شڕەکەی بەردەمیا کردبوونە سەرینی سەری و بەهەردوو دەستی کلاشینکۆفە ژەنگاوییەکەی گرتبوو، سەری ماندووی بەسەر هەردوو لەپی دەستیا رماند بوو..

بەئاستەم دەرگای کردەوەو رۆژباشی لێکرد..

کابرا دیار بوو لە زووەوە بۆرژا بوو ئێستا لە خەودایە، بۆیە هیچ وەڵامێکی نەبوو..

بارام دەنگی هەڵبڕی..

– کاکی پۆلیس لەگەڵ تۆمە..



پۆلیسەکە دەتووت تێلاکاری کراوە، بە خاوی و کۆشێ باوشکەوە سەری بەرزکردەوە، چاوە پڕ لە خەوەکانی هەل کلۆفی، وەك بیەوێ لێفی خەوتن لەسەرچاوە خەوتێ زاوەکانی بداتەوە دەسێکی بەدەم و چاویدا هێنا و روانییە بارام، ئەویش نەی هێشت پرسیاری لێ بکات و وتی:

– بۆ نەوت هاتووم..

– نەوتی چی؟!..

– ئەو نیو بەرمیلەی کە وەزارەت بە فەرمانبەرانی داوە، منیش یەکێکم لەوان..

– پۆلیسەکە باویشکێکی وای دا. لەگەڵ کردنەوەی دەمیا بۆڕەیەکی وای لێوە هات دەتووت نۆبەنەیەو لە گرۆپەکەی خۆی دابڕاوە.. خەوەکەی ناو لەشی بەباداو وتی:

– ئەی زوو بۆ نەهاتی..

– ئاوام بۆ رێکەوت..

– راوەستە تا لیپرسراوی نەوت دابەشکردن دێتەوە.. وای و تو بە باوێشکێکی تر کاوێژی خەوە سەرکوتکراوەکەی لەشی کردەوە.. کلاشینکۆفەکەی لە ژێر هەردوو مەچەکیدا نایەوەو سەری بەسەریاندا رمانەوە..

بارام بەقسەی پۆلیسەکەدا بۆی دەرکەوت کە هەموو فەرمانبەرەکان بەیانی زوو هاتوون، بەشە نەوتی خۆیان وەرگرتووە تەنها یەکێکی وەك ئەو ماوە بۆیە بە خۆی وت:

– کە ئەو لێپرسراوە هات منیش وەری دەگرم.. بەڵام ئایا کەی دێ؟!..

هەندێ راماو لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی عارەبانەو بەرمیل و عارەبانچییەکەی کردو پرسیارێکی ئاستەمی بەم چەشنەی خوارەوە ئاراستەی پۆلیسەکە کرد:

– تۆ بلێی بەم زووانە نەیێ؟!..

دیار بوو پۆلیسەکە بە تەواوی نەخزابووە ناو خەوەکەوە، بۆیە لە ژێر لێوەوە بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕی وتی:

– لەوانەیە بێ و لەوانەیە نەیێ..

بارام لەبەر خۆیەوە دەیووت: توخوا ئەمە وەرامە:(لەوانەیە بێ و لەوانەیە نەیێ!). باشە تاکەی لە نێوان ئەو دوو (لەوانە)دا چاوەڕوان بم!.. تێزێکی تێ گرت و لە دڵ خۆیا وتی:

– ئا ئەمەش پێی دەڵێن پۆلیس و ئیشکچی، بەناحەق نەیان وتووە:(لەبێ شوانیە بزن کاوێژ دەکات) هەی سندانت لێ بدا پۆلیس، خۆ دەڵێی بزنە مژدەیەو خۆی تۆپاندووە. لەمەدا بوو پیاوێکی باریکەلە هاتە ژوورەوەو پۆلیسەکەی هەڵسان و لە جێگەکەی دانیشت، بەبێ ئەوەی

گوێ بە بارام بدات یان بۆی بڕوانێت، چەکمەجەی مێزەکەی ڕاکێشاو دەستێکی بە ناویدا گێڕاو، قاقەزە ژاکاو و پڕاوەکانی ناوی هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن، دیار بوو سەرقاڵی شتێ بوو بۆیە بەشپرزەیی بە ناو شڕەو پڕەکاندا دەستی دەگێڕا..

بارام ئاماژەیەکی ئاستەمی لە شێوەی نیشانەی پرسیاردا بە پۆلیسەکەدا، ئەویش بەسەر لە قاندن و چاوچوکاندن وەرامی پرسیارە نهێنییەکەی دایەوەو وای گەیاندکە (خۆیەتی)..

چەند هەنگاوێك لە کابرا چووە پێشەوە:

- کاکە بۆ پرسیار ناکەی بۆ لێرە ڕاوەستاوی!..
- وا پرسیاردەکەم:
- کاکە بۆ بەشە نەوتەکەم هاتووم..

بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ..

- لە کام وەزارەتی؟..
- لەوەزارەتی مرۆڤایەتی..

کابرا لیستێکی خستە بەردەم پۆلیسەکە و پێی وت:

- بزانە ناوی تیایە..

بارام هاتەدەم:

- دەبێ ناومی تیا بێ، منیش فەرمانبەری وەزارەتم.

پۆلیسەکە:

- ناوت چییە؟.
- ناوم بارامی کوڕی باوڵ ئاغایە.

کابرای پۆلیس چاوێکی خێرایی سەرەتا خواری بە لیستەکەدا خشان و سەرێکی لەقان، لە لاپەڕەی یەکەمەوە بۆ دووەم چەند جارێ چاوی پیا گێڕایەوە.. چاوی وەك ماڵەی بەفر بەسەر ناوەکاندا دەخشان و لەسەر یەکێکیان گیر نەدەبوو تا دوا پەڕەی خوێندەوەو سەرێکی باداو وتی:

- تیا نییە!!..
- چۆن تیا نییە.. بارام بەسەر سامییەوە وای وت:

لێپرسراوەکە لیستەکەی لێ وەرگرت و ئەویش هەموو لاپەڕەکانی لیستەکەی لەسەرەوە تا خوار تەماشا کردو وتی:

- ئەو ناوەی تیا نییە..



بارام بە بێ دەربەستبوون وتی:

- زەحمەت نەبێ تەماشای هەموو لیستەکان بۆ ناکەیت!..
- تۆ لە وەزارەتی مرۆڤایەتی نیت؟!. پرسیارەکەی ڕکاوی بوو، بۆیە بارام هاتە دەم:
- تووڕە مەبە، من لەو بارەوە گەلێ شتی وام بەسەردا هاتووە، لەبەر ئەوەی ناوەکەی من کوردییە هەندێ بنووسی فەرمانگەکان وەك خۆی نابنووسن، یان دەسکاری تیا دەکەن، خۆ ئەگەر بنووسەکە لە کۆنەپەرستە لغاو لەدەمەکانی هەزار و ئەوەندە ساڵەی لەمەو بەربێ، بەو جۆرە ناوانە پەست دەبێ و دڵی دەگوشرێ، گەلێ جار لە جیاتی خۆم ناوەکەم ئەزیەت دراوە..

کابرا چاوێکی سەیری پیاخشان و ویستی شتێ بڵێ، بەڵام زانی بارام وەك خەڵکانی تر نییە و خاوەن گوتارێکی تایبەتە بۆیە نەی وت و هەر ئەوەندەی لێ زانی:

- دیارە تۆ شتێکی عەنتیکەی؟!..
- عەنتیکە نیم!.. من خۆم دەزانم چی دەڵێم..

کابرا هەندێ ڕاما..

- ئێمەیش دەزانین چی دەڵێی.. لیستەکەی خستە بەردەمی
- ها خۆت سەیری بکە..

بارام لیستەکەی وەرگرت، لەسەرەوە بۆ خوارەوە، لە خوارەوە بۆ سەرەوە بە پەرۆشەوە چاوی بە هەموو لاپەڕەکانیدا خشان، تەماشای ناوی باوك و باپیرانی ناوەکانیشی کرد، دوای ئەوەی دڵنیابوو کە ناوی تیا نییە، بەخێرایی چاوێکی تری پیا خشاندەوە، ناوی فەرمانبەرەکانی تری بەرچاوکەوت هەر یەك بەشە نەوتی وەرگرتبوو، نیشانەی وەرگرتن بەرامبەر بە ناوەکانیان دانرا بوو، کە دڵنیا بوو ناوی ئەوەی تیا نییە بە ساردییەوە خستییەوە بەردەمی کابرای لێپرسراو وتی:

- لیستی تر نییە؟!.
- ئەوە هەموویەتی..
- ئەی چارە؟..
- چارە ئەوەیە: بڕۆ ناوی خۆت بێنەو بەشە نەوتی خۆت بەرە.
- کەسی تر وای کردووە؟..
- بەڵێ..

وای وتوو هەندێ پێیدا روانی، لەناو روانینەکەدا شتێکی حەشار دابوو، بەڵام لەبەر گوێ گرتنی پۆلیسەکە نەی وت بۆیە سەری لەگەڵ وتنی (بەڵێ)کەدا لەقان.. زانی بارام پێی سەیر بوو کە لیستەکە ناوی ئەوی تیا نەبوو بۆیە دووبارەی کردووەو وتی:

- ئەوە تاکە چارەیە، پسووڵەیەکمان بۆ بێنەو نەوتی خۆت وەربگرە..

- ئەمرۆ تاکەی لێرە دەبن..

- تاکو ئێوارە.. سبەیش هەر لێرەین..

سبەی هەینییەو نەورۆزە..

کابرا هەندێ سەری دانەواندو ئەنشکی لەسەر مێزەکە چەقاند و سەری خستە ناو لەپی دەستی و هەندێ تەوێڵی خۆی پرواندو رووی کردەوە بارام.

- دەڵێم سبەیش لێرەین..

- عارەبانەم بەکرێ گرتووە لەو پەڕی شارەوە هێناومە، چۆن دەبێ بیبەمەوەو بیهێنمەوە!..

- جا بۆ دەیبەیتەوە وەك ئەو بەرمیللانەی پشتەوە لەوێ داینێ و برۆ پسووڵەی خۆت بێنەو بیبەوە.. کابرا بە ئاسایی تەگبیرەکەی بۆ بارام کرد..

بارام چەند بەرمیلێکی سەر بەتاڵی لە پشتەوەی کارگێڕییەکەدا دیبوون، بۆیە تەگبیرەکە زوو لەدڵیدا جێی خۆی گرت، وای بۆ چوو کە خاوەنی ئەو بەرمیلانە ناویان وەك ئەو لە لیستەکەدا نەهاتووە. بۆیە لەوێ دایان ناون.. وای بۆ چوو تازووە بڕوا بەڵکو ناوەکەی لەگەڵ ناوی ئەوانەدا کە وەریان نەگرتووە بکرێ بە لیستێك و هەموویان بەیەکەوە بن، بەوەشدا ئەوەی ئەو لیستەی کردووە دەزانێ کێیە..

بارام کە لە کارگێڕییەکە هاتە دەرەوە، کوڕە عارەبانچییەکە زانی دەست بەتاڵە بۆیە خۆ ئامادەبوونێکی نەنواند و پاڵی بە عارەبانەکەیەوە نەنا.. تۆ بڵێی پێشەکی مەسەلەکەی زانیبێ؟ یان هەر هاتنە دەرەوەکەی بارام ئەوەی دەگەیاند؟ یان دەسکورتی وای لەو گەنجە کردبوو وابێ؟..

- کوڕی باش چی بکەین؟..

- چی دەڵێی وا دەکەین..

- بابەرمیلەکە ببەین لە قوژبنێکدا لەبەر چاو پۆلیس و کارگێڕی بەنزینخانەکەدا داینێین..

- ئەی نەوتەکە؟..

- لە دواوە تێت دەگەیەنم!..



بە ئاستەم پاڵی بە عارەبانەکەوە ناو لەناو حەوشەکەی ئەو دیودا بەرامبەر بە پەنجەرەکەی کارگێڕ بەرمیلەکەی لەناو بەرمیلەکانی تردا دانا..

بارام هەندێ نەوازشی بۆ کوڕە عارەبانچییەکە هێنایەوە، دە دینار لەو بیست دینارەی کە لەناو کیفەکەیدا گرمۆڵەی کردبوون دایەو پێی وت:

- ئەگەر خوایین دەکەی، هەرئێستا زوو دەچمەوە وەزارەت، ناوەکەی من لەبیر کراوە- دەی هێنم و دەگەڕێمەوە.. ئەو کاتە پێکەوە بەرەو ماڵ دەگەڕێینەوە.. ئەگەر حەزیش دەکەی برۆ سەعاتێکی تر وەرەوە من لێرەم..

- جا حەز دەکەی تۆ بەرمیلەکە پڕ بکەو خۆت لەسەر من ماتڵ مەکە، هەرکات هاتمەوە یەکسەر دەی هێنمەوە..

- زۆر باشە..

- ئەگەر هەندێ دوا کەوتم..

- خەمت نەبێ، من لەم ناوانەدا هاتووچوو دەکەم، کەی دیم نەوتی تێ کراوە، هەڵی دەگرم و دەی هێنمەوە..

کە دە دینارەکەی وەرگرت، پاڵی بە عارەبانەکەیەوە ناو بەبێ دەنگی لە بەنزینخانەکە چووە دەرەوە، بە بەردەم گۆرستانەکەدا عارەبانەکەی دایە بەرو، بەرەو بازاڕی کەران تێی تەقان..

بارامیش گەڕایەوە لای پۆلیسەکەو پێی وت:

- کاکی برا! (ئاماژەی بۆ بەرمیلەکەی دا) ئەوە بەرمیلەکەی منە، چاوت لێی بێ هەر ئێستا دێمەوە.. ئەویش بەبێ ئەوەی بۆی بڕوانی لە ژێر لێوەوە وتی:

- چاومان لێیە!..

بارام ئەوەندە سەری نەخستە سەری نەبادا بە قسەکانی نیگەران بێ و لەدواییدا بە پیاوێکی ناو بازاڕی بزانێ و درەنگ نەوتەکەی بداتێ..

بارام بەر لەوەی بڕوا سەرنجێکی پڕ مانای ئاراستەی بەرمیلەکەی کرد وەك پێی بڵێ:(لە شوێنێکی ئەمینداری).. دڵی خۆیشی دەدایەوە و دەیوت (جاران خەڵك شتیان لەناو مەزاری پیاو چاکاندا دادەناو دەچوونە کوێستانان، یان دەچوونە گەرمیان دوای چەند مانگێك کە دەگەڕانەوە شتەکانیان وەك خۆیان دەماو چاوەڕوانی خاوەنەکانیان دەکرد)..

تۆ بڵێی ئەم پۆلیسخانەیە بەقەد مەزارێك غیرەتی نەبێ!..

(ئەی بەرمیلەکەم لەوێ ئارام بگرە و سەیری ئەو پۆلیسەو چەکەکەی سەر شانی بکە!.. ئەها ئەوەتانێ سێ چوار بەرمیلی تر لەوێن، داخۆ خاوەنەکانیان لەکەیەوە لەوێ بەجێیان هێشتوون، سەیرکە چەند بەدڵنیاییەوە لەوێدا پاڵیان داوەتەوە، ئەوەتانێ ئەوان قەپاغیشیان لەسەر نییە و باکیشیان لە هیچ نییە.. تۆ قەپاغت لەسەرەو کەس زەفەرت بێ نابات.. خەمت نەبێ هەر ئێستا دێمەوەو بە (پڕی) سواری عارەبانەکەت دەکەم و پێکەوە دەگەڕێینەوە..) ئەمەی لە دڵەوە وت و چاوێکی تێکڕایی بە هەموو بەنزینخانەکەدا گێڕاو بەرەو مەیدانی پاسەکان ملی نا، بەگوڕ ڕێگەی دەبڕی، چەندان جار لەگەڵ عارەبانەو خەڵکی بە پەلەو شەکەتی وەکو خۆیدا تامپۆنی دەکرد.. لە پڕ دەستی بەناو گیرفانی پانتۆڵەکەیدا گێڕا ئەو سێ دینارە ئاسنەی کە هەیبوو، هەرسێکیان هاتنە ناو دەستی: چۆن!. ئەی بۆ پارەی پاسەکەم نەداوە؟!. وای بە خۆی وت هەڵوەسەیەکی کرد.. بە نەدانی کرێی پاسەکە پەست بوو.. زووش پاساوی بۆ خۆی هێنایەوە.. جا چۆنی بدەم، من بە هەزار حاڵ نووکی پێم لە چەمەلغی پاسەکە گیرکردبوو.. ئەو ئافرەتەش خوا بۆ خاوەنی خۆی تەمەن درێژی بکات هۆشمی بێ هۆش کردبوو، خەریك بوو لە گێژەنەم بترازێنێ، نەمزانیبوو بۆ کوێی بردبووم، داخۆ چەند جار کابرای سەکن داوای پارەی لێ کردبم نەم بیستبێ، یان بیستوومە و فامم نەبووە.. ئەو دینارەی بە میوانێکی ڕەزاگرانی ناو گیرفانی دەزانی، پێی وابوو پارچە ڕەژوێکی گەشاوە لە گیرفانی دایەو پارەکانی تری دەسووتێنێ.. لەبەرکی خۆی گەڕا بۆ ئەوەی پەنجا دینارەکەی کە لە مارف ئەفەنی قەرد کردبو لەگەڵ دە دینارەکەی تر سەفتەی بکات و بە یەکەوە لەلایەکی بەرکیدا قایمی بکات..دەستی بە بەرکیدا گێڕا، جگە لەو پارچە قاقەزانەی کە ژمارەو ڕێکەوتی هەندێ مامەڵەی خەڵکی تیا بوو شتێکی تر بە دەستییەوە نەهات، خورپەیەك بە دڵیدا هات و هەنگاوەکانی خاو کردەوە..

- نەء.. لە گیرفانەکەی سەرسمتمایە.. لەوێیە! هەموو هەستی خڕکردەوەو خستییە سەر ئەوێی، هەستی بەبوونی هیچ شتێك لە ناویدا نەکرد، نەی وێرا زوو دەستی بۆ بکوتێ و پیایدا بگەڕێ.. خەریك بوو فیکری خۆی جەم کاتەوەو ئاراستەی ناو گیرفانەکەی سەر سمتی بکات پیکابێك، هۆڕێنی تووڕە بوونی بۆ لێدا، وا دیار بوو گەلێکی بۆ لێدا بوو، ئەو هۆشی لای شتێکی تر بوو، خۆی کەناردا، لەبن دیواری گۆرستانەکەدا لەسەر کۆمە زبڵێکدا هەر چوار پەنجە درێژەکەی دەستی ڕاستی کوتایە ناو قوڵایی گیرفانەکەی سەرسمتی، پەنجەی بەر هیچ نەکەوت. زوو دەستی گەیاندە گیرفان و بەرکەکانی تری، چی قاقەزو کۆنە کلینیکس و شڕەو



پڕەی هەبوون هەمووی دەرهێنان و پشکنینی، جگە لە سێنزە دینارەکە بەو لاوە چی تریان تیا نەبوو، پەنجەی بەناو کون و کەلەبەری کیفەکەیدا گێڕا، دەستەسڕەکەی داتەکان..

- نەخێر یان لێم کەوتووە، یان لێم دزراوە.. بەڵام لە کوێ نازانم؟.. وای وت و لە شوێن خۆیدا لەسەر ئەو کۆمەڵە زبڵە وەك نیشانەیەکی سەرسوڕمانی لێ هات!.. دەیوت:

- ئەوە من و ئەوە سێنزە دینارەکە.. یەکێکیان هی پاسەکەیە.. لەعنەتی خوای لێ بێ ئەمەش دە دیناری بیست دینارەکەی شیلان، دەشم داوە بە کرێی عارەبانەکە، ئەمە بیست، ئەی کوا ئەو پەنجا دینارەی کە لە مارف ئەفەنیم قەرزکرد.. کێ لێی دزیم؟.. نازانم.. جا من لەناو ئەو پاسەدا ئاگام لە خۆم مابوو!..

لەو ساتەوە کەچوو بووە ناو پاسەکە، تا ئەو کاتەی ژن و پیاوەکەی بۆ شوێنی ئاوارەکان ڕایی کرد، هەمووی وەك ڕستە نووسینێك شی بکەیتەوە وەها هەنگاو بە هەنگاو دەیدایەوە بەر خەیاڵی خۆی و نەیدەزانی لە کوێدا لێی کەوتووە یان لێی دزراوە..

بارام وەکو خەڵکانی تر بیری لە ڕووداوەکان نەدەکردەوەو نەیدەبەستنەوە بەو شتانەوە کە لە پەنادا بە پەنجەی سیحراوی دروست بۆ کراویان گەمە بە ڕووداوەکان بکەن، پێی وابوو ئەو جۆرە بۆ چوونانە لەکارخستنی ڕووداوەکان و سڕکردنی ویستی مرۆڤەو لادانیەتی لە پرسیار و ئازادی..

لە کارەکانی خۆی و ڕووداوەکان، خۆی و دەوروبەری بە لێپرسراو دەزانی.. لە دڵ خۆیدا دەیوت:

خەتای خۆمە.. ئەگەر پەرۆش نەبوومایەو خەمی نەبوونی و بەرمیلەکە لە دڵمدا نەبوایە.. خۆم بەو پاسەدا شۆڕ نەکردبایەتەوە، پارەم بۆ لێ دەدزرا..

نازانم زیرەکی مرۆڤە کە ئەم دوو شتەیان دروست کردووە (قەزاو قەدەر) یان لە نەزانییانە هەر کامییان هەبێ، فێڵێکەو دروستکراوە بۆ ئەوەی خەڵك لە پەنایدا خۆی بدزێتەوەو دەستە چەورەکانی بەوا بسڕێ.. یان بیدەمە بەرتانەو تەشەری کردەوە ناشیرینەکانمان، ئەم کارەی ئێستا خۆم بۆ خۆم سازم دا، دەبێ خۆشم هەوڵ بدەم لە ژێریا دەربێنم.. ساتێك لەمەوبەر هەموو گەردوون لە ناو سنگمدا چەپکە تیشکێکی ئاوێزانەو ڕووناك بوو بە خێرایی خۆی دەڕۆیشت و بەوپەڕی سنگم نەدەگەیشت.. وا ئێستا گوشراوە.. بووە بە تونێلێکی ڕەش دەیەوێ هەموو ڕووناکییەکان هەلمژێ..

وای دەوت و بۆچوونەکانی دەربارەی ئەو جۆرە رووداوانە وا دەهێنایەوە، تەنگەژەکانی دەکردن بە بەڵگەی بوونی و کاریگەری چالاکییەکانی.. خۆی بە تاکە سواری مەیدانی رووداوەکانی خۆی دەزانی، خۆی هەم مەیدانی شتەکان بوو، خۆیشی هەم سوارچاکی ئەوێ بوو..

بارام چەندان شتی وەهای بەسەردا هاتبوو، رۆژگار هەموویانی لە پشت بیر چوونەوەدا حەشار دابوون.. خۆ ئەوەی ئێستا پێیەوە خەریکە شتێکی وانەبوو، بەڵام لەو رۆژگارە تەنگ و تارەدا ببوون بە شت، بەرمیلێك ئەو هەموو بگرەو بەردەیە بەدوای خۆیدا راکێشێ شتێکەو بافتی ئەوە نییە مرۆڤ وازی لێ بێنێ، وازهێنان خۆدزینەوەیە لەدەست پرسیار، مرۆڤ خۆی نیشانەی پرسیارە.. خۆشی دەتوانێ قوفڵی ئەو پرسیارە بدات یان بیکاتەوە.. خۆی هەم قوفڵە، هەم کلیل، بۆیە زوو بڕیاری دا تا مەسەلەی نیو بەرمیلە نەوتەکە یەکلا نەکاتەوە، ئەوەندە گوێی نەداتێ، تازە ئەوەی بووە بووە.. وای دانا ئەگەر زوو وەری بگرێ هەر لەوێ بیفرۆشێتەوەو پارەکەی مارف ئەفەنی لێ بداتەوە و درۆیەکی سپی، شەرعیش بۆ خێزانەکەی دروست بکات و بڵێ:

– نەوتەکە مغشوش بوو، پڕی بوو لە گازوایل و نەوتی رەش و بەنزین و شتی تر..

پەریخانی ژنی بارام لەو ئافرەتانە نەبوو زوو بڕوای بە هەموو قسەیەك بێ، بەڵام چونکە چەند رۆژێك بەر لە ئەمڕۆ خۆی گێڕایەوە ماڵی (مەلا رەشید) پەرەمێزیان کە پێ کردووە تەقیوەو ئاگر بەربووە ماڵەکەی و منداڵەکانی هەموو بریندار بوون، هۆی تەقینەوەکەش ئەوە بووە نەوتەکە لەگەڵ بەنزیندا تێکەڵاو بووە..) بڕوا دەکا..

پیاوی لێ قەوماو و کەم دەسەڵات دەرگای خەیاڵی سەدان ئەگەری بۆ دەکرێتەوە تا یەکێکیان دڵ ساو بدات سەدانیان دەرگای گومان لە مەیدانی هۆشدا دەکەنەوە..

بارام دڵی خۆی دەدایەوە..

– دەی دەی.. خۆ تاڵان لە کاروانتی نەداوە.. داخۆ لە پاسەکەدا لێت دزراوە یان لەکاتی شەڕکردنی شوفێڕەکاندا، یان کە پارەکەت بۆ عارەبانچییەکە دەرهێناوە لێت کەوتووە.. بەخوا نابێ بە تەمای ئەوەش بی یەکێك بیدۆزێتەوەو بیباتە مزگەوت، ئان بیباتە رادیۆ و تەلەفزیونەکان، بانگەواز بۆ خاوەنەکەی بکات..

کوڕە بڕۆ خەمی خۆت بخۆ، خۆت بدەرە دەست چاکەی خۆت و ئەوانەی کە هەڵسو کەوتییان لەگەڵدا دەکەی، هۆشت سەرپشك بێ و دڵت فراوان بێ، ئەو بەندو باوەی تۆی تیا پەروەردە بووی، درا بەدەم بای گۆڕاندن و وەرچەرخاندا، خۆت بۆ بەزمێکی تر ئامادە بکە، گوێی



مەدەدرێ لە کوێ پسا بیکە بە سەرەتای شتی نوێ.. هەڕۆ بزانە کام پاس بەرەو وەزارەتتان دەڕوات، تا زووە فریای کەوەو بڕۆ..

زەردەخەنەیەکی بە تێز نیشانی ئاراستەی ئەو حاڵەی خۆی کرد:

– ئای لەو رێکەوتە یەك دیناری بە ناحەق بۆ هێناومەتەوەو پەنجا دیناری لێ بەرداومەتەوە!..

پاسەکان کەڵەکەیان کردبوو، هەر کۆمەڵێك بۆ گەرەکێك دەچوون، هەموو رۆژ جێی خۆیان دەگۆڕی، ئەوەی دەڕۆیشت دەبوو پرسیار لە پاسی گەڕەکەکە بکات، هەر یەك ناوی گەرەکی خۆی بە عەرەبی لەسەری نووسرابو، دەلاڵەکانیش هەر بە ناوە کۆنەکانی جارانەوە هاواریان بۆ رۆیشتنیان دەکرد، وەك بڵێی کەسێك نەبێ چاو لەوانە سوور بکاتەوە، هاوار بەو ناوە بەد فەڕانەی جاران نەکەن، بارام دەیزانی حوکمڕانی کوردی بەر لە هەموو شتێ ناوی گەڕەکەکانی بە کوردی نابوو.. لە داخی ئەو گەجەر و گوجەرەی ناو پاسەکاندا کە بەناوەکانی جارانیانەوە هاواریان دەکرد خەریك بو لە پێستی خۆی بێتە دەرەوە:

– تف لەوانەی کە عیزەتی قەومییان نییە..

– تف لەوانەی کە بایەخ بە وشە نادەن..

چووە ناو ئەو پاسەوە کە بە بەردەم وەزارەتدا تێدەپەڕی.. ئەو پاسانە لەوکاتەدا کە لە گەڕەکەکانەوە خەڵکیان دەهێنانە ناو سەنتەری شار درەنگ دەگەڕانەوە ئەو کەسانەی لەو کاتەدا کە دەگەڕانەوە ئەو کەیبانوو پیرەژنانە بوون کە بۆ کڕینی کەرەسەی خواردەمەنی زوو دەگەڕانەوە، ئەوانیش گەلێ کەم بوون، چونکە عارەبانەکانی ناو کۆلانان هەموو کەرەسەیەکیان بە ناو کۆلانەکاندا دەگێڕا.. پێویستی بەوە نەکرد خەڵك بۆ کڕینی ئەو جۆرە شتانە بڕواتە ناو بازاڕ، بازاڕ دەچووە بەردەرگا..

پاسەکە یەکدوو کەسی تیابوون، دەلاڵەکە بە توندی هاواری دەکرد: هەر ئێستا دەڕوا..

بارام دەیزانی تا پڕ نەبێ نا جووڵێ.. بەپێ دەڕوا درەنگ دەگاتێ و ماندوو دەبێ.. تەکسی دەگرێ دە دیناری دەوێ، وای بە باش زانی بە پاسەکە بڕوا.. لەپێشەوە دانیشت بۆ ئەوەی کە گەیشتنە نزیك وەزارەت زوو بێتە دەرەوەو بە پەلە بگەڕێتەوە ـ لە دڵەوە دەیوت:

– پسوولەیەك چییە زوو دەیبەم و دەگەڕێمەوە..

پڕ بوونی پاسەکە بۆ یەکێکی وەك بارام لەو هەڵوێستەدا پشوویەکی درێژی دەویست، خەڵکی ناو مەیدانەکە وەك مێروولە دە هاتن و دەچوون، جێی هەموو شتێ بوو دەتوت شار

روخاوەو ئەوەی ماوە لەوێ رووکراوە.. رووداوەکانی بارام لەدڵەوە دەبرژان و پەلەیان لێ دەکرد، کابرای شوفێریش لەو ناوە پاڵی دابووەو قۆشمەی لەگەڵ چەند کەسانێکی تردا دەکرد..

لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە ئەوانەی بەرەو پاسەکە دەهاتن داخۆ سوار دەبن یان نا.. تاك و تروك ئاوڕیان لە پاسەکە دەدایەوەو دەرۆیشتن، بارام هەر لە زووەوە خۆی وا راهێنابوو ئەگەر رێگەیەکی دووری لەبەر بوایە، یان لە کاتی تاسەو چاوەڕوانیدا سواری ئەندێشەی رەنگینی خۆی دەبو، ئارەزووە ماندووەکانی خۆی تیا دەحەواندەوە، چی تۆز و گەردی ناو دەروونی هەبوون رای دەماڵین، جیهانێکی خەیاڵاوی نموونەیی بۆ خۆی ساز دەدا و لە ئازار و خەمەکانی ژیان خۆی دوور دەخستەوە..

پاسەکە —وێران بێ- دەتوت دەربەند باسەڕەیە، ئەو هەموو خەڵکەی قووت دەداو پڕ نەدەبوو، گەوری وڵاغان بوو یەکێ ناچار نەبوایە سواری نەدەبوو..

بارام لەمە دانیشت خۆی نقومی ناو دەریای خەیاڵاتی خۆی کرد، بەڵام نەمانی پەنجا دینارەکە جاروبار بە هۆشیا رادەبوردو لێی تێك دەداو خەمەکانی بە ئاگا دەهێنایەوە:

- دەی دەی خۆ دنیا چەرمی چۆلەکە نییە، دەسمایەم زۆرە ئەگەر نەوتەکەشم نەفرۆشت، لە وەزارەت لای ژمێریار پەنجا دیناری پێشەکی لەسەر مووچەکەم قەرز دەکەم، لە ماڵیشەوە دەنگ ناکەم.. هەی ماڵی مارف ئەفەنی بڕمێ ئەوەندە بە نەبەدڵییەوە پێی دام، نەمزانی چۆن چۆنی لە گیرفانم نا.. کوڕە تۆ تەماشای خۆت مەکە، تەماشای دەم و چاوی ئەو خەڵکە بکە، برسییەتی و نەهامەتی و کلۆڵی لە چرچی لامل و تەوێڵ و دەمارەکانی دەسیاندا مردن تەکی بە ژیان هەڵ چنیوە.. سەیری ئەو پیاوە ریش سپییە بکە، یەك کیلۆی ئاری کڕیووە، داخۆ چەند منداڵی هەبێ، یەك کیلۆ ئارد چییە پیاوێکی وەها بیکڕێ.. سەیری چاوی ئەو خەڵکە بۆ ناکەی دەڵێی چاویان لەناو گۆمی خەم و پەژارەدا نقوم بووە، چرچی ناو تەوێڵیان رێی رێبوارێکی ماندووی حەپەساوی رۆژگارە رەشەکانی کوردەوارییە، سەر و زلفی پژاوی ئافرەتان و کوڵمی هەڵپروزکاویان رازی کۆسکەوتن و هاوار و فیغانی دایکانی رۆڵە ئەنفالکراوەکان بەڕاشکاوی دەگێڕێتەوە، تۆ چیت لێ هاتووە، چیت دیوە، ئەو خەڵکە ماوەی نیو سەدەیە، راو دەنرێن، دەر دەکرێن،دوو ساڵ جارێ خۆیان دادەمەزرێننەوە لەوێش بار دەکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ماون و هەر داکۆکی لە بوونی خۆیان دەکەن.. لەوانەیە ئەم رۆژە تارو نا هەمووارە دوو رێیانی ئەو وەرچەرخانە بێ کە لەو سەرەوە دەمان گەینێتەوە ئاوات.. بارام لەناو ئەو وردە خەیاڵانەدا وەك تەختەی سەر ئاوی لێ هاتبوو. چەند ویستی خۆی بۆ لەنگەرگرتن بەکار



دەهێنا، بەڵام هەلومەرجی نالەبار لەوانە نەبوو واز لە ویستی مرۆڤێکی وەك بارام بێنێ و رای نەوەشێنێ.. وا خۆی لەناو لێشاوی ئەو بیرۆکانەدا خجڵ کردبوو.. وردە مەترسی ئەوەشی لە دڵدا هەبوو کە ناسیاوێکی بێتە تەنیشتەوەو تەرازووی بودجەکەی باخەڵی لێ تێك بدات، نەك هەر خۆی بێ لەوانەشە یەکدوانێکی لەگەڵدا بن، خۆ نازانێ ئەفەندی ئەوەی پێیەتی بۆ رایی بوونی کارێکی چاوەڕوان نەکراوی ئەو رۆژەی تەرخانکردووە بۆیە خۆی لە ناو لێزمەی ئەو خەیاڵاتەدا لە گێلی دەداو بە خوێندنەوەی دەفتەرەکەی ناو باخەڵی خۆی خەریك کردبوو، ئەوەی لە دەرەوەی پاسەکەدا بیدیایە چاوی زەقی وەك چاوی کەرویشکی نووستوو ئەبڵەق بوون وەك کۆتری بەندکراو بە پاسەکەی تەنیشیدا وڕ دەیڕوانی و هەستی بەو دوو کەسە نەدەکرد کە لە پەنادا لە تەنیشت دوو پاسەکەدا راوەستا بوون و سەودای شتێکیان دەکرد، هەر ئەوەندەی سەرنج راکێشان کە ئاڵۆ گۆڕو مامەڵەیان لەسەر شتێك دەکرد، وەستان و مامەڵە کردنەکەیان بەقەد نووکی دەرزییەکی شکاو لە هزری ئەودا نرخیان نەبوو کەچی لە ترسی روانینەکەی ئەودا لەوێ لاکەوتن و سەوداو مامەڵەکەیان گواستەوە لایەکی تر.. داخۆ چەند جار لە دڵەوە کە گاڵتەی بەو ژیانە کردبێ و پێی پێکەنیبێ و سەری بێ بایەخی و بێ نرخی بۆ راوەشاندبێ و دەستی شوکرانەی بە سمێڵی خۆیدا هێنابێ.. چی لەو دوو کەسە بووبێ ئەو ئەفەندییە شتێکەو چاودێریان دەکات، داخۆ ئەوانیش لە ئەژمارکردنی ئەو شتەو لە نەخشەو پلان دانانیا چەند جار هەڵەیان تیاکردبێ و هەڵیان وەشاندبێتەوە..

ئەمە هەمووی لە ئەستۆی ئەو بەرمیلەیە، ئەو نیو بەرمیلە نەوتەیە، ئەمە نیو بەرمیل نەوت ئەو پەندەی بەرپاکرد داخۆ ئەو هەموو نەوتەی کوردستان تا دزراوە، تا بە ناحەق براوە چەند فڕت و فێڵ و شەڕ و گوڵمەزی لە پێناویدا بۆ دروست کرابێ؟!.

تا نەوتمان دیار نەبوو مێملّمان کەمبوون.. وەرە نەوتی بن پێت وەك چەمەی زەڵم و ئاوی بێخاڵ بەناو بۆری زەبەلاحدا قەڵبەزە بکات و بۆ هەندەران بڕوات و هەموو گێتی گەرم بکاتەوە، کۆشك و تەلاری هەموو شارەکانی جیهان بەرزبکاتەوە تۆی خاوەن نەوتیش بۆ نیو بەرمیل نەوت وات بەسەر بێ!.

منداڵت لەسەرماندا بلەرزن بە پووش و پلاش خواردن و نان ئامادە بکەن، ئەمە پێی دەڵێن چی؟. ئەمەیە تراژیدی مرۆڤایەتی.. ئەمەیە گەورەترین ستەمی هەموو ستەمێك.. تۆ بڵێی ئەمە باجی ئەو بێ هۆشی و ئەو نەزانی خۆمان و باو باپیرانمان نەبێ؟. تۆ بڵێی ئەمە باجی ئەوە نەبێ ئێمە ئاگردانی خۆمان کوژاندەوە و خۆمان خزانە ناو گەلەخانی تەنگ و تاری خەڵکەوە!.

ئەگەر وانییە ئەی چییە؟!. رەنگە یەکێ بڵێ نیو بەرمیل نەوت ئەو هەموو بەدوا چوون و چنگە رووکەی بۆ چییە؟!.

تۆ خوا بەرمیلەکە پری لەمیز بکەی باشتر نییە؟!.

نا.. ئەگەر یەکێکی وەکو من واز لە نیو بەرمیل نەوت بێنی کە مافێکی رەوایە، دەبێ وازیش لە مۆلکییەتی نەوتی ژێر زەوی نیشتمانەکەی بێنێ، یان هیچ نەبێ خۆی فێری واز هێنان بێنێ و لە دەست مافی خۆی هەراکات! ئەمە تاقیکردنەوەیەکی بچووکە رێ بۆ تاقیکردنەوەیەکی گەورەتر خۆش دەکات، هەوڵدانێکە دەخرێتە سەر مێژووی خەباتی کۆمەڵایەتیی کەڵەکە بووی نەتەوایەتی، ماف با نرخێکی وای نەبێ دەبێ مرۆڤ تا دوا هەناسەی بەدواییدا بڕوات.. ئەی ئەو رووبارانە لە دڵۆپە بارانی ئەو سەر شاخانە دروست نابن! وازنەهێنان ئەستۆی وازهێنان دەشکێنێ، دارێك بەگازرای پشتی دوژمندا دەدات، ئەو دوژمنەی کە لەبەر پێیدا کزوڵەمان کردووە، ئەوەی کە هەمیشە ئارەزوو و حەزو تەماکانمان بەشتی پڕو پووچ سەرکوت دەکات..

دیار بوو بارام لەناو ئەو پاسەدا فەلسەفەی ژیانی خۆی و نەتەوەکەی پەڕە پەڕە هەڵدەدایەوەو بە پەلە بەسەریا گوزەری دەکرد، ئاگای لەناو پاس و کات و خەڵکەکەی ناوی نەمابوو.. تا منداڵێکی شڕۆڵە کە بنێشتی دەفرۆشت چمکی چاکەتەکەی راوەشان.

پاکەتە بنێشتەکەی لەبەر دەمیا راگرت:

– خاڵە بە دینارێکە.. تۆ خوا ئەگەر لێم نەکڕی.

سەیری کرد منداڵێکی پرچ زەردی قژنە قۆتەی چاوگەشە، یەکێك بوو لەو هەزارەها منداڵە کە دەچوونە ناو پاسەکانەوە، بنێشت و چۆکلێت و نوقڵیان دەفرۆشت و بژێوییەکی کوڵە مەرگییان بۆ خێزانەکانیان پەیدا دەکرد..

منداڵەکە یەخەی بارامی بەرنەدا، کەزانی بێ دەنگ دانیشتووەو لە دەریای خەیاڵاتی داوە، وای دەزانی: داخۆ یەکێکە لەو دەوڵەمەندانەی کە لەکاتی بیرکردنەوە لە سامانەکانیان چاویان زەق دەبێ و بە شوێن داهاتەکانیادا وێڵ دەبن. بارام لە دڵەوە بۆ هەزاران منداڵی وەها دەبرژاو، غەمبار دەبوو، منداڵەکەش کە زانی هەر تەماشای دەکا پتر لێی چووە پێشەوە.. لە دڵ خۆیدا وای لێك دەدایەوە، ئەو منداڵە کوڕی ئەوەو باوکی مردووە، یان بە ئەنفال براوە، یان بە ناحەق کوژراوە، گەورەی ماڵەو چەند زارۆکی وردەڵەو دایکێکی پەککەوتەی بۆ بەجێ ماون، بۆیە وابێ نازەو ئەو جۆرە کاسبییە دەکات، زەردەخەنەیەکی پڕ بە حەسرەتی بۆ بزواندو نەی دوان، ئەویش کە زانی وەك خەڵکی تر دەست بەروویەوە نانێ، ئەوەندەی تر شێلگیر بوو!



– دەی خاڵە گیان لێم بکڕە.. دەی مام حاجی!..

کە وتی مام حاجی.. بارام رووی لێ گرژ کرد..

– ها پێم نەڵێی مام حاجی.. من کاکەم.. حاجی نیم.. وای وت و چەند جار وشەی کاکەی بەروێکی گەشەوە بۆ دووپات کردەوە.

– باشە لێت دەکڕم، بە مەرجێ بەکەس نەڵێیت حاجی باشە؟.

– باشە.

وای وت و منداڵەکە گەشایەوە، وەك زەرنە قووتەیەك هێز بە بەرخۆیا بێنێ وای لێ هات..

بارام دینارێکی دایەو ئەویش بنێشتەکەی خستە ناو لەپی دەستی..

– ها بنێشتەکەش بۆ خۆت.. بەڵام نەکەی بەکەس بڵێی حاجی! بڵێ کاکە.. باشە؟.

جا کە گەورە بووی، ئاوەزووت کرایەوە دەزانی مەبەستم چییە..

منداڵەکە ویستی قسەیەك بکات، بەڵام کە بنێشتەکەی لێ وەرنەگرت بێ دەنگ بوو..

سەکنی پاسەکە بەسەر ئەو منداڵانەدا کە لە ناو پاسەکەدا شتیان دەفرۆشت نەڕاندی، پاڵی پێوەنان و کردنیە دەرەوە.. پاسەکە کەوتە لرخە لرخ و لێدانی سولفەکەی لە قوڕگ دەگیرا، بە هەر دەردی سەرییەك بوو کەوتە ئیش کردن و جوولا، بەنەڕ و هۆڕ لە مەیدانەکە دەرباز بوو، لەسەر خۆ شەقامە ماندووەکەی دەبڕی و وەك پیاوی پەککەوتە تەکانی دەدا و نەتری دەکرد, لە وێستگە و ناوێستگەدا رادەوەستاو زەلامی تێ دەپەسان تا وای لێ هات چەند دانیشتبوون ئەوەندەش بە پێوە بوون، بە دەم و چاویاندا دیار بوو هەموو خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شاربوون، ئەوانە بوون کە لە دەست بڕۆکردن و بێکاری و داگیرکردنی زەوییەکانیان خۆیان لەشار پەساندبوو، وەزارەتەکەی بارام لە خوارووی شاردا بوو، ئەو گەڕەکانەی ئەوێ هەموو لە وەدێهاتیانە بوون کە رژێم دەری کردبوون، بەرامبەر بە دەڤەرەکەیان هەر یەك خانووە قوڕینەیەکیان بۆ خۆیان بنیاد نابوو، بەکارێکی وەها شار ببوو بە گوندێکی گەورە بە گەڕەکی دەرکراوەکان و ناوچە بە عەرەب کراوەکان دەورە درابوو، خەڵکەکەش هەموو دەسەپاچە ببوون..

هێشتا پاسەکە بە تەواوی رانەوەستا بوو، بارام خۆی بۆ دابەزین ئامادەکرد، وای دانابوو لەمە دابەزی یەکەم جار بچێتە لای بەرپرسیاری بەشی خۆیەتی و زوو کارەکەی مەیسەر بکات..

***

**(5)**

بارام خوایینی نەکرد پاسەکە بگاتە وێستگەکەی بەرامبەر وەزارەت، لەتاو دواکەوتن و تەنگە نەفەسی ناو پاسەکە بە پەلە هاتە خوارەوە، کەبەرامبەر بە وەزارەت راوەستاو چەند کەسێکی لێ هاتنە خوارەوە، هەستی بەپشی تەنگییەك کردو رکی لەو رەوشە بووەو تفێکی لە دڵەوە ئاراستەی پاسەکە کردو وتی:

- خۆ بەپێ بهاتمایە هەر ئەوەندەم پێ دەچوو..

بە پەلە خۆی گەیاندە لێپرسراوی بەشی خۆیەتی..

فاتیح ئەفەنی کە بە —فەتەلە— ناسراو بوو لە زووەوە لێپرسراوی ئەو بەشە بوو، خۆی ببوو بەو بەشە، یان بەشەکە بەوەوە دەناسرا، کە دەوترا برۆ لای فەتەلە واتە برۆ بۆ بەشی خۆیەتی.. فەتەلە و بارام هەر چەند شتێکی وا لە نێوانیاندا رووی نەدابوو، بەڵام لە دڵەوە رکیان لە یەکتری دەبووەو چی لە بارام بوو حەزی لە گۆڕان دەکرد، نەك هەر گۆڕان بەڵکو حەزی دەکرد چی بەند و باوو دەستوورو رێ و رەویە هەن هەموو بکرێنە ناو توورەکە شڕەیەکی رزیووەوەو توور بدرێن و شتی نوێتر بێتە پێشەوە، ئەویش وەك فارغونێکی بەتاڵی شەمەندەفەر لەسەر دوو هێڵ نەبوایە نەدەدرۆیشت و رانەدەوەستا، ئەوەی فێری ببوو لای وابوو هەر ئەوە هەیەو لەوەش بترازێ دنیا کاول دەبێ، لەبەر ئەوە وا بەو بەشەوە نووسا بوو پێی وابوو بنی مەنجەڵە" کە لەوێ نەما بێ بن دەبێ و کەڵکی نامێنێ..

کە دی بارام بەرەو لای دێ ترسی لێ نیشت و ختوورەی ئەوە کەوتە دڵی، ئەو شتانەی کە پشتەملە بۆی تاشیبوو هەندێکی زانیبێ، بۆیە پەشۆکاو خۆی ئامادەکرد..

بارام بەبێ ئەوەی رۆژ باشی لێ بکا، وتی:

- کێ لیستی ناوەکانی نووسیبوو.؟

- فاتیح خۆی گەشانەوەو زانی ئەوەی ئەو بیری لێ دەکردەوە ئەوە نەبوو..

- کام لیست؟!



- لیستی نیو بەرمیلە نەوتەکە..

- لەبەر چی؟.

- بۆ ناوی منی تیا نەبوو؟!..

- بۆ لەمن دەپرسی لە بەڕێوەبەری گشتی بپرسە، ئەو ناوەکانی داوە بە وەزیر و ئەویش رەوانەی وەزارەتی پیشەسازی و وزەی کردوون.. بۆ خۆ دوورخستنەوە وتی:

- بۆ کاك بارام ناوی تۆی تیا نەبوو؟

- بەڵێ.. بۆ نازانی؟.

خۆی لە سەختی پرسیارەکە لاداو وتی:

- ناوەکان ئەوەندە زۆر بوون پیاو کە تەماشای لیستەکەی دەکرد چاوی تووشی رەشکە و پێشکە دەبوو..

- ئەوە بۆ تەنها لە ئاست ناوەکەی من چاو رەشکەو پێشکەی کرد!..

- جا هەر ناوی تۆی تیا نەبوو..

من چیم لە ناوی تر داوە!..

- لێپرسراو —فەتەلە— گەلێ لەو بوگارانەدا پەڕیبووەوەو پێی بە قوڕ نەبووە.. بەتف ناو گەرووی خۆی تەڕ کردەوەو سامی کەتنەکانی خۆی رەواندەوە، دەیزانی بارام لەو جۆرە کەسانە نییە بە ئاسانی وەك نوردە نان بپێچرێتەوەو بخورێ، لەوانەش نەبوو واز لە مافی خۆی بێنێ.. بۆ ئەوەی لە خۆی لایداو بەگژی یەکێکی تریا بکات وتی:

- من ناوی هەمووانم رەوانە کردووە، ئیتر لەو دیو پەردەوە چووزانم مەنجەڵ چی تیایە و چۆن دەکوڵێ.. کێ ناڵێ ناوەکەت لە کاتی نوسیندا بازی بەسەردا نەدراوە..

- نابێ پسوولەیەکمان بدەنێ، بیبەین، نەوتەکەی پێ وەربگرین، ئەوسا ئەو مەسەلەیە ساغ دەکەینەوە..

- بۆ نابێ.. بەڕێوەبەری گشتی دەتوانێ بتداتێ، نەوتی خۆتانەو خۆ خەیرتان پێ ناکەن..

بارام پەلەی بوو، نەیویست بەو سەر پێیە ئەو مەسەلە بهروژێنی، دوای خست بۆ پاش وەرگرتنی نەوتەکە، بۆیە وتی:

- من دەچمە لای بەڕێوەبەر، چونکە من پەلەمە.. ئەی ئەوانەی کە وەك من ناویان نەبوو، چییان کرد!؟.

وابزانم ئەوانیش دەبێ هەروا بکەن، یان بەلیستێك ناوەکانتان بۆ رەوانە دەکەن، یان شتێکی ترتان بۆ دەکەن..

بارام دەیزانی بن کڵاوەکەی فەتەلە چەند کرێژی تیایە.. دەستی لە چ شوێنێکەوە گیرە، بۆیە ئەو کلکە لەقێیە دەکات.. سەرێکی لەقان و لە دڵ خۆیدا..(وای لێ هات.. هەی بیژی، چاکت دەناسم، زۆر شتت لەبن سەرناوەو دەستی زۆرت تەڕ کردووەو بەقینگی خەڵکتاهێناوە، جگە لە خۆ جووت کردن و ماستاو سارکردنەوەو روو پامایی بەولاوە چیتر نازانێ.. ئای ئەمەو دەیان وەك ئەمە وەکو جرجی ناو کادانیان لێ هاتووە دەمیان بەهەر شتێ بگات پیسی دەکەن.. بزماری زۆرت لە تەرمی زۆر کەس داوە.. بە ردێنی زۆر پیاوی ریش سپی قەشمەریت کردووە.. وا دەزانی نازانم هەمانەکەت چۆن دڕاندووە.. تووکی سەرت بۆیە رووتاوەتەوە لەبنیا زبڵدان هەیە.. هەی خوێری هەموو کەست پێ تەفرە بدرێ دەرەقەتی من نایێ.. هەی ناپاك هەر تۆ نەبووی، ناوی کەسوکاری پێشمەرگەت دەنووسین و رەوانەی دائیرەی ئەمنت دەکردن.. بۆ سبەینێ هەموویان دەگرتن و بەژن و پیاو منداڵ و گەورەوە لە پۆلیسخانەکان دەست بەسەریان دەکردن، بۆ پتر سیخوریەکەی خەست کاتەوە دەچوو سەری لێ دەدان و هەواڵی پێشمەرگەکانی دەهێنایەوەو دەیکردە راپۆرت.. ئا بەو جۆرە خەڵکی چەواشە دەکرد.. ئەگەر مام دەزانم چیت لێ دەکەم.. ئێستاش خۆی داوەتە پەنای لایەك لەلایەنی براکوژی.. ئەی هەر تۆ نەبووی (عەبە بۆڕیچی) یت بەگرتن دا، چونکە، چوو بوو بۆری ئاوی ماڵە بارزانییەکی ئەنفالکراوی قوشتەپەی چاك کردبووەوە، هەتا ئێستاش (عەبە) سۆراخی نییە.. داخۆ چەندان شتی تری واتکردووە و خەڵکیش بە مەڕەلاتەت دەزانێ..)..

بارام چاك فەتەلەی دەناسی و دەیزانی چەند مۆری ناپاکی بە جەستەوەیە، بەڵام وا ئەمڕۆ هەمان کاری جاران دەکاو، دەبێ دەیان وەك بارام، بۆ تێپەڕاندنی کار لەبەردەمیدا راوەستن! تۆ بڵێی مێژووی وەرچەرخاندنی نەتەوەکانی تریش ئەو هەموو تەپوتۆزەیان لە دوای خۆیانەوە بەرپاکردبێ.. تۆ بڵێی سروشتی رزگاربوون ئەو هەموو خاپەرۆکەی لێ بوەشێتێەوە؟.

بارام وەك کورد وتەنی: گوێزی لە گیرفانی خۆیدا دەژمارد، بەو پێوەرەی کە هەموو شتی پێ کێش و سەنگ دەکرد دەیڕوانییە شتەکان، دەیویست، دەرگاکان بکرێنەوە راوەستان نەمێنێ، ئیتر باکی ئەوەی نەبوو چی دەبێ چی نابێ، گرنگ ئەوە بوو رووداوەکان زوو زوو بتەقنەوەو ئەو شتە کۆنانە کەببوون بە مۆتەکەی سەر سنگی نەتەوەی کورد بەرباد بن.. بۆیە



حەزی نەدەکرد و چاوی بەڕایی بەو جۆرە کەسانە نەدەهات کە وەك گۆمی چڵکان ببوون بە سەرچاوەی بۆگەنی..

فەتەلە رکی لە بارام و ئەوانەی وەك ئەو بوون دەبووەوە، حەزی لە گۆڕان نەدەکرد، پێی وابو ئەوەی هەیە لەوە باشتر نابێ، دنیا بەرەو خراپە دەڕوا، رزگاربوونی کوردی بە نیشانەی نغرۆ بوونی دنیا دەزانی..

ئەو و زۆربەی فەرمانبەرەکانی تر پاش کاتژمێری دوانزە کە بێ کار دەبوون دەستیان دەکرد بە قسەکردن، وایان پێ خۆش بوو باسی پاچە خواردن و ورگ پڕکردن و ئێوارە دانیشتنی پیاوە ناودارەکان بکەن، کام لێپرسراویان دیووەو چۆن سڵاویان لێ کردووە، چۆن بە گاڵتە و گەپەکانیان پێکەنین و چۆن نوکتە ساردەکانیان گەرم دەکردنەوە!.. ئیتر هەموو رۆژێ ئەو شتانەیان دەکردە ژاوە ژاوی کۆڕەکەیان و وەك لە گوێی گادا نووستبن وەها بوو..

باسی نەوت و ئاگر و خەبات و ماف و رووداوە تراژیدییەکانیان لاشتێکی پەژم و بێ بایەخ بوو.. خۆ ئەگەر ناوی چارەنووس و مافی مرۆڤ، و خەباتی گەلانت لابکرایە دەست بەجێ هەڵدەستا یان خۆی بە شتێکەوە خەریك دەکرد.. یان وەك خەرارێکی دڕاو بەسەر ئاگرێکی گەشدا بدەی ئاوا قسەیەکی نابەجێی بە تەموی بابەتەکەدا دەدا..

لە هەمووی پیس تر کە نوکتەیەك لەسەر کوردێك یان لادێیەك هەبوایە، کە دەیگێڕایەوە یان گوێی بۆ رادەگرت وەك رۆن قازی لێ بدەی وەها دەگەشایەوە!.

هەموو فەرمانبەرەکانی تریشی فێری ئەو جۆرە بڵحانەی کردبوون..

بارام دەیزانی فەتەلە کێمی برینەکانی ناو هەناوی بەو جۆرە نوکتانە دەسڕیەوە. بۆیە بارام چەندی پێ بکرایە بە نوکتەیەکی جەرگ بڕ ئەو و ئەوانەی وەك ئەوی دەکوتییەوە..

گەلێ جاریش لەکاتی نەبوونی ئیشدا حکایەتێکی رزیوی ئالۆش بزوێن و سێکسی بۆ دەگێڕانەوە، دەبەنگییەکەی لەوا بوو ماوەیەکی بەسەردا نەدەچوو.. هەمدیسانەوە دەیگێڕایەوەو هەمان چێژی لە گێڕانەوەکەی وەردەگرت، ئیتر ژیانی ئەم (فەتەلە) یە لەناو ئەو شتانەدا چەقی بوو.. لە تێگوشین بۆ کوردان و قسەی جلڤانەو حکایەتی رزیوی بۆندار بەولاوە خەریکی شتی تر نەدەبوو، لە هەمووی گەن و پەن تر ئەوە بوو، ئەو نووسراوانەی کە فێریان ببوو لە هۆشیدا قالبیان وەرگرتبوو، سی ساڵ بوو دەینووسین و دەینووسینەوە پێی وابوو، ئەگەر نووسینەکە وەها نەبێ کار و فەرمانەکان ئەنجام نادرێن.. کە وەختێ بەکارهێنانی زمانی کوردی بیست،

لای وابوو دنیا سەرەو نخون دەبێتەوە، وەك بۆقی ناو سییانی لێ هاتبوو، پێی وابوو ئەگەر وشك بكات، ئەو قڕ دەكات..

لەبەر ئەوە بارام ئەو جۆرە كەسانەی لەگەنەی ناو لنگی چێڵێك خراپتر دەزانی و بە پێویستی دەزانی ئەوانە بنبڕ بكرێن، ئەوانیش ئەوەیان دەزانی، بەڵام زوو خۆیان بە قەڵتاخی ئەسپە شێی ڕاپەڕین و شۆڕشدا شۆڕكردەوەو وەك مەیتەرێك چوونە پێشەوە..

بارام بە قسەكانی فەتەلەدا زانی داوێكی بۆ نراوەتەوە، چونكە چەند بەرەو موجامەلە رووی دەنا، ئەوەندە بارام دڵنیا دەبوو كە شتێك لەبن سەریایە.. كاتێ بەساردییەوە لە ژوورەكەی هاتە دەرەوە (فەتەلە) چاویلكە پان و وردبینەكانی لە چاو كردەوە، بە دەسرەكەی دەستی سڕینیەوەو زوو لە چاوی كردنەوە وەك بیەوێ خۆی دڵنیا بكات كە بارام چووەتە دەرەوە. چاوێكی بەهەر چوارقۆرنەی ژوورەكەدا گێراو گرێی بوینمباخەكەی لەگەڵ یەخە لەواشەكەیدا جووت كردوو پان و پۆڕ لەسەر كورسییەكەی خۆی تەختكردەوەو نقی نەكرد..

وەرە بارام لەداخدا مەتەقە، ئەو حەزی لە چارەی بەڕێوەبەر نەبوو، كەچی سروشتی كارو پێویستییەكانی وای دەخواست پەیوەندی یەكجارەكی لەگەڵدا نەبڕێ، جگە لەوە حەزی نەدەكرد لە كۆڕیدا دانیشێ، كە كۆبوونەوەیەكی گشتیش هەبوایە، دوور لەو دادەنیشت و ئەوەندەش بایەخی بە قسەكانی نەدەدا، وەك فەرمانبەرەكانی تر بە قسە بێ تام و پڕوپووچەكانی خۆی نەدەگەشاندەوە. نەخۆشی دەویست، نە بە بەڕێوەبەری خۆیشی دەزانی، بەڵام چاری ناچار بوو.. لەو رۆژەوە كە براكوژی دەستی پێكرد ئەو وەك پیسپیسۆكەكەی زەمانی ئیبراهیم لە فووكردن بە ئاگرەكەدا ساتێك ئارامی نەدەگرت، ئێستاش هەر خەریكی ئەوەیە، ئیتر چاوی بەرایی نەدەدا لەسەر ئەو مێزە گەورەیە بیبینێ..

ئەویش بارامی لە خانەیەكی تایبەتدا دانابوو، كوێر بوایە نەی دیبایە، لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵەوە حەزی دەكرد وەك فەرمانبەرەكانی تر خۆی لێی نزیك بكاتەوە, ئەو لەو ئاوەزوەدا نەبوو كە بارام پیاوێكی دوور بینەو لەبەر چ بایەكدا شەن دەكات، كوێی دێشی و چۆن كارەساتەكانی كۆن و نوێی كورد لەسەدان ساڵەوە تا ئەمڕۆ وەك پەنجەكانی دەستی هەمیشە لەبەر چاونی و رۆژێك، ساتێك نییە چەند جار ئەم دیوو ئەو دیویان پێ نەكات.. لەراستیدا بارام بە تەمای ئەوە بوو مشەخۆری وەك ئەو كابرایە ئەگەر لە سێدارە نەدرێن هیچ نەبێ روویان نەدرێتێ، كەچی وائێستا لە سایەی برا كوژیدا خەریكە پاداشتی خراپەكاریشیان دەدرێتەوە بەو كارەش هێڵی چەوت و راست لە نێوان چاكەخوازان و خراپە خوازاندا دەسڕێتەوە، ئیتر سبەی رۆژ خەڵك نازانێ چاكە بكا



یان خراپە.. خەریك بوو وەك جارانی داگیركەری لێ بێتەوە، ئەوەی كە دەڕۆیشتە پاڵ خەباتگێڕان، دوژمنان بە یاخی بوویان ناو دەبرد، ئەوەش كە دەگەڕایەوە لای دوژمنان و ئەنفالكاران پێیان دەوت:"هاتە ریزی نیشتمان" وەك دووربینی بەرواژی كراو، دووری نزیكە، نزیكی دوورە.. هەر ئەو بیر و بۆ چوونانە بوون بارامیان تووشی كێشەیەكی واكرد بوو وەك پەرمووچی بەر تاڤگەیەكی لێ هاتبوو، نەوەك خەڵك خۆی پێ رزگار دەكرا، نە تاڤگەش هێور دەبووەوە، پێشی سەیر بوو ئەو خەڵكە چۆنیان دەتوانی وا كارەساتەكان لە بیر خۆیان بەرنەوە!

دیارە ئەو خەڵكە شێتە، گەر وا نییە چۆن زەلامێك لەسەر زەوی و زاری باو باپیرانیان بە زۆرەملێ دەركراون گۆڕی پیاو چاكان و كەس و كاریان كراوە بە پەچەی ئاژەڵ و ولاغ چۆن! بە چ رووێك چەكی پاراستنی دوژمنانیان لە شان كردووە، یان زمانیان كردووە بە چەكێك پارێزگاری كردەوە نا مرۆڤانەكانیان پێ دەكات، دیارە یان ئەوانە شێتن، یان بارام هۆشی لە گێژەنەدا نەماوە.. كامیان وایە؟.

زۆر جار بارام ئەو پرسیارەی ئاراستەی ویژدانی خۆی دەكرد.. بە خۆی دەیوت: ئەوە ئەو كەسانە و ئەوەش سوكایەتی پێ كردنەكەیان كەوابێ بارام چ عەیبێكی نەبوو..

بەرەو ژوورەكەی بەڕێوەبەركە تەكانی دا، باش خۆی خڕ كردبووەوە، فیكری جەم بوو، جێی نووكە دەرزییەكی بۆشایی لە خۆیدا نەهێشتەوە... چووە لای سكرتێرەكەی.. هەر ئەمە بەرلەراپەڕین سكرتێرەی كابرای دێزە بوو، قسەی زۆری لەسەر بوو، بەڵام بارام باوەڕی بەوە نەبوو ئەو قسانە راست بن، بە چاوێكی یەكسانی تەماشای هەمووانی دەكرد، لە پشت ئەو نێونیگا جوانەیدا كەس نەیدەزانی چی هەیە، ئەوەش ئەگەر هەبێ كاری لەو دیمەنەی نەكردبوو كە دەتوت، دیمەنی منداڵی شیرەخۆرەیە، ئەوانەی كە چاوەڕوانی چوونە ژوورەوەی بەڕێوەبەریان دەكرد لەبەر تیشكی نێونیگای ئەودا دڵی خۆیان ئاوەدان دەكردەوە، بەخیلیان بەو بەڕێوەبەرە دەبرد و ئەو بەخیلییەش بە بەهات و چوونەكەی فرەتر دەگەشایەوە، ئەو جوانییەكەی لەو جۆرانە نەبوو، وەك ئاوێنەی بەر هەتاو رووی بەلای هەر كەسێكدا بكردایە دەی گەشاندەوە.. بەڵام ئەو جۆرە جوانییە تەنها تیشكێكی ساردو بریقەدار بوو وەك گڵۆپی نیۆن وەها بوو شەوقی دەدایەوە، بەڵام گەرمایی كەم بوو.. بەر لەوەی بارام شتێ بڵێ، ئەو رووی كردە بارام و وتی:

- بەڕێوەبەر"ئیجتماعی" هەیە..

بارام چەند لەدڵەوە ركی لە بەڕێوەبەر و "فەتەلە" دەبووەوە ئەوەندەش وشەی "ئیجتماع" ركی دەجووڵان، چونكە وشەكە یەكێك بوو لەو زاراوە رەكیكانە كە لەگەڵ هاتنی رەگەز پەرستاندا بەڵاو بوو بووەوە.

وشەكە تاریكییەك بوو رووناكی ئاخاوتنەكەی سكرتێرەی لێخن و تەماوی كرد، كە لەگەڵ مانای ئەو وشەدا دیمەنی كوشتن و سوكایەتی كردن بە كوردانی دەهاتەوە یاد. ئەو وشە و وشەی(شمال، حاجی،عصاە، متمردین) چەندان وشەی بلحی بەكارهاتوو بۆ خەباتگێڕان و دروستكارانی مێژووی نوێمان بەكاردەهاتن وەك تلی بەر دەرگای دێوی بیابان بوون بە نقەنق هێنرابوون بۆ ئەوەی دەربەندی هەڵۆكانی كۆسارانیان پێ بگیرێ.. بەڵام هەی هو،خەیالیان خاو بوو..

– كەی كۆبوونەوە تەواو دەبێ..

بارام پرسیارەكەی لە خۆی كرد.. نەیویست رووی پرسیارەكەی لە سكرتێرەی بكات و قسەی خۆی خەسار كات، چونكە ئەو وەك كارەكەرێك وابوو چی پێ وترابوو ئەوەی رادەگەیان.. ئەوەی دەهات ناوی دەنووسی، ناوی بارامی لەسەر هەموو ناوەكانەوە دانا..

سەوداكارانی وەزارەت وەك رۆژەكانی تر زۆر بوون، زۆربەیان كارەكانیان سەر بەو بەڕێوبەرایەتییە بوون كە بارام تیایدا فەرمانبەر بوو، سەوداكارەكان بەپەلە دەهاتن كە دەگەیشتنە لای سكرتێرە هەموو خاو دەبوونەوە، لەسەر قەنەفە نەرمەكان دادەنیشتن، بارام وای بڕیار دابوو نەچێتەوە ژوورەكەی خۆی تا مەسەلەی نیو بەرمیل نەوتەكەی یەكلا نەكاتەوە، بۆیە ئەویش وەك ئەو هەموو سەوداكارانە لەوێ لە نزیك سكرتێرە دانیشت، چاوەڕوانی تەواو بوونی كۆبوونەوەكەی بەڕێوەبەری دەكرد، زۆری كێشا، چاوەڕوانی و بێ دەنگی ئازارێكی گرانە، ئەوەی تۆزێ باری سووك كردن، وتەكەی سكرتێرە بوو كە وتی:

– هەر لە "ئیجتماع" تەواوبوو هەمووتان بە جارێ دەنێرمە ژوورەوە...

وتەكەی سكرتێرە دڵی هەمووانی هێور كردەوە... كە زانییان ئافرەتێكی روو خۆش و لەسەر خۆیە، هەر یەك دەیویست داخوازییەكەی خۆی بۆی راڤە بكات، گوێشی لە زۆربەیان گرت و ئەویش ئازارەكانیان بە زەردەخەنەیەك دادەمركاندەوە، بارام گوێی لە قسەكانیان دەگرت زۆربەیان گلەییان دەكرد و خۆیان بەستەمدیدە دەزانی و كەس بە هانایانەوە نایەت،پێیان وابوو كە فەرمانڕەوایی كەوتە دەست كوردان، بە زووترین كات برینەكان تیمار دەكرێن و گوێ بۆ سكاڵاكانی كۆن و نوێیان دەگیرێ...



بارام دەیزانی ئەو سكاڵا كردنەیان سووی ئەو برینانەیە كە دەیان ساڵە وەك داغ نە مەحف دەبنەوە نە لە ئێش دەكەون، هەر یەكێك لەوانە بگری بە قەد گوریسێكی چەند هەزار مەتری كوێرەوەری و لێ قەوماوی بە شوێن خۆیدا رادەكێشێ...

بۆیە لەبەر خۆیەوە ئەو رایەی بۆ خۆی ئەنجام دا:

– حەق نییە ئێمە-  لەم كاتە ناسكەدا-  بە شوێن كارەساتەكاندا بڕۆین، ناشبێ لە بیریان بەرینەوە، چاكتر وایە، لە ئەمڕۆوە دەست پێ بكەین و نەهێڵین شتەكان ئاڵۆز بن... ئاخر نیو بەرمیل نەوت چی بوو وا ئەو دەردەسەرییەی بۆ من دروست كرد.. عەیبم  لە خۆم دێ دەنا لە ئێستاوە وازم لێی دەهێنا.. ئەمانەش وەك دەردەسەرییەكەی منیان لێ هاتووە، بۆ دەبێ یەك مانگی رەبەق هاتوو چۆ بە زەلامێك بكرێ... ئەم وتەیە دوای ئەوە بۆی هات، یەكێك لەو كەسانە كە چاوەڕوانی دەكرد ئافرەتێكی لە تەمەن پەنجا ساڵیدا بوو، كە زانی پیاوەكان هەر یەك هەندێ لە زاخاوی خۆیان بۆ یەكتری هەڵڕشت، ئەویش رووی كردە سكرتێرە و وتی:

– هەتیو بارم... هاوسەرەكەم لە كاتی شەڕەكەی ئێران و عێراق دا لە بازاڕدا گیرا و رەوانەی ناو شەڕ كرا، ئەو رۆیشتنە رۆیشت نەگەڕایەوە، بێ سەر و شوێن! شوێن نەما بۆ سۆراخی نەگەڕێن، هیچمان بە دەستەوە نەما، تاقە كوڕێكم هەبوو لە قوتابخانە دەرم هێناو لای ناسیاوێكمان لەو رێكخراوانە دامەزرا و فێری(مین) هەڵگرتنەوەیان كرد، زۆری لێ پارامەوە واز لەو كارە بێنێ، پێم وت:

رۆڵە مین ئامانی نییە، تا كوڕەیان بە مردووی بۆ هێنامەوە، كۆسم كەوت، بە خۆم و سێ كیژۆڵەوە، بێ كەس و بێ دەر ماینەوە، دوو مانگ دەبێ دەمهێنن و دەمبەن.. ئەمە كەی رەوایە...

سكرتێرە وا دیار بوو رۆژانە چەندان سكاڵای وای بە گوێدا دەدرا بۆیە ئەوەندە كاری تێ نەكرد، هەر ئەوەندە بوو وتی:

– میمكە ئەو قسانە بۆ بەڕێوەبەر بكە، بەڵكو زوو كارەكەت بۆ ئەنجام بدا...

ژوورەكەی سكرتێرە هۆدەیەكی گەورەی لاكێشەیی بوو، تاقمە مۆبێلێكی جوان و چەندان كورسی تیا هەبوو، بە زستاندا گەرم و بە هاویندا بە ئێركۆندێشن فێنك دەكرایەوە، ئەوانەی كە لەوێ چاوەڕوانی چوونە ژوورەوەیان دەكرد، وەك لەسەر مەزاری پیرێك بن وەها سكاڵای خۆیان بۆ سكرتێرە یان بۆ یەكتری هەڵدەڕشت و لێشاوی ئازاری برینەكانیان لەوێدا تێكەڵاو بەیەكتر دەكرد.

مەسەلەی بەرمیل و نیو بەرمیل نەوتەکەی بارام تەشەنەی کرد بوو، دەنا خۆ دەیتوانی هەر لەوێدا وازی لێ بێنێ، ئەوەشی دەزانی کە لەوانە بوو تۆڕێك بێ بیانەوێ تێی کەوێ، ئەویش دەیویست بزانێ سەری تۆڕەکە بە دەست کێوە بەندە.. چەشەی تۆڕەکە نیو بەرمیل نەوتە... پێکەنینی بە خۆی دەهات و دەیوت:

– تف لەو نیو بەرمیل نەوتە... بڕوا ناکەم مەشایخەکانی کەنداوی عەرەب بە هەمووییانەوە ئەمەندەی ئەمڕۆی من بە نەوتەکانی خۆیانەوە ماندوو بووبن کەچی لە سایەیدا ڕۆژانە میلۆنەها دۆلاریان بە سەردا دەرژێت...

ئاوایە!.. دەرگا کردنەوە بۆ بیانی وەهایە دەبخۆ بارامی باوڵ ئاغا، ئەمە ئاکامی ئەو بارەیە کە کەوت و زوو راست نەکرایەوە، خەڵك ئاوا پاشقولە دەدات و هەوار دەگرێ... دەبڕۆ بارام گوندۆرە بە چۆك دەشکێنی بشکێنە، پلتۆك لە گوپی ئاوساوی پڕ هەوا دەدەی بدە! دەست لە خواری ئەژنۆنەتەوە دەگری بگرە...

خەڵك لە بارام کەم تێدەگەیشتن، دەیویست هەموو شتێ بەسەر یەکەوە بڕووخی، بەڵکو سەر لە نوێ خەڵك مێژوو دروست بکاتەوە، ئاواتی بوو بوومەلەرزەیەکی وەها رووی بدایە نەوت و ئاوی کانیاوەکان و رووبارەکانی نغرۆ بکردایە، ئەو وەختە ئێمەی دار بەڕوو بەبێ خەم بە بارانێکی کەم بنچمان دادەکوتایەوە باوشمان بە شاخەکاغاندا دەکردەوە و نەمان دەهێشت با و بۆران ئەوەندە بمانشواتەوە و بمان کات بە خۆراکی بیابان..

بارام! تۆ سەیرکە ئەو هەموو هەراو هۆریایە بۆ کۆتەڵی خەڵك!. ئەو هەموو زوڕنایە بۆ شایی دزانی نیشتمان لێ دەدەین! کەچی خۆمان هەر لە چەمەری گێرانی ماڵ کاولی داین... ئیتر نازانم ئێمە تاکەی واز لە نۆکەری ناهێنین، خۆ نۆکەری هەر ئەوە نییە بارت لێ بنێن و سواری کۆڵت بن، گیرۆدە بوونی وردە هزرەکانی داگیرکەر سەخترین جۆری نۆکەرییە..

بارام لە پڕ دوای دەرچوونی بیری خۆی بڕی و پرسیارێکی لەو بارامە کرد لەوێ دانیشتبوو..

– تۆ بڵێی هەر من لەو لیستە دا هەڵاوێر کرابم!؟..

ئەگەر وا نییە ئەی بۆ کەسی تر دیار نییە!...

دەشبێ هەبن وازیان هێنابێ...

جاران کە لەوێدا دادەنیشت لەگەڵ سکرتێرە دەکەوتە قسە و خۆی بە خاوەن ماڵ دەزانی، وا ئێستا وەك یەکێك لەوانەی لێ هاتووە کە چاوەڕوانی تەواوبوونی کۆبوونەوەی بەڕێوەبەرن،



دانیشتووە لاقی لەسەر لاقی داناوە و جاروباریش سەیری دانیشتووەکانی دەکردو، دەیوت ڕەنگە بڵێن داخۆ ئەو چاوەڕوانی چی دەکا..

لە دانیشتنەکەیدا وا خۆی لەسەر کورسییەکە چەسپاند بوو دەتوت میری سۆرانە و لە یەخسیر دایە و بە خۆی نازانێ یەخسیر کراوە.. لەو هەڵوێستەدا حەز و ئارەزووە نوستووەکانی گەلە خانی ژوورو و خوارووی چەندان ساڵەی ژیانی هورژمیان دەهێناو لە بەسەر دەرگا داخراوەکەیاندا بازیان دەدا.. خەریك بوو بڕیار بدا بەرێکوپێکی بچێتەوە ژوورەکەی خۆی و لەسەر مێزەکەی دانیشێ و وادانێ هیچ نەبووە، نەبەرمیلی بۆ نەوت بردووە، نە پارەی لێ دزراوە، نە دەشزانێ ناوی لە لیستەکەدا نییە، سفت و ئاسان بڵێ:

ئەودوو ساتە- کە ئیستا بۆ شەش سات دەچێ- مۆڵەتم بۆ کارێکی پێویست بوو!...

لەما بوو کاك نوری کە لە هەمان بەرێوەبەرایەتی دا فەرمانبەر بوو هاتە ژوورەوە و سەیری بارامی کرد و وتی:

– ها کاك بارام هێشتا نەوتەکەت وەرنەگرتووە؟!.

نەیهێشت وەرامی بداتەوە و وتی:

– راستە ناوت لە ناو لیستەکەدا نەبووە؟..

بارام حەزی نەکرد لەو شوێنەدا ئەو پرسیارانەی ئاراستە بکرێن.. سەیری نێو چاوانی سکرتێرەی کرد کە داخۆ لە کاتی ئەو پرسیارانەدا گوزارشت لە چی دەداتەوە.. کە زانی هیچ نیشانەیەکی نەدرکان... وتی:

– بەلێ... وا چاوەڕوانم بەڵکو پسووڵەیەك وەربگرم، برۆم وەری بگرم...

– ئۆە.. دیارە ئاگات لێ نییە!؟.

– ئاگام لە چی‌نییە؟!.

دوای ئەوەی دڵنیا بوو کەس گوێی لێ نییە بە ئاستەم پێی وت:

– تۆ وەرە پێت بڵێم...

نوری وای وت و چووە دەرەوە، لە رەوگەکەدا هەڵوەسەیەکی کرد تا بارام هات.. دی لە ناو دەم و چاوی بارامدا چەند نیشانەیەکی پرسیاری خەماوی بەر بریسکەی چاویان گرتووە...

– کاکە بەو دەم و دەستە پسووڵە ناکرێ.. خۆت دەزانی ئەو کابرایە دەهۆڵی کێ لێ دەدا...

بارام بە وتەی دەهۆڵی کێ لێ دەدا... تێگەیشت شتێك هەیە و لە پسووڵەی نیو بەرمیل نەوتەکە گەورەترە.. ڕەنگە ناوەکەی ئەوی تیا سەرنگوم کرا بێ.. نوری کە قسەی بۆ بارام دەکرد،

تەماشایەکی دەوروبەری خۆی دەکرد، بە پچڕ پچڕ سەرەداوی وتەکانی دەدان بە دەستەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی کە دەیزانی بە راشکاوی نەیتوانی بۆی ئاشکرا بکات.. هەر ئەوەندەی وت:

– وا بزانم ئەوانەی کە لە ناو لیستەکەدا ناویان نەبووە لیستێکی تایبەتیان هەیە... تێدەگەی!؟.

– یانی چی تێدەگەی!؟.

– مەبەستم شتێکی وا نییە..

– ئەی یانی چی لیستی تایبەتی؟!.

من هەر ئەوەندەی لێ دەزانم..

ویستی ئەوەی لە هۆشی بارامدا وروژاندی پەردەی بە سەردا بدا و بە پەلە وتی:

– ئەگەر لیستی نوێ بکرێ، دەبێ وەزیر رەزامەندی لەسەر بکات، ئەوجا رەوانەی وەزارەتی پیشەسازی و وزە بکرێ خوا دەزانێ کەی دەکرێ و کەی کۆتایی پێ دێ... خۆت نازانی "شێردا بۆ داپیردا" ی فەرمانگەکان؟...

هێشتا نوری ئەفەنی قسەکانی تەواو نەکردبوون هەستی کرد کە بەڕێوەبەری گشتی لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵیان کۆبوونەوەی هەبوو هاتنە دەرەوە، نوری ئەفەنی کە هەستی بە هاتنە دەرەوەی بەڕێوەبەر کرد پشتی لە بارام کرد و بە پەلە پڕۆزە خۆی گەیاندەوە ژوورەکەی خۆی لەسەر کورسییەکەی خۆی وەك قوتابی باخچەی ساوایان کە بزانێ مامۆستای دەرکەوت خۆی بە کورسی و مێزەکەیەوە دەنووسێنێ... وەهای کرد..

بارام وردە وردە بەرەوگەکەدا هەنگاوی دەنا و لە قسەکانی نوری ئەفەنی دەکۆڵییەوە و دەیوت:

– باشە کەی نوری ئەفەنی بە منی وتووە تێدەگەی!.. ئەی لیستی تایبەت یانی چی!... بۆ من لە شت ترساوم، خۆ تا ئەو دوو وتە شرەو پڕەیەی بۆ درکانم دەتوت بە پێی پەتی لەسەر کۆمە پشکۆیەك راوەستاوە.. رەنگە لەبەر خۆیەوە وا بزانێ خۆی لە بوگاری کارێکی گەورە داوە و شتێکی نهێنی بۆ من درکاندووە...

گریمان منیان لەم وەزارەتە دەرکردووە، یان بۆ شوێنێکی تر راگوازراوم، یان منیان بە شتێکی تر داوەتە قەڵەم... تۆ بۆ دەترسێی!. جا کە ئەوەندە نەیاری بۆ ئەو قسە هەڵەق و پەلەقانەمان بۆ دەکەی،یان دەیەوێ (لە ناڵێش بدا و لە بزماریش) لەو کاتەدا بارام وا خۆی و نوری لە ناو خەیاڵی تاریك و تنوکدا هەڵ دەسەنگاند.



بەڕێوەبەر لەگەڵ چەند زەلامێکدا بە پێکەنین هاتە دەرەوە، دیار بوو راوە رێوییەکی زۆریان لە ژوورەوە کرد بوو، بۆیە کلکەکەی هەر بە دەستیانەوە مابوو، تەواو کەوڵیان نەکرد بوو، باسی دەعوەت خواردن، کاوڕ سەربڕین و ئۆتێلەکانی شەقڵاوە و پیرمام پاشماوەی قسەکانیان بوون.

خەڵکە چاوەروان کارەکە بە هاتنی بەڕێوەبەر شڵەژان و هەندێکیان خۆیان بۆ سکاڵا کردن ئامادە کرد، بەڵام بە ناویاندا تێپەڕی هەر وەك لەوێ نەبن ئاوڕی لێ نەدانەوە... بە ناویاندا تێپەڕین و بە وتە بێ تامەکانی یەکتری دەقلانەوە، یەکێك لەوانە ئەو زۆڵکە بازرگانە بوو کە لە باوشی داگیر کەراندا فێری بازرگانی ببوو، هەر لە زووێکەوە دەستی خستبووە ناو دەستی ئەنفالچییەکانەوە و بەهۆی ئەو و چەندان کەسانی ترەوە، سامانی کوردستانیان بە فرت و فێل زەوت دەکرد و دەیان ماشیەوە و بە قورگی داگیرکەرانیاندا دەکرد و بەنزینخانە و کارگەی غاز و پەلەوەر و داهاتی کارگە نیمچە پەککەوتووەکان درا بووە دەستیان، لە ماوەیەکی کەمدا ببوون بە دەوڵەمەندێکی قەبەی وا کە سامانەکانیان لە ئەژمار نەدەهات، ئیستاش نووسینگەی بازرگانیان لە ئەستەمبول و ئیبراهیم خەلیل و بەغدا و تاران و قوبرسدا هەیە،

کوردستانیان کرد بوو بە بنکەی دووکوڵ کێشان و یاگەی چەندان گروپی قاچاخچیان، ئەوانە دەیانتوانی لە شێخەڵڵای هەولێردا و لە گەلێ شوێنەکانی تری کوردستاندا وەك کڵاوی سەخری جنیان لە سەرخۆ نابێ لە ماوەی چاو تروکاندنێکدا پاسپۆرت و گەواهی نامە و دەفتەری رەگەزنامە و جۆرەها بەڵگەنامەی بینەل میلەلی و گەواهی نامەی دوکتۆرای هەر زانکۆیەکت گەرەك بێ، بۆت دەربێنین و لە زانکۆکاندا دات مەزرێنن....

دیار بوو سێ نەفەرەکەی تریش هەر لە پێڕی بازرگانەکە و بەڕێوەبەر بوون، بارام وێنای دەکردن، بەڵام نەیدەناسین، بۆیە لەبەر خۆیەوە وتی:

– بەخوا باش بوو نەچوومە ژوورەوە... توخوا مردن نییە یەکێکی وەك من لەلای ئەوانەدا داوای دەرهێنانی پسووڵەی نیو بەرمیل نەوت بکات!؟. باش بوو لە بەردەم ئەو گەلە گورگەدا رانەوەستام! کوڕە خۆ بەشێك لە خەباتکردنی ئێمە بۆ ئەوە بوو، ئەو جۆرە کەسانە کە دەیانەوێ میللەتی ئێمە بکەن بە سۆزانی یەك شەوە سوورەکانی خۆیان پێی برازێننەوە، بۆ ئەوە بوو ئەوانە روو رەش بکرێن و بکرێن بە پەندی رۆژگار... کورە هەی هاوار لە زەمانی داگیرکەراندا هەستیان بە تۆزێ شەرمەزاری دەکرد ئێستا ئەوەش نەما، سەریان قیتەو ئەو پەتەی لەسەری یارییان دەکرد هەر دوو سەری بە دەست داگیرکەرانەوە بوو، ئێستا سەرێکیان داوەتە دەست ئەوانەی کە سەرەکەی تر بە دوژمن دەزانن.

چۆن چۆنی ئەو دوو دژ بەیەکە هەر یەك سەرێکی پەتی یاری کردنەکەیان بۆ گرتوون... بەڕێوبەر تا دەمی دەرگای دەرەوە و سواربوونی ئۆتۆمبێلەکانیان ڕەوانەی کردن... بارام خۆی نەشێوان، هەناسەیەکی بە بەرخۆیدا هێنایەوە و دەستێکی بەسەرو پۆتەلاکی خۆیدا هێناو، ئەوەی هەستی پێ دەکرد هەمووی لە ناو دەروونیدا حەشار داو و نێوچاوانی خۆی گەشانەوە و وەك جاران بە شێوەیەکی ئاسایی چووە ژوورەکەی خۆی...

نوری ئەفەنی بە خێرهاتنێکی وای کرد وای پیشان دا لەوەو بەر نەیدیووە!...

دیار بوو دواکەتنەکەی بارام بۆشاییەکی وەهای دروست نەکردبوو سەرنج ڕاکێش بێ... وردە سەرە داوی ئەو تۆڕەی کە بۆی دانرابوو دەردەکەوت، ئەوەتا فەرمانبەرەکان وەڵامی ڕۆژباشییەکەی ئەویان بە (عليك السلام)ێکی سارد وەرام دایەوە... پێی سەیر بوو، بۆیە لە دڵەوە دەیوت:

– تۆ بڵێی ئەوەی بۆ من تاشراوە، ئاگرێکی وەها بێ ئەمانە بگرێتەوە، جا ئەگەر واشبێ ئەی مانای برادەری چەند ساڵەی چی لێ هات، یان سروشتی فەرمانبەری لای ئەمانە وایە، جا ئەگەر وابێ هەی بە قوڕ داچێ و میزی بەر قەڵای بەسەردا بکرێ، بارام لەسەر مێزەکەی دانیشت و فایلێکی لە چەکمەجەکەیدا دەرهێناو و دەستی کرد بە هەڵگێڕ و وەرگێڕی ئەو پارچە قاقەزانە کە تیایدا بوون.. هەستی ڕاگرت لەبارەیەوە چپەیەك نەکرا کەسیش پرسیاری وەرگرتن یان وەرنەگرتنی نەوتەکەی لێ نەکرد.

ئەو ڕۆژە وەك ڕۆژەکانی تر ڕەوەنەقدار نەبوو.. ڕۆژانی تر لەو کاتەدا دەفتەری کاروبارەکانی ڕۆژی پێشی ماڵەوەیان بۆ یەکتری دەخوێندەوە و بۆ بە بادانی خەمەکانیان پێکەنینیان لەسەر دروست دەکرد... ئەگەر یەکێکیان جامە  ماستێکی کڕیبا، ئەو ڕۆژە جامە ماستەکە دەبوو بەبابەتی قسەو پەرت دەبوو سەر تا خواری فەرمانگەکەی دەگرتەوە.. بە چەندی کڕیوە، لای کام ماست فرۆش، هی مەڕ بوو یان هی چێر، یان تێکەڵاوە؟ بە قەرز یان بە حازر؟..

بەو جۆرە وردە پرسیارانە شتەکەیان هەڵگێڕ و وەرگێر دەکرد و ئەوەی کڕیبووی دەکرابە پاڵەوانی داستان و کاتەکەیان پێ پڕ دەکردەوە، بەتایبەتی کەسەوداکاران کەم دەبوونەوە، بابەتەکانی دوێنێ و پێرێ و بە سەرپێرێیان دەخستنەوە سەر بابەتە نوێکەو دووبارە و سێ بارەیان دەکردنەوە...

چی لە بارام بوو ئێستا باس باسی نەوت وەرگرتن و هێنان و بردنی بەرمیلەکانە کەچی ئەو بابەتە وەك بەردی بن گۆمی لێ هاتبوو کەس باسی نەدەکرد! کەسیش لە بارامی نەپرسی



لەگەڵ کێدا، بەهاوبەشی کێ وەری گرتووە؟.. چۆنی بردووەتەوە و چەندی کرێی داوە؟! کەس لەو بارەوە منتقی نەکرد!.

ئەو پرسیار نەکردنەش ئەوەندەی تر بارامی لەو فەرمانگەیە و لەو برادەرانە دوور خستەوەو وەك نامۆیەك لە ناویاندا خۆی دەبینییەوە!. ئەی باشە جاران یەکێیان چەند خولەکێك دوا بکەوتایە. هەموو لێیان دەپرسی ئەوە لە کوێ بووی! بۆ دواکەوتی!؟...

کەچی کەس بەوی نەوت بۆ ئەوەندە دواکەوتی، هەستی بە ماتییەك کرد، نوری ئەفەنی بە ناوی شتێکەوە، خۆی دزییەوە و چووە دەرێ، ئەویش نەیویست دەقی ئەو مات بوونە بە کردنەوەی وتەیەك بشکێنێ، یان ئەوەی لە دووتۆی ئەو بێ دەنگییە دایە بە ئاگای بێنی، بۆیە خۆی بە قاقەز و فایلەکەی بەر دەستی خەریك کرد و گوێی بۆ چپەکانی ئەوان شل کرد... لەو کاتەدا سکرتێرەی بەڕێوەبەر هات و جگە لە بارام داوای لە هەمووان کرد بۆ کۆبوونەوە بچنە لای بەڕێوەبەر...

هەموو دەم و دەست هەڵسان بەرەو ژوورەکەی بەڕێوەبەر بەبێ دەنگی ڕێچکەیان پێکاو ڕۆیشتن، هیچ کامێکیان بەویان نەوت فەرموو...

بارام بە تەواوی خۆی بۆ ساغ بووەوە و گومانەکانی لێڵ بوون و لە ناو ڕاستییەکدا توانەوە کە ئەو لەوان تەریك کراوە و یان لادراوە.. تاکە کۆلکە گومانێك کە تیادا مابوو هێشتا نەتوابووەوە ئەوە بوو دەیوت:

– ئەی من؟ تۆ بڵێی بەڕێوەبەر وەك ناوەکەم منی وەدەر نەنابێ ئەگەر وا نییە ئەی بۆ بە منیان نەوت فەرموو، نە سکرتێرە وتی نە نوری هات بڵێ فەرموو نەبرادەرەکان یەکێکیان ڕووی لە من نا... گومانیشی لەوەدا نەبوو کە بەڕێوەبەر مێوانەکانی بەڕێ کرد لە داڵانەکەدا ئەوی دی...

ئەو لەوێ بە تاك مایەوە... هەندێ پاڵی دایەوە و لاقی بە ژێر مێزەکەیدا ڕاکێشا و لە دڵی خۆیدا وای بە باش زانی چەند خولەکێك لەوی خواپێن بکات، ئەگەر ناردیان بە شوێنیدا ئەو کاتە ئەویش حەقی خۆی لێیان بکاتەوە و بڵێ:

– ئەگەر پێویستیان بە من هەیە، ئێوە وەرنە لای من.. بەو جۆرە حەقی خۆیان دەخەمەوە مشتیان، ئەگەر نا هەر بیزم نەیە، ئاوڕ لە گەورە و بچووکیان بدەمەوە...

لەو بیرەدا بوو نەیزانی زۆری پێ چووە یان کەم.. چەکمەجەی مێزەکەی قوفڵ داو کلیلەکانی لەسەر جێهێشت و کورسییە شڕەکەی خۆی بە بەرواژی و لنگاو قوچ لەسەر مێزەکەی داناو

جغەرەیەکی داگرسان بەلا لێویەوە گرت و بە بەردەم دەرگاکەی سکرتێردا بە فیزەوە مژی لە جگەرەکە دەدا و بەرەو پلیکیانەکان رۆی.

چیمەن ئافرەتێکی ئاوارە بوو، لە فەرمانگەکەی بارامدا دامەزرابوو، چەند بلێی ئافرەتێکی کوردپەروەر و تیژڕەو بوو، لەبەر ئەوەی بارام لە کۆبوونەوە حیزبییەکاندا ئامادە نەدەبوو، ئەویش پێی وابوو لایەنگری لایەکی تری برا کوژییە، چەند جار لەگەڵیدا قسەی کرد بوو بۆی دەرکەوتبوو پیاوێکی کوردپەروەری راستەقینەیە، دەیزانی ئەو عەودالّی ئەو کورتە رێگەیە بوو کە کورد لە رزگار بوون نزیك دەخاتەوە...

چیمەن لە پێپلیکانەکاندا سەر دەکەوت، بارامیش دەچووە خوارێ، لە ناوەڕاستدا یەکتریان گرت، چیمەن بێ یەك دوو وتی:

– ئەوە بۆ وا؟!..

بارام بەبێ ئەوەی خۆی بشێوێنێ...

– چی بووە؟..

– بیستم دوور خراویتەوە...

– قەیدی چییە.. وەزیفە وایە، دەگوێزریتەوە، گەورە دەبێ، گچکە دەکرێتەوە، هەمووی لەرێد دایە..

– زۆر خەمم خوارد.. خۆزگە وا نەبووایە...

– گوێ مەدەرێ.. هەمووی هەر نیشتمانە، چ لێرە بێ و چ لەوێ.. ئەوەی بیەوێ کوردستان رزگار بکات، دەبێ هەموو شوێنێکی بە حەوشی ماڵی باوکی بزانێ...

– خۆزگە خەڵکی تریش وا بیریان دەکردەوە... خوا سەبەب کارت بگرێ...

– خوا ئەو سەبەبکارەش بگرێ کە بە یەکێکی وەك تۆ دەڵێن ئاوارە...

لەو کاتەدا رەسوڵە گەدە لە پێپلیکانەکان دەهاتە خوارەوە، چیمەن چاکی دەناسی، هەر چەند بە ناو نیشان دەرگەوان بوو، بەڵام کاری چاودێری و سیخوریشی پێ راسپێردرابوو.

لەمە چیمەنی دی ..

بە پەلە بە بارامی وت:

– تۆخوا جاروبار سەرمان لێ بدە...

ئەو سەرکەوت و بارامیش بە گوڕ لە وەزارەت دەرچوو...



## (6)

بارام کە لە وەزارەت هاتە دەرەوە بۆ سواربوونی پاس یەکسەر چوو لە وێستگەکەی بەرامبەر وەزارەت راوەستا، یەك ئاوڕی لەو وەزارەتەی کە چەندان ساڵ بوو خزمەتی کرد بوو نەدایەوە هەر چەند لای ستەم بوو بەو جۆرە ترسنۆکانە ئەو کارەی لەگەڵ کرا لە هەمان کاتدا پێ خراپ نەبوو، چونکە بەو جۆرە نەبووایە دەست بەرداری ئەو کارە نەدەبوو کە لە جیاتی بەختکردنی هەموو ژیانی نانی تەمەڵی و مەمرەو مەژی دەدایە، ئیتر هەستی کرد لەمەو دوا بۆ خۆی دەژی و خۆی لەبەر دەستی خۆیایەتی...

پیێ کەمایەتی بوو بە چیمەن بلێ: بۆ کوێ دوور خراومەتەوە.. ئایا بڕۆم لێ کراوە یان راگوازراوم...

لە دڵەوە دەیوت:

– هەی ترسنۆکینە، ئاوا حیزانە خەڵك دوور دەخەنەوە!.. دەی کە هەر واتان کرد پێمتان بووتایە: ناوت لە ناو لیستەکەدا نییە تا ئەو هەموو دەردە سەریەم بە سەرەدا نەهاتایە.. خۆ تا دوێنێ من بەردی مەحەکی ئەو وەزارەتە بووم، چۆن منتان لە نیو بەرمیل نەوت بێ بەش کرد!؟. یانی بەو کارەتان بارام پەکی دەکەوێ!؟..

هەی قوڕتان بەسەر, بارام وەك ئاسن وەهایە چەند لێی بدەی رەقتر دەبێ...

پاسەکە هات، بارام لەسەر خۆ وەك یەکێك بارێکی گەورەی لە کۆڵ بێتەوە، ئاوا بەسووك و ئاسانی لە دوا سەندەڵی پاسەکەدا دانیشت و لەو یانزە دینارەی هەیبوو، پارەی پاسەکەی لێدا، لە وێستگەکەی تردا (عەلە رامبۆ) سەرکەوت و بەر لەوەی دانیشێچاوێکی بە ناو پاسەکەدا خشان, خواو راسا بارامی نەدی، دەنا دەچووە تەنیشتی و دەستی دەکرد بە قسەی هەلەق و پەلەق پارەی پاسەکەی دەخستە سەر ئەو و لەوانەش بوو داوای هەندێ پارەی لێ بکات، هیچ

کەس وەك بارام حەزی لە قسەکانی رامبۆ نەدەکرد، چونکە دەیزانی ئەوەی خەڵك نەیدەوێرا بیڵێ ئەو بەو ناوەی تێکچووە دەیوت...

عەلە لە تەنیشت کابرایەکەوە دانیشت بە شێوەی بەستنی جامدانەکەیدا دیار بوو خەڵکی لای خۆیان بوو، بەگەرمی چاك و چلۆنیان لە یەکتری کرد، وەك رۆژنامەی قووت دابێ بە بێ راوەستان کەوتە قسە کردن بە کارێکی وەها سەرنجی هەموو نەفەرەکانی ناو پاسەکەی راکێشا و زەردەخەنەی خستە سەر لێوانی هەمووانەوە... لەو رۆژانەدا جۆرە قسەیەك لە پشتە ملە دەکران، بەڵام لە دەرەوە بڤە بوون...

پاسەکە دوو چەکداری تیا بوو لەو رۆژانەدا لەگەڵ سێبەری خۆشیاندا دەجەنگان و لە خشەی گوریسیش دەسڵەمینەوە...

رامبۆ لە بنی کودی داو چاك و خراپی تێکەڵاو دەکردن و لەکونی دەنان! بوو بە زمانی داخراوی خەڵکەکە و دیار بوو دەیزانی ئەو دوو چەکدارە لەوێن، بۆیە جاروبار وتەکانی بۆ دەچەماندنەوە و لە پەنادا بزمارێکی لێ دەدان.. ئەوانیش دەیانوسست تووڕە بن، بەڵام ئەوەندە قسەکانی بە نەستەقی و بێ پێچ و پەنا دەکرد پێکەنینی ناوەوە نەیدەهێشت تووڕەیی کەف بکات، ئەوەندەی پێ نەچوو هێنانییە پێکەنین و قۆشمە، شۆفێرەکەش بە قسەکانی رامبۆ سکی لە پێکەنین ئاوسا بوو، بەڵام لە ترس چەکدارەکان نەیدەوێرا دەری برێ، کەزانی ئەوانیش تەقانیان، ئەویش تەقییەوە و خەریك بوو دەستی لە سوکانی پاسەکە بەربێ و خۆی بەیەك دوو ئۆتۆمبێلدا بدات...

دوای دوو وێستگە یەکێك لە چەکدارەکان بەوی تری وت:

– ئەوە بۆ دانەبەزین!؟.

ئەویتریان وتی:

– بۆ گەیشتن؟!

– بەجێمان هێشت...

داوایان لە شوفێرەکە کرد پاسەکە راگرێ...

لە کاتی هاتنە خوارەوەدا یەکێکیان رووی کردە رامبۆ و وتی:

– ئەم سەگبابە بە قسەی قۆڕ شوێنەکەی لێ هەڵە کردین...

رامبۆ بەبێ ئەوەی خۆی بشێوێنێ هەڵسایەوە سەلام خودێکی بۆ کردو وتی:

– برا گەورەمی، سەییدی!..



خەڵکی ناو پاسەکە، هەموو دایانە قاقای پێکەنین، پاسەکە جولاّو کابرای چەکداریش لەدەرەوە پتت لێ دایە شەقی دەبرد...

رامبۆ وای بۆ لوا بوو کەس لێی نەگرێ، ئەویش لغاوی بۆ خۆی شل کرد بوو، هەموو شار دەیانناسی و بیرەوەری لە ناو هۆشی زۆر کەسدا هەبوو، هەندێ تێنەگەیشتوو قسەکانی ئەویان بە قسەی شێتان دەدایە قەڵەم! کەچی لە راستیدا هەموو وتاری رەخنە ئامێز و تیر و پلار و تەشەر و شاندنی و گاڵتە جاڕانە بوون، ئاراستەی ئەوانەی دەکرد کە بە عەقڵییەتێکی رەگەز پەرستانە و تۆڵە و راو و رووتکردن و تاڵانی بردن و... دەسەڵاتیان دەنواند...

یان قسەکانی وێنەی راستەقینەی کاریکاتێرانەی رەفتارە نالەبارەکانی دەسەڵاتداران و خەڵکە هەڵەپاچ و هەڵپە سازان بوو...

بارام لە ناخەوە قسەکانی رامبۆی پەسەند دەکرد چونکە دەیزانی بۆ کوێ دەهاوێ و چۆن کەللە شەکر دەشکێنێ و بۆ کێی دەشکێنێ، هەرگیز ئەو رۆژەی لەبیر ناچێتەوە، لە رۆژێکی وەهادا کە حیزبی بەعس گونی گونداری لە بنەوە دەردەهێنا ئەو بە راست و چەپدا تیری ژەهراوی تێ دەسرەواندن.. رۆژێك لە یانەی فەرمانبەرانی هەولێر دۆمبلە دەکرا لە دەشتی هەولێریش شەڕی نێوان پێشمەرگە و رژێم لەو پەڕی گەرمی دابوو..

یەکێك هەڵسایەوە سەر پێ و گلەیی لە راکێشانی دۆمبلەکەی هەبوو یەك دووجار وشەی ( حەق نەماوە، حەقی نەبوو وا بێ)ی بەکاردەهێنا، رامبۆ کە گوێی لێ بوو، هەڵسا و چووە سەر مێزەکەی بەردەمی وەك وتار بێژێك وتار بدا و بە توندی رووی کردە ئەو کەسەی کە گلەیی لە حەق و ناحەق دەکرد وتی:

– "مردوت مرێ حەق حەقی چیتە!... دیارە تۆ لە گوێی گادا خەوتووی.. ئەی نازانی حەق تەواو بوو هەمووی بە کوردان دراوە!... کورد حەقیان هێشت! هەموویان راماڵی!..ئەی سەییدول رەئیس نالێ: کورد وێرای حەقی هاوولاّتی دوو حەقی تریشی هەیە، لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا حەقی هەیە ببێ بە ئەندامی حیزبی بەعس، لە هەموو عیراقیشدا حەقی هەیە ببێ بە ئەندامی حیزب... لە ناوچەی شیمالدا بۆی هەیە ئەندامی ئەنجوومەنی یاسادانان هەڵبژێرێ!.. ئەمە هەمووی حەقە لەمە بەدەر کوا حەق... حەقی چی هەمووی درا بە کورد و ئاو بێنەو دەست بشۆ، دەبڕۆ لە ناو مەنجەڵی حەقدا بگەڕێ بزانە بنکڕیشی تیا ماوە!".

ئەمەی وت و دانیشتوانی یانەکە دایانە قاقای پێکەنین و جۆرە هەرج و پەرجێك دروست بوو، ئەو ئەفەندییەی کە گلەیی حەق و ناحەق کرد زوو وەك رێوییەك کە لە دوورەوە هەست بە

ترس بکات وا خۆی دزییەوە و بۆی دەرچوو، چەند بەعسییەکی عەرەب لەوێ بوون بە پێکەنینی خەڵکەکە و قسەکانی رامبۆ سەریان سوڕما، هەستیان بە جۆرە تەقینەوەیەك کرد، بەڵام تێنەگەیشتن رامبۆ چی وت، ئەوەندە نەبێ وشەی ( حەق)ی وەك هێلکەی دوو زەردێنە پیتی ( ق)ێکەی دەتەقاندەوە و ناوی سەییدول رەئیسیشی هێنا.. سەرسام بوون حەزیان دەکرد بزانن مەسەلە چییە و چی وترا..

مامۆستایەکی عەرەب لەوێ بوو پێیان دەوت ( ئەبو صباح) کۆنە شیوعییەکی بەعسی مەشرەبی شیعە مەزهەب بوو، کوردی دەزانی، خۆی پێ رانەگیرا و وتی:

– ( عافیە رامبۆ.. بشرفی های عشرین سنە آنی ما سامع حچی صدوگ مثل های حەچی...) وای وت و ئەزنیفەکەی بەردەمی بە جێ هێشتوو رۆیشت، خەڵکێکی زۆریش نەبادا دەست نیشان بکرێن پاش پێکەنینەکە کە خۆیان دزییەوە و دەرچوون، دیار بوو (ئەمنە) کوردەکان، قسەکانی رامبۆیان بۆ ( ئەمنە) عەرەبەکان کردبوو بە عەرەبی و باشیان تێنەگەیاند بوون... هەڵسان رامبۆیان راپێچ کردوو بردیان.. وەختێ کە بردیان لە دەم دەرگای دەرەوە رووی کردە خەڵکەکە و وتی:

– براینە ئێوە خەرێکی دۆمبلانی خۆتان بن من دەعوەتی حکوومەتم، تێکی مەدەن، تۆزێکی تر دەگەڕێمەوە....

رامبۆیان برد... ئەو شەوە بردنی رامبۆ بوو بە دەنگوباسی هەموو ماڵێك... لە دواییدا دەرکەوت کە بردوویانە دائیرەی ئەمن، تێر دارکارییان کردووە، یەکێك لە ئەمنە کوردەکان ئاشنای دەبێ و دڵی پێی دەسووتێ و بەو ناوەوە کە کابرا شێتە و لە رووی نیاز پاکییەوە ئەو قسانەی کردووە، بە کەفالەتی ئەو دوای چوار رۆژ لێدان بەری دەدەن، بەڵام چ بەردانێك ئەوەندەیان لێ دابوو نەت دەناسییەوە، هەموو دەم و چاوی شین و مۆر ببوو، ئەگەر بتوتایە: ئەرێ کاکە عەلی ئەوە بۆ وات لێ هاتووە، دەیوت کاکە یەکێك نەبێبە (مڵە) ئاوا خەڵاتی دەکەن.. ئەگەر بتوتایە مڵە چییە؟.. دەیوت:

– مردووتان مرێ بۆ من کۆڕی زانیاریم داناوە تا ئەو هەموو خەڵکە فێری زمانەوانی بکەم! خۆتان بزانن چییە..

تا سێ رۆژ وشەی مڵەی بە کاردەهێنا ئەو سێ رۆژە دەیوت:

– کاکە وتەیەکی سەییدول رەئیسم خوا... بۆ خەڵك راڤە کرد خەڵك تێنەگەیشتن وتەکەیان کرد بە دارێك تێیان بریم و کردمیان بە ئەسدیقای سەییدول رەئیس!...



بارام ئاوا یادی عەلی رامبۆی دەکردەوە، خەڵکەکەی ناو پاسەکەش دەیان جووڵان کە قسە بکات... تا یەکێك رووی پرسیاری لێ کرد و پرسی:

– ئەرێ کاك عەلی راستە ناوی حاجی پەڕۆ تۆ خستتە شوێن حاجی رەشیدی بازرگان؟...

کە زانی خەڵکەکە دەیناسن و چێژ لە قسەکانی وەردەگرن، هەندێ خۆی شیرین کرد و بە نازەوە وتی:

– نا.. ئەوەم پێ مەگێڕەوە...

– تۆخوا ئەگەر نەی گێڕیتەوە...

مادامەکی ناوی خوات هێنا دڵت ناشکێنم..

– راستیت دەوێ بۆ ناوەکە من نەبووم، بەڵکو نەقابەی مامۆستایان ئەو ناوەیان خستە شوێنی...

حاجی رەشید باوکی یەکێك لە قوتابییەکانمان بوو لەم شارەدا دەوڵەمەندی وەك خۆی کەم بوون، بەڵام لە رژدی و بەخیلیدا وەك خۆی نەبوو.. وتم حاجی چارت دەکەم... رۆژێکیان خۆم تیف تیفەدا و بۆ یماخێکی تازەم بەست، ئەفەندییەکی وام لێ دەرچوو شەیتان شەرمی لێ دەکردم، دوو رۆژ مابوو بۆ جەژنی مامۆستایان چوومە دوکانی، دانیشتم، وتم حاجی من نوێنەری نەقابەی مامۆستایانم دوو رۆژی تر جەژنی مامۆستایانە، دەبێ بەو بۆنەوە بینایەی نەقابە برازێنینەوە.. لای وابوو داوای باربووی لێ دەکەم راچڵەکا.. بۆ ئەوەی زۆر سەخڵەت بێ هەندێ خۆم بێ دەنگ کرد ئەوجا پێم وت:

دەمەوێ هەندێ قوماشی رەنگاو رەنگت لێ بکڕم.. لەهەر تۆپێ، چارەکێکم لێ دابڕی.. نزیکەی بیست چارەك لە هەر پارچەیەکم لێ بڕی.. هەموو جار دەیوت تۆ ئەو قوماشانە بۆ خەسار دەکەی؟ منیش دەموت: تۆ نافرۆشی؟. هەموویان بەسەر یەکەوە بە مەتر ئەژمار بەکەو پارەی خۆت وەربگرە...

کە ویستم پارەی بدەمێ دەستم لە هەموو لای خۆم کوتا وام پیشان دا کە پارەکەم بەجێ هێشتووە، زانیم کە خەریکە نارەحەت بێ وتم کاك حاجی، با قوماشەکان لای خۆت بن هەر ئێستا دەڕۆم و پارەکەت بۆ دێنم، دەستم بە گیرفانی خۆمدا کرد، وەرەقەیەکی نەقابەم لا بوو، ناوی سەرۆکی نەقابەم نووسی و ئیمزایەکم لێ داو وتم ئەو پسوڵە بگرە با لات بێ هەر ئێستا دەگەڕێمەوە...

سبەی ئێواران لە باخچەکەی نەقابە لەگەڵ چەند کەسانێك دانیشتبووم، خۆم گۆڕی بوو، تەماشا دەکەم، حاجی گونیەکی بە شانیدا داوە و کردی بە ژووری سەرۆکی نەقابەدا، پارچەکانی لە بەردەمیا هەڵڕشت، بەڵام هیچی سەوز نەکرد.. ئیتر لەو ڕۆژەوە ناو نرا حاجی پەڕۆ، کوڕەکەی لە قوتابخانەمان بوو، نازانێ ئەو پەندە من بە باوکی داومە، پێم وت:

- ئەدی باوکت چی لە پارچەکان کرد...

وتی:

- مامۆستا ماڵەکەمان هەنووکە ڕەنگاو ڕەنگە، دۆشەکمان و بالیفمان و نیم دەرمان هەمووی بوون بە پارچەی ڕەنگاو ڕەنگ..

ئەو کەسەی کە داوای گێڕانەوەی ئەو کارەی کرد، پرسیاری لێ کردەوە:

- ئەی حاجی پەڕۆ؟ ئەی نەقابە؟ زانییان کێ ئەو پەنەی پێ دا؟..

- نەقابە زانی.. وابزانم حاجیش زانیویەتی...

زوو پرسیارێکی تری لێ کردەوە...

- چۆن دەزانی حاجی زانیویەتی کە تۆ بووی...

- ڕۆژێك بە لای دوکانەکەیدا تێپەڕیم گوێم لێ بوو دەیوت:

- ئەوە ئەو سەگبابەیە کە خۆی کرد بوو بە سەرۆکی نەقابە..

- ئەی نەقابە چییان پێ وتی!؟.

- چی بڵێن؟... سەرنجیان ڕاکێشام!...

- ڕاستە وەك تۆ ناوی (حاجی پەڕۆ)ت خستە شوێن حاجی ڕەشید، ئەوانیش ناویان نای...

- گوێ مەدەرێ دەرزییەك بە خەڵکدا بکەی سووژنێکت پیا دەکەنەوە... بەڵام سووژنەکەی من لە پێڵاوەکەم دراوە ئێشی نییە..

لەو کاتەدا کە عەلە ڕامبۆ لەو بەزم و باڵۆرەدا بوو، بارام بە بیری خۆیدا دەهێنا کە عەلی ئەفەنی کە بە عەبە ڕامبۆ ناوی زڕاوە بۆیە بە شێت و لێوە دەزانرێ، چونکە ڕاستییەکان ناتوانێ لەسنگیدا خەفە بکات و ناحەقی بشارێتەوە، یان دەیەوێ لە ناو مۆمیای شتە بێ گیانەکانی ڕەویەو ڕەوشی کۆمەڵ خۆی دەرباز بکات و بچێتە دەرەوە، دەنا ئەو شتانەی ئەو دەیکات هەمووی بزمار کوتاندنە لە دیوارە کۆنەکان و تریسکەی ڕووناکییەکە ئاراستەی ناو هزرە بە ندکراوەکان دەکرا..



ئەو وای بۆ چوو قسە و کردەوەکانی ڕامبۆ بەشێکی ڕووناك بوون لە شێوازی ڕەتدانەوە و بەرگری زوڵم و چەوسانەوە، هەروەهاش گوزارشت دانەوە بوو لە ویژدانی زیندوی ئەم نەتەوە سەر کوت کراوە.

دەبووایە بۆ بەرپەچی ئەو هەموو ستەمە کە ساڵەهای ساڵە لەم نەتەوە بێ دەرتانە دەکرێ —بۆ ڕاچڵەکاندنی- هەزاران وەك ڕامبۆ پەیدا بێن، هەر چەند هەن، بەڵام سەر ژمار ناکرێن و زمانیان وەك ڕامبۆ پێوە نییە، هەندێکیان وڕوگێژ وەك خولی بێ ماڵ لە بازاڕی شارەکانی کوردستاندا دەسووڕێنەوە و خەڵك پێی وایە شێت بوون و دەستیان لێ وەشێنراوە...

بارام خەمی ئەوەی لێ نیشتبوو ئەویش لە ئەنجامی ئەو لێکدانەوە و خۆکەر نەکردنە دا وەك ئەوی لێ بێ... ترسێکی بەر خۆی ناو وتی:

- کێ نالێ وەك ئەوم لێ نەهاتووە.. بەڵام هێشتا ناوم نەزڕاوە!..

ئەمەی بە دڵدا هاتوو لە پڕ هەڵسا لەپاسەکە دابەزی و بەرەو ماڵی خۆیان ڕێی گرتە بەر، لەسەر خۆ دەرۆیشت و هۆشی لە ناو دیاردەی چەندان کەسی وەك ڕامبۆ گینگڵەی دەدا، دیار بوو ئەویش لە هەمان ئێزگە دابەزی بوو، ئەو بارامی چاك دەناسی ئەویش هەروەها... زوو دەستی بۆ تاکسییەك ڕاگرت و بێ مامەڵە سوار بوو، دای بەلای بارامدا و ڕایگرت، هاتە خوارەوە و بە توندی گازی بارامی کرد:

- کاك بارام! وەرە سوار بە...

دەرگای پێشەوەی تەکسییەکەی بۆ کردەوە...

- سوپاست دەکەم... سوپاست دەکەم... کاك عەلی ئەو زەحمەتەی ناوێ...

- زەحمەتی چی! بەو کوردستانە، بە سەری بارزانی سوار دەبی...

- کاکە هەندێ ئیشم لەو دووکانە هەیە...

دەستی بۆ دووکانەکەی ئەو بەر ڕاکێشا و وتی:

- زۆر سوپاسی هەستی بەرزت دەکەم...

- ئیشەکەت چییە بڕۆ بیکەو وەرەوە... ڕاوەستاوین تا بێیتەوە...

کە بارام زانی وازی لێ ناهێنێ، ناچار بو بڵێ:

- کاك عەلی حەزم دەکرد لە خزمەتتا بم.. ئیشەکە زۆری پێ دەچێ بۆ چاوەڕوانی ناشێ...

- حەز دەکەی لە خزمەتتا دێم...

- نا ئیشەکە تایبەتییە...

- ئاخر دوایی نەڵێی بە سواری دای بە لامداو سواری نەکردم... گلەیی خۆت لەسەر خۆتە..

رامبۆ پێی وا بوو نێچیرێکی قەڵەوی شکار کردووە و ئێستا بە ئاسانی بە داویەوە دەکات، کە زانی وانییە، چووەوە ناو تەکسییەکە و تووند دەرگاکەی پێوە داو بە کابرای شۆفێری وت:

- بهاژووە...

بارام کە زانی رامبۆی لە کۆڵ بووەوە، هەناسەیەکی داو لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- ئەی رامبۆ چەند مووی هەڵ خەڵەتاندنی وات خستووەتە ناو ماستی خەڵکەوە... زۆر جار گوێم لێ بووە تەکسی ڕاگرتووە و برادەری خۆی بە زۆر سوار کردووە، لەو شوێنەی مەبەستی بووە دابەزیووە و کرێی تەکسییەکەی بۆ برادەرەکەی بەجێ هێشتووە...

بارام بەو سوار نەبوونە گەلێ دڵی خۆش بوو، ئافەرین، ژیری نواند بەو داوەوە نەبوو، ئەوەندە خۆی بە سەرکەوتوو دەزانی پێی وا بوو بەرمیلەکەی پڕ بە نەوتەوە بۆ هاتووەتەوە... لە دڵ خۆیدا دەیوت:

- ئافەرین بارام... رام لێتە، خەریکە تۆش فێری سیاسەتی رۆژانە دەبی، خۆ ئەگەر ئەو کڵاوەی لە سەرت بنایە وەك چوار پەل ناڵی کردبی وایە...

دڵی لە خۆشیا خەریك بوو کەیل ببێ، نەیزانی رێگەی نێوان ماڵی خۆیان و ئەو شوێنەی کە تیایدا دابەزی چۆنی بڕی... کە گەیشتە بەردەم دەرگا کوڕە بچووکەکەی (کامەران) کە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بوو لەبەر دەرگای دەرەوە دۆش دامابوو! وەك جاران پێشوازی لە باوکی نەکرد، بەوا زانی لەماڵەوە شتێ رووی داوە، حەوشەکەش کش و مات بوو، پەریخانی ژنی و هەموو منداڵەکان لە ماڵەوە بوون، کەچی ماڵ وەك کەسی تیا نەبێ وابوو، هەواری خاڵی بوو، لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- بۆ ماڵ دەڵێی ئاشە و ئاوی کەوتووە!... تۆ بڵێی بە مەسەلەکانی ئەمڕۆی منیان زانیبێ!. ئەگەر مەسەلە گرانی بێ، ئێمە لە زۆر کەس باشترین.. نا... ببێ ونەبێ پەیوەندی بە پەریخانەوە هەیە با بزانم بۆچی دیار نییە... لە کامەرانی پرسی:

- ئەوە دایکتان لە کوێیە؟

- ئەی نازانی!؟.

- چی بزانم دەی بڵێ بزانم...

- ئەی نازانی پوورم خونچە مردووە!؟



- کەی؟.

- ئەمشەوی رابردوو...

بارام هیچ خۆی نەشێوان.. هەندێ مات بوو...

- خوا لێی خۆش بێ...

چووە ژوورەوە، دی منداڵەکانی مات دانیشتبوون، لەسەر کەرەوێتەکە دانیشت و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- خوا لێی خۆش بێ.. مردن برا گەورەیە سەر لە هەمووومان دەدات، ئەوە رێی هەمووومانە، ئەو رۆی ناگەرێتەوە، ئێمەش دەڕۆینە لای ئەو، لە دڵ خۆیدا دیمەنێك لە ژیانی خونچەی هێنایەوە یاد:

" لە یادمە بە هاری ساڵی (1974) کە خەڵك وەك لافاو بە ماڵ و منداڵەوە لای رژێمیان بەرداو چوونە رێزی شۆڕشەکەیانەوە، رۆژێکیان بە رێکەوت رێم کەوتە لایان بە خۆی و چوار منداڵی وردەوە لەگەڵ یوسفی مێردیا لە بن بەردێکی ئەو کۆسارەی ناوچەی باڵەکیاندا کە وەك ئەشکەوت وابوو خۆیان مات کردبوو بارانەکەی ئەو ساڵە شەستی دەکرد و یەك مانگ بوو سەرەو مڕ باران رەهێڵەی دەکرد و پشوودانی نەبوو، یوسف و ئەو منداڵانە لەبن ئەو تاشە بەردەدا چونکە خۆی لە ریزی شۆڕشدا دەدبییەوە شای بە سەپانی خۆی نەدەزانی.. بە قەد خوڕەمی بارانەکە ئومێدەواری پاشەڕۆژێکی رووناك بوو..وای دەزانی کاڵای پڕ باڵای بەختەوەری لە بەر ئەو دایە شۆڕش کە تووشی نسکۆ بوو.. یەکێك لەوانە کە دەیویست خۆی بە دەست هیچ لایەکەوە نەدا ئەو بوو... بەڵام زرووفی ناهەموار وای خواست ئەویش وەك هەزاران کەسی تر خۆی بە دەستەوە بداو بگەڕێتەوە و سەر لە نوێ بە جۆرێکی تر خەبات بکاتەوە...

خەڵك پێی وابوو ئەویش یەکێکە لە رووخاوەکان، کەچی وەك دەردەکەوت یوسفی لەسەر خۆ و هێمن لە پەنادا لە ناو گۆڕەپانی تێکۆشانی نهێنیدا راچەنینێکی بەرپا کردووە و لە ناو جەرگەی شاردا لە پشت ملهوڕی دوژمندا چەند شانەی دامەزراندنی شۆڕشی نوێی پێك ناوە، دیار بوو خوێن مژان خستبوویانە ژێر چاودێرییەکی وردەوە تا ساڵی(1985) بە رۆژی رووناك کوتایانە سەر ماڵەکەی و لە تۆی بێجامەدا بردیان.. دوای سێ رۆژ لاشەکەی بە قیمە کراوی لە لای کارگەی قیرەکە دۆزرایەوە.. لەو کاتەوە منداڵەکانی خونچەی خێر لە خۆ نەدیو بە کوێرەوەری بەخێوی دەکردن.."

سەری بەرز کردەوەو وتی: خوا عەفوی بکات... خۆ نەخۆشییەکی وای نەبوو...

شلێری کچی وەك بیەوێ هۆی مردنەکەی بلێ:

- نەخۆشی لە نەبوونییەکەی ئەمڕۆوە چۆکی داداوە

بارام وتی: خۆ، تا سەر نییە یەك و دوو ڕۆژێکی تر ئەو گوشارەی کە چۆکی لەسەر سنگمان داناوە لا دەچێ، ئەم نەبوونییە تاقیکردنەوە و راهێنانە، مرۆڤ ئەوەیە بەرەنگاری ڕۆژێکی وا تەنگ بکات... رووی کردە هەمووان...ئێوە منداڵن نازانن، لەوەتەی ئێمە هەین ئەمە حاڵمان بووە، بەڵام ئەم تەنگانەی ئەم جارە شتێکی ترە، بۆ ئێمە و بۆ دوژمنانی کورد، ئێمە بە ئاسانی دەتوانین لێی دەرباز بین... قوڕ بە سەر ئەوان، جگە لەوەش پاشەڕۆژێکی ڕووناکی بۆ کوردان تیا بەدی دەکرێ، وا هەست دەکەم ئەو ڕۆژە نەما لە گۆشەیەکدا دۆش دا بمێنین...

خەم مەخۆن هەر لەمە زانیم سەخڵەت دەبین ناو ماڵێکی زۆرمان هەیە، بە پێی پێویستی دەیانفرۆشین، نایەڵم برسیتان ببێ، هەر لەمە زانیم درێژەی کێشا خانووەکەشم دەفرۆشم، ماڵی پێکهاتەی سی ساڵ ئەوەندە شتی تیایە بەشی ساڵێکمان بکات...

ئەمڕۆ تاکە بەرمیلێکی بە تاڵ دووسەد دینار بکات، داخۆ..مافورێکی کاشانی چەند بکات؟

یەکێك لە منداڵەکانی قسەی دایە بەر قسەکەی و وتی:

- جا دوو سەد دینار بەچی دەچێ؟

- باشە کەلێنێکی پێ دەگیرێ... بە مەمرە و مەژی رایدەکێشین تا دەگەینە ئەو پەر تونێلەکە... ڕۆڵە ئێمە پەکمان ناکەوێ، ئێوە تەماشای ئەو خەڵکە بۆ ناکەن، نانی ئێوارەیان نییە و کرێچین... ماڵی واش هەیە دە سەر کلۆفتە کەوتووەتە سەر ساجی عەلی... شایی و شیوەن ئەگەر پێکەوە بن زەماوەندە... رازی نابم بە هیچ جۆر خەمی نەبوونی بخۆن.. مرۆڤی تەواو ئەوەیە بەرگەی تەنگانە بگرێ...

بارام دەیویست مردنی خونچە و ئەو بارە نالەبارە بە پەندی ئایینی ئامێز و وتەی بە پێز لە چاو منداڵەکانی ئاسان بکات.. بەڵام دەنگی کۆنە فرۆشەکان کە بە عارەبانە دەگەڕان، وا هاواریان دەکرد دەرفەتیان بۆ ئاخاوتن نەدەهێشتەوە...

- یەکێك: کۆنە سەلاجە دەکڕین، کۆنە تەباخ دەکڕین، کۆنە قەنەفە دەکڕین، کۆنە قەرەویڵە و چارپایین دەکڕین...



- یەکێکی تر: کۆنە پێڵاو دەکڕین، کۆنە جلوبەرگ دەکڕین، لێف دەکڕین، بالیف دەکڕین، جلی ژنانە دەکڕین، کۆنە رانك و چۆغە دەکڕین... پەلکەنان دەکڕین، کەپەك دەکڕین...

- یەکێکی تر: تفاقی ناو ماڵەوە دەکڕین، فافۆن، بۆڕی، شتومەکی تەقەمەنی، کەلوپەلی سەربازی.

تا ئەو کاتە بارام بیری لە کڕین و فرۆشتنی ئەو شتانە نەکردبووەوە، ڕەنگە ڕۆژی دەیان جار لە بەردەمیا هەمان هاوار بانگێشتەیان کرد بێ، چونکە لای مەبەست نەبوو دەنگەکان لە گوێچکەیدا نەدەزرنگانەوە یان جێیان نەدەبووەوە، بیریشی لەوە نەکردبووەوە داخۆ ئەو شتانەیان بۆ چییە و بۆ کوێیان دەبن، یان چۆنیان دەفرۆشنەوە و چۆنیان ساغ دەکەنەوە... کە ئەو شتانەی دەدایە بەر خەیاڵی، گوێی لێبوو یەکێك بە توندی لە دەرگای دەرەوەی دەدا، بارام بە پەلە بەدەم دەرگا لێدانەکەوە چوو، دی پیکابێك راوەستاوە و زەلامێکی گەنم ڕەنگی سمێڵ قیتی لێ هاتە پێشەوە، بە گەرمی دەسمووچانی لەگەدا کرد، وایدایە قەڵەم کە لە زووەوە دەیناسێ، چی لە بارامیش بوو، ئەوە یەکێکە لە خزمەکانی پەریخانی خێزانی و بە شوێنیا هاتووە، بۆیە بەگەرمی بە خێرهاتنی هێناو فەرمووی لێ کرد..

- وتیان کتێبت هەیە دەیانفرۆشی؟...

- کێ وتی؟..

- برادەرێکی خۆت وتی...

بارام نەیویست کابرا سەخڵەت بکات بۆیە حەزی نەکرد بلێ:

ئەو برادەرە کێیە! هەر کەس هەیە یان نییە گرینگ ئەوەیە ئەو یەکێکە لەوانەی کە کتێبی کوردی دەکڕن، ئیتر بۆ هەرچی هەیە ئەوە شتێکی ترە... ئەمیش تا ئەو ساتە بیری لەوە نەکردبووەوە کە ئەو برە کتێبەی کە هەیەتی ڕۆژێ لەڕۆژان بیانفرۆشێ، بەڵام وا لەم ساتەدا ئەو پەنجەرەی بۆ کرایەوە... مەسەلەکەی دایە بەرفیکری خۆی، لەم ساتە سەختتر نابێ، لایەك مەسەلەی بەرمیلەکە، لایەکی تر قەرزەکەی مارف و مردنەکەی خونچە...

ئەو کۆسپانەی بە پارە چارەسەر دەکرێن.. چی تیایە ئەو کتێبانەی کە هەیەتی بیانفرۆشێ... لە باوکییەوە بیستبووی کە لە گرانییە گەورەکەدا خەڵك قورئانی بە یەك نان داوە، تفەنگی برنەوی بە پاروە نانێك گۆڕیوەتەوە... چی تیایە ئەگەر هەندێکیان بفرۆشێ... رووی کردە کابرا:

- بڵێم کتێبم نییە... هەمە بەڵام!..

- بەڵامی ناوێ ئەگەر هەتە... ئامادەین بە نرخێکی چاك لێت بکڕین.. بە تایبەتی ئەگەر رشتەی مرواریییان تیا هەبێ و بەنرخێکی باش لێت دەکڕین، بەتایبەت بەرگی یەکەم و دووەم و سێیەم...

بارام کە گوێی لە رشتەی مرواری بوو، زانی ئەو هەگبەیە چی تیایە... ئەوانیش چتۆ کەسن.. هەر لەو کاتەدا مەسەلەی سوار نەبونی تەکسییەکەی عەلی رامبۆی هاتەوە یاد و وتی:

- راستیت دەوێ هەمبوون، هەر هەشت بەرگەکەم بەرگ کردبوون، ئێستا لێرەنین حەز دەکەی رۆژێکی تر وەرەوە ئەوانت بە جیا دەدەمێ... ئەمەی بۆیە وت هەتا هانی بدا ئەوانەی کە پێی دەفرۆشێ بە پارەیەکی باش لێی بکرێ..

- ئەوانەی کە هەتن چەند کتێب دەبن...

- نزیکەی حەوت سەد تا هەزار کتێب دەبن، هەمووشیان کوردین...

- ئێمەش کوردیمان دەوێ...

- باشە شەش سەد دانە کتێب بە چەند دەکڕی...

- بە راستی دەفرۆشی؟..

- ئەی خۆ گاڵتە ناکەم..

- با بیانبینم ئەوجا رێك دەکەوین...

- ئاخر نابێ بزانم کتێبەکان چۆن چۆنین...

- خۆت دەزانی کتێبی کوردی چۆن چۆنین، بە تێکرایی ئەژماریان دەکەین

- باشە حەز دەکەم بیانبینم...

- چۆن بیانبینی؟.

- بەر لەوەی بیان هێنییە دەرێ، چاوێکیان پیا بخشێنم...

بارام لە کابرا کەوتە گومانەوە، بۆ خۆ لادان لە داواکەی،ئەم فیکرەی بۆ هات:

- بە داخەوە لەو ژوورەدا کە کتێبەکانی تیایە، دایکی منداڵەکانم خەوتووە، چەند رۆژێکە لەبەر ئێش خەوی پیا نەکەوتووە،ئەمڕۆ نەشتەرگەریمان بۆ کرد،سوپاس بۆ خوا نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو بوو،وا ئیستا لەو ژوورەدا خەوتووە...

کابرا وەك کەری نیوە زەڕی لێ هات، کە گوێی لەو قسەیە بوو، بە خاوی وتی:

- ئاخر حەز ناکەم تووشی زەحمەت ببی...



- نا...نا.. قەید ناکات.. وا دەیانهێنمە دەرەوە خۆت وەکیل بە...

- قابیلە غەدر لە تۆ بکەم.. لە خەڵك چۆنم کڕیوون بۆ تۆ بە زیادەوە دەکڕم...

بارام لە ژوورەوە ئەو کتێبانەی کە مەبەستی بوون، بە تایبەتی رشتەی مروارییەکانی جیا کردەنەوە،ئەوانی تری بەباوش هێنانە ناو حەوشەکە و لەسەر فریزەکە تەپی کردن، دوای تەواو بوون، کابرای بانگ کرد.. ئەویش وەك لە زووەوە ئەو کتێبانەی دیبن، بەبێ بایخانە وتی:

- ئەمانە بایی چەندن؟.

- تۆ جارێ بڵێ ئەمانە چەند کتێبن...

- دیارە.. لەبەر چاومن...

کە زانی بارام لەسەر فرۆشتیان گەرمە کابرا ساردییەکی نواند، بە شێوەی قسەکردن و کڕین و سەودا کردنیدا جادۆیەکی تەواو بوو. دەیتوانی بە پێوە کەوڵی رێوی بکات و بە داریەوە هەڵی واسێ بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ... بەڵام بارام لە دیتنی ئەمجارەی رامبۆوە وریای خۆی بوو، دەیزانی ئەو زرووفەی کە ئێستا تێ کەوتووین، سەدان وەك ئەوی هێناوتە ئاراوە، بەڵام هەر کەس بە جۆرێك...

کابرا خۆی تەسك کردەوە و بە لالووتەوە وتی:

- هەر ئەمەندەیە؟..

- بەڵێ...

- خۆ ئەگەر وەك ئەمانە بکڕم لە دەور قەڵا بە فەردە هەڵرێژراوە.

- کتێبی کوردی هەر ئەمانەن...

- گەلاوێژت نییە.. ژمارەکانی رۆژنامەی کوردستانت نییە؟

- ئەمانە کە دەیان بینی هەر ئەوانە هەیە.. دەکڕی سەر چاو ناکڕی بەخێرهاتی...

- بە ژمارە چەندن؟.

- شەش سەد کتێبن...

- هەندێکیان بە کتێب ناژمێدرێن

- کتێب بە گەورە و بچووکی نییە. کتێب بە بابەت و جۆرە...

کابرا ساردییەکی نواند، دەیویست بەو جۆرە پاشقولەی بدات، بارامیش وا خۆی نواند باکی نییە بیانکڕێ یان نەیانکڕێ.. وتی:

- ئەگەر دەتەوێن ئەوانەن، ئەگەر ناتەوێن بەسەر چاو هاتی..

- کابرا ویستی پتر بارام تاقی بکاتەوە و وتی:
- ئاخر خەمی ئەو زەحمەتەی تۆمە..
- نا.. خەمی منت نەبێ، ئاسانە، چۆنمان هێنان ئاواش بە ئاسانی دەیان بەینەوە شوێن خۆیان...
- باشە ئەگەر لێت بکڕم بە چەندیان دەدەی...
- حەز دەکەی لێم مەکڕە...
- نا.. تۆ بڵێ...
- بە دانە یان هەروا بە گۆترە؟..
- تۆ خۆت کتێب کڕی شتێ بڵێ، تامنیش قسەیەك بکەم...
- باشە بە دانە، دانەی بە چارەکە دینارێ بۆت حەسێب بکەم باشە؟!

بارام زەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزی بە هەر دوو لێوی بزواند و وتی:

- چارەکە دینارێ!...
- ئەویش لەبەر ئەو زەحمەتەی کە کێشات، دنا زۆرم داوێتێ، حەز دەکەی برۆ لای قەلا بزانە چوار کتێبی کوردی بەدینارێك و کەمتریش ناکڕیت...
- تۆ کتێبی کوردی ناکڕیت؟.. جا بۆ لەوێ نەتکڕین و ئەم زەحمەتەشی نەدەویست...
- راستە وامزانی کتێبی باشترت هەیە...
- کتێب گندۆرە نییە، هەندێکی کاڵ بێ و هەندێکی بڵ بێ... کتێب بە بابەتە.. بە گەورەو بچووکیش نییە... جا توخوا پەرەکانیان بۆ گوڵە بە رۆژە فرۆشتن بە کار بێنی، بە چارەکە دینارێ ئەو جۆرە کاغەزەت دەست دەکەوێ؟.
- حەز دەکەی مەفرۆشە...
- راستیت دەوێ لەبەر پێویستی نایان فرۆشم.. بەڵام تۆ خۆت دەزانی ئەمرۆ پیاو: "کەر کوڵ و بار سووك" بێ چاکترە... لەبەر ئەوەیە...
- ئەی ئێمەش نابێ قازانجێکیان لێ بکەین..
- لە کتێبدا زەرەریش بکەی هەر قازانجە...
- ئەوە قسەی شاعیرانە.. بابێن بازار ببینن...
- کاکە ئەوەی پێ ناوێ... سێ سەد دینارم بدەرێ و هیچ قسە مەکە..



کابرا لە دڵ خۆیدا دەیوت: ئەوەی من نیازم بوو وا نەهات لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مێرد منداڵەی کە لە تەکیا بوو بانگی کرد کە کتێبەکان بخاتە ناو پیکابەکە... خۆی باوەشێکی فڕێ دایە ناوی، بارام کە دی وا بەبێ حورمەتانە ئەو کتێبانە دەخرێتە ناو ئەو پیکابەوە، پێی وابوو ماڵەکەی تاڵان کراوە و منداڵەکانی بە بەرچاوی خۆیەوە ئەنفال دەکرێن .. لەگەڵ ئەوەشدا قەرزاری و نەبوونی پیاو لە پیاوەتی دەخەن...

کابرا سەد دیناری بۆ بارام ژمارد و وتی:

- ئەوە بگرە...

بارام سەیری کرد و وتی:

- ئەمە چەندە!؟..
- ئەوە جارێ سەد دینار.. هەر ئیستا دوو سەدەکەی ترت بۆ دێنم...
- نا.. کاکە وانابێ.. یەك دیناری کەم بێ وەری ناگرم...
- پێم نییە.. هەر ئیستا دەڕۆم بۆت دێنم...
- شتی وانییە...

کابراکە زانی ئەو فێڵەی بۆ نەچووە سەر، داوای لە مێرد منداڵەکە کرد کە ئایا پارەی پێیە!.. ئەویش وتی:

- بەڵێ، هەندێکم لایە...
- بزانە چەندە...

منداڵەکە وا فێر کرابوو کابرا داوای هەر برە پارەیەك بکات ئەو لە نیوەیدا لێی بدات.. بۆیە وتی چەندت دەوێ؟.

- دوو سەد دینار..

منداڵەکە لە ناو پیکابەکەدا هەندێ خۆی خجڵ کرد و وتی:

- تەنها سەد دینارم لایە..

بێنە، ئێستا دەڕۆین سەدەکەی تریش دێنین... بارام یەکسەر بەرپەرچی دایەوە و وتی:

- دەڵێم یەك دیناری کەم بێ نابێ...

کابرا بە شێوە نیگەرانییەکەوە وتی:

- کەم نابێ، نا... بۆ ئەوەندە بێ متمانەی...
- نا.. مەسەلە متمانە نییە.. مەسەلە کتێبە، کتێب بە قەرز و قۆڵە نەفرۆشراوە...

کابرا سەرێکی راوەشان و داوای لە مێرد منداڵەکە کردەوە...

- کوڕە دابزانە لە ناو دیشپول و ئەم لاو ئەولا دا سەد دیناری تر پەیدا ناکەی...

منداڵەکە هەندێ تر لە ناو پیکابەکەدا خۆی خجڵ کرد و وتی:

- سەد دینارەکەی ئەو کابرایە هەیە.. ئەمانەتە!..

- بیهێنە...

منداڵەکە ئەو پارەیەشی هێناو کابرا هەمووی سەفتە کردن و دانی دەست بارام.. ئەویش هەمووی ژمارد و دەرکەوت دە دیناری کەمە... بارام وتی:

- براله دە دیناری کەمە!..

کابرا بەبێ ئەوەی بیژمێرێ و دڵنیا بێ کە وایە یان نا.. راستەوخۆ وتی:

دیارە کابرا ئەو ئەمانەتەی داوینەتێ دە دیناری کەم بووە...

- من حەقم بەوەوە نییە، من سێ سەد دیناری خۆمم دەوێ...

کابرا چاوەڕوانی شتی وای نەکرد بوو، پێی وابوو ئەویش وەك خەڵكانی تر هەر لە خوای دەوێ لە کتێبەکانی رزگار بێ... تۆزێ راماو بە سەیرەوە تەماشای بارامی دەکردو پیا ورد دەبووەوە، کە زانی وەك پایەی کۆنکرێت وایە ناچەمێتەوە، وتی:

- ئەی چارە؟.

بارام زوو هاتە دەم وتی:

- چارە هەیە..

- وەك چی..

- دەست بە ناو کتێبەکاندا دەگێڕم کتێبێك گل دەدەمەوە، با ئەو کتێبە بۆ من بە دە دینار بێ...

کابرا وتی:

- لاریم نییە...

بارام کتێبەکانی خۆی وەك منداڵەکانی خۆی دەناسین، نەك هەر بە چاو بەسەر پەنچەش لە یەکی جیا دەکردنەوە، دەستی بە ناویدا گێڕا و کتێبی ( مێژووی شەرەفخانی بەدلیسی) دەرهێنا، بەبێ ئەوەی ناوی بە کابرا بڵێ وتی:

- قەید ناکا با ئەمەت بۆ بە دە دینار بە من فرۆشتبێتەوە...



کابرا سەرێکی راوەشان و سولفی پیکابی لێدا و بەبێ خوا حافیزی تێی تەقان.. بارام پارەکانی بەسەر نووکی پەنچە گرتبوون، پێی وابوو لە جیاتی سامانێکی گەورە پیساییەك خراوەتە ناو دەستی و یەك تفی لێ کردن و وتی:

- ئەگەر پێویستی و تەنگانە نەبێ بۆ پەڕەیەك لەو کتێبانە بە هەموو ئەم چڵكی دەستە دەدەم...

شلێری کچی کە زانی باوکی لە بارەیەکی دەروونی تەواودا نییە. بە هێمنی لێی چووە پێشەوە و وتی:

- ئەو هەموو کتێبەت بۆ دا بەو کابرایە؟..

- فرۆشتم..

- بە چەند؟!.

- بە سێ سەد دینار.

- سێ سەد دینار!؟.

- بەڵێ بەوەندە.

- چۆن پیکابێ کتێب بەو بڕە پارەیە.

- کچم پێویستی دەردێکی گرانە.. ئەمڕۆ کتێب نە مرۆڤ تێر دەکا، نە مرۆڤ گەرم دەکاتەوە.

- چۆن وا دەڵێ!؟.

- ئەمڕۆ وا دەڵێم و بڕایەوە...

شلێر حەزی نەکرد لەسەری بڕوا.. لە دڵی خۆیدا دەیوت:

خۆزگا ئێمە دەمردین نەك ئەو کتێبانە بەو جۆرە بچنە دەرەوە...

بارام بەوە دڵی خۆش بوو کە شانی بۆ کابرای کتێب کڕ شل نەکرد بازی بە سەردا بدات...

پارەکانی بۆ شلێر راگرت و وتی:

- تۆ بگرە...

- چی بگرم!.. مەرج بێ ئەو پارەیە بە هەر شتێ بدرێ تامی لێ نەکەم.. تکایە ئەو پارانەم پیشان مەدەن!.

بارام هەڵوێستەکەی شلێری کچی لای کاریگەر بوو، تا ئەو ساتە نەیدەزانی کتێب لای ئەندامانی خێزانەکەی ئەوەندە ئازیزن. لەهەمان کاتدا خۆی چەند بە داخ بوو بۆ فرۆشتنیان، وتەکەی شلێری کچی پەردەی دڵی بەو داخەوە سووتان، بۆیە بە حەسرەتەوە وتی:

- تازە فرۆشتوو من.. تکایە ئازاری گیانم مەدەن...

شلێر کە زانی تازە کارەکە کراوە بڕاوەتەوە، ئەوەندە لەسەری نەڕۆی هەر ئەوەندەی وت:

- بابە گیان ماڵی بێ کتێب وەك گۆڕی تەنگ و تاریکە...

ئەو قسەی شلێرە تەنها بۆ ئەوە بوو بە باوکی رابگەیێنێ، ئەویش دەزانێ ماڵی بێ کتێب وەك ماڵی چۆڵ واهایە...

بارامیش بۆ دڵنیایی ئەو وتی:

- بەڵێ... بەڵێ وایە.. بەڵام ئەگەر رۆژێکی تر هاتەوە هەموویان دەکڕمەوە... دڵنیابە هەموویان دەکڕمەوە...

پارەکانی لەسەر لێواری پەنجەرەی هەیوانەکە دانا و بۆ خۆ گۆڕین چووە ژوورەکەی تر...

شلێر رووی کردە خوشك و براکانی و وتی:

- کەس دەست لەو پارەیە نەدا... مەرج بێ بە دایکیشم دەڵێم ئەوەی بەو پارەیە بکڕدرێ لە ئێمە حەرامە.. فرۆشتنی ئەو کتێبانە لە مردنی پوورە خونچە کەمتر نەبوو...

منداڵەکانی تر تەماشای یەکتریان دەکرد و قسەیان نەدەکرد، وەك بەزمانی حاڵ بڵێن:

بۆ وا لە خۆڕا، خۆی هەڵ دەقورتێنێ ناو ئیش... دەزانێ باوکم پێی ناخۆشە فرۆشتونی و ناچاری پاڵی پێوە ناوە، یان دەیەوێ خۆی شیرین بکات.. ئەگەر وانییە؟ ئەی چییە؟

بارام تا ئەو کاتە نەیزانیبوو منداڵەکانی ئەوەندە دڵیان بەو کتێبانەخۆش بووە، ئایا لەبەر ئەوە بوو ببوون بە زینەتی ماڵەکەیان و بەڵگەی رۆشنبیریان؟... یان لەبەر ئەوە بوو هەر جار مامۆستاکانیان کە داوای راپۆرتێکیان بکردایە ئەو کتێبانە وەك فریاکەوتەیەك وابوون بە هانایانەوە دەهاتن، هەر جۆر بێ کچە گەورەکەی، سەر زەنشتێکی وای کرد ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پەشیمانی بۆ پیاوێکی وەك ئەو کارێکی باش نەبوو لەوانە بوو دەست بەجێ بە شوێن کابرادا دەڕۆیشت و سەوداکەی بە تاڵ دەکردەوە، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە و شتەکە بووە... پێشی جوان نەبوو بە شێوەی تەمسیل وا بکات.. بکەوێتە شوێن کابرا... تا بزانێ شلێر بە دڵ ئەو قسانەی دەکرد، یان دەوری پەریخانی دایکی دەبینێ، کە هەر کارێکی بکردایە دوای جێبەجێ بوونی رەخنەی لێ دەگرت و جۆرە نازێکی لە دوو تۆی رەخنەکەیدا دەنواند...



با قسەیەکیش لەم لاوە بکەین: ئەی قەرزەکەی مارف ئەفەنی چۆن بداتەوە؟ وا ئێستا دەیەوێ بۆ ماڵی خونچەی رەحمەتی... پارەی کفن و ئەسپەردە کردنی خزمان دەیدەن، ئەی ئەو لە ناویاندا سەر دابخات؟ ئەوە بۆ ئەو چەندی بە چەندە؟!..

بارام سێ سەد دینارەکەی خستە باخەڵی و منداڵەکانی ئاگادار کردەوە کە دەیەوێ زوو بگاتە ماڵی خونچە و ئامادەی جەنازەکە بێ.

خۆی تەیار کرد و بە پەلە بۆی دەرپەڕی.

لە رێدا بەرمیلەکە و دزینی پارەکە و هەڵوێستی برادەرە فەرمانبەرەکانی و فرۆشتنی کتێبێکان و لۆمەی شلێری کچی و مردنی خونچەو وردە شتەکانی تری ئەو رۆژە ناو هۆش و دەروونیان کرد بوو بە دارستانێکی خەیاڵاوی چڕ ئارەزووەکان تیایدا واڵا دەبوون و هەموویان بەرەو چوون بۆ ماڵی خونچە و پرسە دانان پەلکێش دەکران و دەکەوتنە شوێن ویستی بەتینی بارام.. بەگۆڕ دەرۆیشت و ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە، توشی مەلا جەبار بوو، ئەویش بەرەو خوار شۆڕ دەبووەوە، مەلا جەبار یەکێك بوو لەو کۆنە فەقێیانە کە وازیان لە مەلایەتی هێنابوو، خۆیان کرد بوو بە مامۆستای سەرەتایی و چاکەت و پانتۆڵی رۆژ ئاوایی لەبەر دەکرد و ببوو بە ئەفەنی، بۆ دەرەوە وا بوو لە نێوان ماڵی خۆیان و مزگەوتدا کەواو سەڵتەی مەلایانەی لەبەر دەکرد و دەچووە نوێژکردن ، زمانێکی لووسی هەبوو، بیست و چوار ساتە گلەیی دەکرد و کەسی بەباش نەدەزانی و لەسەر یەك بار نەبوو، لەسەر قەرز و قۆڵە دەژیا و لە هەموو کەس پارەی قەرز دەکرد، دەرفەتی قەرز کردنی نەدەبوارد.

لە هووشە کردن و قسە هەڵبەستندا وێنەی کەم بوو، ئەوەی نەی ناسییایە زوو بڕوای پێ دەکرد.

بارام ویستی لێی تێپەڕێ... مەلا جەبار هاتە دەم:

- کاك بارام وای لێ هات مەرحەباکەش نەمێنێ!...

- کاك مەلا تۆزێ پەلەمە و دەمەوێ زوو بگەم...

- هەر دەگەینێ، بۆ وا بە پەلەی!...

بارام نەیویست پێی بڵێ بۆ سەر پرسە دەچم، نەبادا مەلا جەبار خۆی بخاتە تەکی و لەوێ لێی تێك بدات، بەڵام ویستی رای وەربگرێ کە فرۆشتنی کتێب لەو رۆژەدا چی دەگەینێ وتی:

- کاك مەلا ئەمرۆ کتێبەکانم فرۆشت.

- داتن بە چەند!؟.

- شەش سەد دانە کتێب بە سێ سەد دینار...
- سێ سەد دینار باشە!.
- باشی چی!.... نرخی نیو فەردە ئاردە...
- بەس نییە تۆ کتێبت هەبووە داوتە بە سێ سەد دینار...
من وا خێزانەکەم دەیەوێ ملوانکە زێڕەکەی بفرۆشێ دەزانی چەند دەکات؟..
- ؟
- دە مسقاڵ زێر دەکاتە نزیکەی (50) هەزار دینار بابیفرۆشین وەرە چەند دەڵێی بە قەرز وەرگرە...

وای وت و بارام تێگەیشت جەڵەوی باسەکە بەلای چیدا رادەکێشێ... بۆیە زوو وتی:

- سێ سەد دینارەکە هەر ئەو ساتە وەك بلْقی سەر ئاو هاتوچوو... وای وت و شریتی قسەکانی مەلا جەباری خاو کردەوە، ئەگەر بارام وا زوو فریای خۆی نەکەوتایە بەرگەی دەم لووسی مەلا جەباری نەدەگرت، ئەوەش قەرزی پێ بدایە بە خەونیش چاوی پێ نەدەکەوتەوە...

ئەویش کە زانی باسەکە بە چ لایەکدا لارە سەنگ بوو، باسی فرۆشتنی زێڕەکانی قووت دایەوە، تا باسی سێ سەد دینار لە گۆڕێ بوو دڵی بارامی پێ خۆش دەکرد، کە بوون بە بلْقی سەر ئاو لەو سەرەوە بە قولاپ هێنایەوە و دڵی تەنگ دەکرد و دەیوت:

- چما وا دەزانی ئەو کتێبانە دەبرێنە ناو کتێبخانەکان لەسەر رەفەیەکی جوان وەك بووکی رازاوە بۆ فرۆشتن دادەنرێن؟!...

نە... ئەوانەی کتێب دەکرن کۆمەڵە مافیایەکن، ئەو کتێبانەی بۆنی شتێ بدەن، یان باسی ئایین بکەن دەیبەن دەیانسووتێنن، ئەو کتێبانەش وا نەبن دەیانکەن بە کیسە بۆ گوڵە بەرۆژە فرۆشتن!...

کە وای وت کزیەك بە جەرگی بارامدا هات، پێی وابوو منداڵەکانی ئەنفال کراون لە کارگە کیمیاویەکانی بەعسدا گازی کیمیاوییان بە سەردا تاقی دەکرێتەوە.. لە دڵەوە ئاواتی بوو بیان سووتێنن نەك بیانکەن بە کیسە بۆ گوڵە بەرۆژە...

مەلاجەبار کە ئەو قسانەی دەکرد بارام لە دڵەوە دەیوت:

- ئەو مردوو مراوە چۆن ئەو شتانە دەزانێ.. ئەم مردوو مراوە رۆژانە ئەوەندە دەگەڕێ، گوێی لەچی دەبێ هەمووی لە مێشکی خۆیدا خڕی دەکاتەوە،سەروبنیان بەیەکەوە دەبەستێ و وەك حکایەت دەیانرێسێ و بۆ خەڵکیان دەردەداتەوە... بە زاتی خوا راست دەکات..ئەوە بوو



کابرا بە گەرمییەوە داوای رشتەی مرواری دەکرد... قسەکەی مەلا جەبار ئەو ئەجیایەی لا بەهێز کرد کە دیارە ئەوانە رێکخراوێکی کۆنە پەرستن و دەیانەوێ ئەو کەمە کەلەپوورە نەتەوایەتییەمان کە لەم دوایەدا بوژایەوە سەر لە نوێ بەربادی بکەن و بە تەواوی رووتمان بکەنەوە، ئاخ ئەم جرج و سیسرك و مشك و پشیلە سپڵانە کە راپەڕین لانەی لێ تیك دان، ئەمرۆ هەموو وەربوونەتە ناو بازاڕ رووخاوەکە... هەتا شۆڕش و ڕاپەڕین مەستی سەرکەوتن بەریان دەدات و بەهۆش خۆیاندا دێنەوە، ئەو جانەوەرانە، دەغزداری دەکەن.

تا ئەو ساتەی لە مەلا جەبار دابڕا بارام هەر ترسی ئەوەی هەبوو مەلا رووی پارە قەرز کردنی لێ بنێ، کارێکی باشی کرد کە پێشەکی ئەو دەرگایەی لە روویدا رەپێش کردبوو... کە لێی جیابووەوە هەنگاوەکانی بەگورتر کردن و بەرەو گەڕەکی (کوران) ملی نا... یەکسەر رێگەی بەرەو مزگەوتەکەی تەنیشت ماڵی خونچەی گرتەبەر...

لەبەر دەرگای مزگەوتەکەدا، لەسەر شۆستەکە، کوڕە گەورەکەی خونچە کە تەمەنی نزیکەی پێنج ساڵێك دەبوو لەگەڵ چەند منداڵێکدا کە لە ئازەی خۆیدا بوون کەلاینێی دەکرد، دیارە، بۆیە برابوو بۆ مزگەوت تا وەك گەورەی خێزان بەرامبەر بە پرسەکاران راوەستێ و بەخێر هاتنیان بکات، بەڵام ساکاری و بێ گەردی سروشتی منداڵیەتی بەرەو گەمەکردن رای کێشابوو، لەو بارەی کە بە مردنی دایکی بەسەریا هاتبوو دووری خستبووەوە...

بارام بە لایدا تێپەڕی و نەیویست خۆی پیشانی بدا بۆ ئەوەی لێی تێك نەچێ... ناسیاو و خۆیشان تەرمەکەیان ئەسپەردە کردبوو لەسەر قەبران گەڕابوونەوە و لە مزگەوت پرسەیان دانابوو...

ماوەیەك لە مزگەوت مایەوە لەگەڵ ئەوانەی کە خۆیان بە خزم دەزانی راوەستا و بەخێرهاتنی ئەو پرسەکارانەی کە تاکو تروك دەهاتن دەهێنا، مردن بەلای ئەوەوە دیاردەیەکی ئاسایی و سروشتی بوو، بەڵام مردنی کوردانی بەو جۆرە بەو ناتەسرییە بە بەشێك لە نەهامەتییە گەورەکەی نەتەوەی کورد دەزانی، زۆرینەی ئەو خەڵکە کە دەمردن لەژێر باری مەینەت و کەساسیا دەمردن، مردووەکە خۆی دەمردو و رێگەی خۆی دەگرتە بەر بەڵام داماوی بۆ ئەوانەی پاش خۆی بەجێ دەهێشت، ئەو هەموو منداڵەی خونچە کێ لە مەودوا نازیان بکێشێ و کێ نگابانیان بکات، کوردێ کە دەوڵەتی نەبێ و داموودەزگای سەرپەرشتی لێ قەوماوانی نەبێ، کە لێی دەقەومێ باری خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی..

خونچەی مردوو ئەو ئافرەتە نەبەزە بوو پاش شەهید بوونی یوسفی مێردی شەوی دەخستە سەر رۆژ بە سەر بەرزی منداڵەکانی بەخێودەکردن... وا پەروەردەیانی دامەزراند بوو کە لە دوارۆژدا بتوانن تۆڵەی ئەو کارەساتەی کە بەسەریاندا هات بکەنەوە، بەڵام داخ ئەو ئاواتانەی کە لە دڵیدا بوون مردن و دەرفەتی نەدان کەمێکیان بهێنێتە دی... جگەر سووتاوی ئەو ئافرەتە نموونەیەك بوو لە ئێش و ئازارەکانی ئافرەتی کورد! پاش شەش مانگ لە شەهید کردنی یوسفی مێردی تاکە برایەکی هەبوو کە باوان و کۆڵەکەی پشتی بوو، ئەویش کۆشێ منداڵی هەبوو، بە عارەبانە کەسابەتی دەکرد، زۆربەی رۆژان بەر لەوەی بڕواتەوە ماڵی خۆی خارەتێ کەرەسەی شیو و میوەی بۆ منداڵەکانی خونچەی خوشکی دەبرد، بۆ ئەوەی دڵی منداڵەکانی خۆش بکات دەیوت:

- ئەمڕۆ قازانجێکی زۆرم کردووە، ئەویش بەشی ئێوەیە و رزقی ئەو منداڵانەیە، بەو بەهانەوە شتەکانی دەدانێ، شەش مانگی نەبرد بەعسییە خوێن مژەکان لە جیاتی یەکێك لەو زیندانیانە کە هەڕایان کردبوو ناوی خدر بوو، ئەویان گرت و خستیانە شوێنی و لە دوایشدا لە سێدارەیان دا، گوایا ئەوەی کە لە دەستیان هەڕای کرد بوو هەمان ناوی ئەوی هەبوو.. کورد هەر کوردە، چ ئەم بێ، چ ئەو!!.

چەند هاواری کردبوو

- خوا هەڵ ناگرێ من هیچ شتێکی وام نەکردووە و هیچ گوناحێك لە خۆم شك نابەم!. وتبوویان ئەی تۆ ناوت خدر نییە!

- بەڵێ ناوم خدرە، بەڵام ئەم ناوە چ گوناحێکی هەیە؟!.

لەسێدارەیان داو نەیزانی لەبەر چی!

بە نەمانی خدری برای خونچەی رەحمەتی بە تەواوی پشتی شکا... بارام لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- بەڵێ خونچە دەردەسەرییەکانی خۆی لەگەڵ مردنی خۆیدا پێچایەوە و بردنی ناو گڵ، بەڵام ئەوەندە و خوا هەڵناگرێ پتریش بۆ منداڵەکان بۆ پەریخانی خوشکی بەجێهێشت...

بارام پاش هەڵسانی پرسەی ئەو رۆژە و نزیك بانگی مەغریب خۆی گەیاندە پەریخانی ژنی، ئەوەندە کزو مەلوول بوو لە ناخەوە دڵی بۆ سووتا وەك ئافرەتێکی هەتیوبار هاتە پێش چاوی، ناحەقیش نەبوو، نەك لە رۆژێکی وەهادا بەڵکو لە رۆژی ئاسایشدا سێ چوار منداڵی بێ کەس و کار، کارێکی ئاسان نەبوو، هەر لە ئێستاوە بۆنی دایکیان لە پووریانەوە وەردەگرن...



پەریخان هاتنەکەی بارامی گەلێ پەسەند بوو چونکە ئامادە نەبوونی لە کاتی ئەسپەردە کردندا لەکەیەك بوو بۆ ئەو، لە ناو ژناندا وای پینە دەکرد کە گوایا نەیزانیوە و کەس نەبوو پێی بڵێ، بە ئاستەم لە بارام هاتە پێشەوە و ویستی ئەنگوستیلەکەی نیشانەی دەزگیرانی دەربێنێ و بیداتێ بۆ ئەوەی بۆی بفرۆشێ، بارام کە زانی مەسەلە چییە، زوو دوو سەد دیناری لەو سێ سەد دینارەی کە کتێبەکانی پێدا بوو بە ئاستەم خستییە دەستی و پێی وت:

- ئێستا ئەوە هەیە، کەی پێویستی کرد هی تر ئامادەیە. خەمت نەبێ تا من مابم ناهێڵم ئەو منداڵانە پەکیان بکەوێت، تۆ خۆت دەمناسی هەموو منداڵانی کورد بە منداڵی خۆمیان دەزانم، منداڵی خونچە لە ئەمڕۆوە تۆ دایکیانی و من باوك...

قسەکانی بارام رووناکییەکی وایان خستە ناو دڵی پەریخانەوە، ئاگری بەردایە خەمەکانی و لە ناخەوە هەڵیان تەکاند“ پرمەی گریان و هەنسکدانەکەی دووکەڵی رەشی خەمە سووتاوەکانی بوون.

لێوە لەبار چووەکانی بەو رووناکی قسانە گەشانەوەوە و بریقەیان لە ناوچاوە خەماوییەکانی دایەوە...

لەو رۆژانەدا خەڵکەکە نەریتێکی جوانیان بۆ ئەو جۆرە بۆنانە داهێنابوو، یەکێك کە دەمرد هەموو ناسیاو خزمان خەرجییەکانی کفن و دفن و پرسەی سێ رۆژەیان دەخستە سەر ئەستۆی خۆیان، هەر کەس بە قەد توانای خۆی بەشداری دەکرد.. نان و خواردنی بەیانیان و نیوەرۆیان و ئێواران لە ماڵی مردووەکە ئامادە دەکرا...

پیاوە چڵێس و ئافرەتە نەوسنەکان لە رۆژێکی وەهادا دەرفەتی خۆیان دەقۆزییەوە و سێ ژەمە خۆیان تەسەل دەکرد، تێر دەمیشیان لە چەرخی قسەی پڕوپووچ دەدا... خواردنێکی زۆر ئامادە دەکرا، بۆنی خواردن و چڵپ و لێس و دەنگی قاپ و قازان ششتن لەگەڵ دەنگی منداڵ و مێرد منداڵ و هاتووچوو و تێکەولێکەدا تێکەڵاو دەبوون، ئەوەی نەیزانیایە ماڵە پرسەیە پێ وادەبوو زەماوەند و خەنەبەندانە و تازە کۆتایی هاتووەوە...

لەو رۆژانەدا هەندێ رێکخراو پەیدا ببوون لە ژێر پەردەی ئایین و تازیەدا ژنانیان دەنارده ناو ئەو ئافرەتانە کە لە ماڵی مردووەکە دا پرسەیان دادەنا، ئەوانە نەیان دەهێشت کەس و کاری مردووەکە دووکەڵی خەمە پەنگ خواردووەکانیان بە فرمێسکی چاوەکانیان کپ بکەنەوە و ناو هەناوی خۆیان پاکژ بکەنەوە، بەڵکو بەناوی خواوە دەستیان دەکرد بەگێرانەوەی سەربوردەکانی

مەڵکەمووت و جونجەڵۆت.. بەو جۆرە سەریان لە بیر و هزریان دەشیوان وەك کوندەی پف دراو پڕ لە تۆزی ژەهراویان دەکردن!...

پیاوەکانیش نیوە ڕوان و ئێواران دوای پرسەی ناو مزگەوت مەلا و قورئان خوێنەکانیان دەخستنە پێش خۆیان و دەچوونەوە ماڵە مردووەکە... قۆڵیان لە بەلەمە برنج دەماڵییەوەو کەوچکیان بە ناو شلەی پڕ بە گۆشتدا دەگێڕا، برسیەتی مردووەکەیان بە پڕ کردنی ورگی خۆیان دادەمرکاندەوە، ئێسکی چەوری ناو شلەیان دەردەهێنا و دەیانکرِاندنەوە و مۆخەکەی ناویان بە چێژەوە هەڵ دەمژی، ئەوجا بەلچکی پشتێنەکانیان دەمی خۆیان دەسڕیەوە، دەستیان بە سمێڵیاندا دەهێناو، سوپاسی خوایان دەکرد و رەحمەتیان بۆ مردووەکە دەنارد، قورقی زلی زلیان دەداو خۆیان مڕ دەکرد، لە دوایشدا فاتیحەیەکیان بۆ مردووەکە رەوانە دەکرد...

بارام نە لەو جۆرە دانیشتانەدا بەشداری دەکرد، نە ئەو نانەی دەخوارد، چونکە لای وابوو کڕانەوەی ئێسك و لاق و پەراسووی ئەو مەڕ و بەرخەی کە بۆ نانی ئەو پرسەیە سەر بڕابوون هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ لاق و لە تەری مردووەکەدا نییە، هەر ئەو گۆشت و ئێسکەیە... لەو کاتەدا مردووەکەی لە گۆڕدا دەهاتە پێش چاو... لە ناو گۆڕەکەدا بابۆڵە گۆشتێکی فڕێدراو بوو کە مێرووله و مار و جڕ و جانەوەر سەری تێ دەکەن، گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە خواردوونی و بەزەیی پیایاندا نەهاتووەتەوە، دەبنە کرم و تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە، ماوەیەك لەسەری دەژین، دوریشی بۆ مەڕۆ کە بە زمانی خۆیان سوپاسی ئەو خوایە بکەن کە ئەو لاکە چەورەی بۆ ناردن، ئەو مار و مێرووانە بەو ئازووقەیە خۆیان قەڵەو دەکەن و لە دوایشدا خۆشیان دەمرن و دەبنە خۆراك بۆ هی تر لە کۆتاییدا هەموویان لە ناو گۆڕەکەدا تێکەڵاو بە خۆڵەکە دەبنەوە... ئەمە گەمەیەکی ئەزەلییە و هەموو زیندەوران لێی بەدەر نین، فرمێسکی هەموو دنیا و نزای هەموو ئایینەکان کاری تێ ناکات...

هەندێ لە خزمان داوایان لە بارام کرد بۆ نانی شێوان لەگەڵیاندا بێ، ئەو بەهانەی ئەوەی دەهێنایەوە کە ماڵەکەی لەکەنارە و منداڵەکانی کەسیان لا نییە، ئەوانیش زوو بەهانەکەیان لا رەوا بوو، چونکە لەو رۆژانەدا، دز چوو بوونە ماڵی هەندێ کەس خاوەن ماڵەکەیان لەبەر چاو منداڵەکانیەوە کوشتبوو، ئەو جۆرە رووداوانە ناو هەناوی گەورە و بچووکی شارەکەیان هەژاند بوو،دیار بوو ئەو جۆرە تۆقینە بۆ ئەو بوو، کاربەدەستانی دەسەڵاتی کورد تووشی پەشۆکاندن بکەن و سەریان لێ بشێوێنن و نەتوانن جڵەوی یاساو و ئاشتی بە دەست بگرن، ئەو کاتە دوژمن بیکات بە بەڵگەی پڕوپاگەندە پیسەکانی کە گوایە کورد توانای حوکمڕانی نییە!...



جگە لەوەی بەهانەکەی بارام لە جێی خۆیدا بوو، بەڵام راستییەکەی ئەوە بوو، ئەو حەزی لەو جۆرە دانیشتانە نەبوو، دەبوو پاش نان خواردن، قسەی پواو و رزاوی چەرخەکانی رابردوو بێننە پێشەوە و ئەویش سەریان بۆ بلەقێنێ و درۆ لەگەڵ ویژدانی خۆیدا بکات...

پاڵدانەوە و هەڵسانەوەی بێ ماناو راموسان و دەستگوشین و گوێ گرتن لە چیرۆکی پواوی هەزاران جار بیسراوی لای عەرەبستان و ناو هێنانی، حەیسە کوت و زەنزەلووت و درۆی زل زلکردن بە ناوی خوای گەورەوە... ئەو شتانە لە مێشکی بارامدا جێیان نەدەبووەوە و وەری نەدەگرتن، خوایینی لەسەر ئەو جۆرە شتانە نەدەکرد، کەچی خەڵکی تر رۆژی دەجار گوێیان لەو شتانە دەبوو جار دوای جار پێی چاخ دەبوونەوە، پێی سەیر بوو چۆن لێی بێزار نەدەبوون!...

هەر ئەو جۆرە بیروڕایانە بوون وایان لە بارام کردبوو، لە خەڵك دوور بکەوێتەوە و خەڵکیش لێی تێنەگەن....

***

هێشتا تاریك دا نەهاتبوو، بارام خۆی گەیاندە وێستگەی پاسەکان گەلێ چاوەڕوانی کرد ئەوەی نەدەزانی کە کات گەیشتە ئەو ساتە پاسەکان دواییان دەهات، دوا پاسیش کە دەمایەوە بەپەلە نەفرەکانی هەڵدەڕشتن و بەرەو گەراج دەبوونەوە...

تەماشای زەردەپەری رووی ئاسمانی کرد، هێشتا کاڵ نەبوو بووەوە لەوا بوو یەکێك لە پاسەکان بە گوڕ و لرخە لرخە هات، وا پێ نەدەچوو لەو وێستگەدا کە بارامی تیا راوەستا بوو بوەستێ، کە بارام هەستی بەوە کرد، چووە ناو شەقامەکە و بە پەرۆشەوە دەستی راگرتنی بۆ دەتەکاند...

پاسەکە تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە بارامی لێی دەهاتە خوارەوە، تاریکی لەبەر بێ کارەبایی باڵی بەسەر شارەکەدا کێشاو، شەقامەکان لە ناو تاریکی دا تواببوونەوە، لایت و گرمەی ئۆتۆمبیلە دوا کەوتووەکان ترسی تاریکییەکەیان جاروبار دەڕواندەوە، چرای ماڵەکان لە پشت پەردەی پەنجەرەکانەوە بە کزی دەسووتا و ترسی کۆڵان و شەقامەکانی دەشکاند.

بارام لەمە دابەزی بەرەو ماڵی خۆی بە ناو تاریکی و بەسەر شوستەکاندا هەنگاوی دەنا... هەستی کرد دوو زەلامی سەر و پرچ دژاو، بە دوایەوەن، تاك و تروکیش خەڵکی بە جێماوی

ئێواران لێرەو لەوێ لەبەر تیشکی لایتی ئۆتۆمبیلەکاندا دەبینران و بە پەلە رێگەی بەرەو ماڵی خۆیان دەبڕی...

دوو زلامەکە لە بارام نزیك بوونەوە، یەکێکیان پاکەتە جگەرەیەکی دەرهێناو جگەرەیەکی بە دەمەوە گرت و پاکەتەکەی بۆ بارام راگرت:

- ناکێشی؟..

نا چاوەکەم... خۆزگە تۆش نەت دەکێشا!...

ویستی ئامۆژگاری بکات بەو مەبەستەی لێیان دڵنیا بێ و وتی:

- جگەرە کێشان وەك مۆرانە وایە، ناو هەناوی مرۆڤ کوناودەر دەکات.

ئەوەی تریان قسەکەی بارامی قرتان و وتی:

- چەرخ، شقارتەت پێ نییە؟..

- کە جگەرە نەکێشم ئیتر ئەو شتانە لای من چی دەکەن!...

ئەوی تریان هاتە دەم و وتی:

- باسی چەرخ و شقارتە بە خراپە نەکەی!...

بارام زانی قسەی ئەو هەتیوە جۆرە هەرەشەیەکی نا بەجێ بوو!

دیارە دەیانەوێ تەشقەڵەیەکی پێ بکەن!... قاچی بەرز کردەوە ئقێکی هەڵکێشا.. وتی:

- ئەو بزمارە چی بوو لە قاچم چەقی!؟.

دانەوییەوە، قوندەرەکەی دەرهێنا و هەندێکی تەکان و دەستێکی بە ناویدا گێرا و وای پیشان دا کە سەرە بزمارێك لە ناو قۆندەرەکەیدا سەری قیت کردووەتەوە، دەستی گێرا بەردێك بدۆزێتەوە و بیکوتێتەوە، دوو زەلامەکە چەند هەنگاوێك لەو لاوە راوەستان و بەوپەڕی ئامادە بوونەوە دەیانڕوانییە بارام،ئەمیش بە تەواوی دڵنیا بوو کە نیازیان خراپە، بیری لەوە دەکردەوە چۆن لێیان رزگار ببێ، لەوەش دڵنیا بوو ئەگەر چەکدار نەبن دەرەقەتی هەردووکیان دەهات.

لە پڕ گەنجێکی شان و باڵ قایم لەسەر سەری راوەستا و بەگەرمی پێی وت:

- مامۆستا ئەوە لێرە چی دەکەی...

بارام بە گەرمییەوە، بەبێ ئەوەی بیناسێ...

- ئۆە.. ئەوە تۆی! یا خوا بەخێر بێی! ئەوە بزمارێك لە ناو قۆندەرەکەمدا دەرچووە، دەیکوتمەوە... راوەستە پێکەوە دەڕۆین... قۆندەرەکەی لە پێ کردەوە و بەردەکەی لە گیرفانی خۆی نا...



وای بوو چوو ئەو پیاوە چاك دەناسێ، بەڵام لەبەر تاریکی وێنای ناکات.. پێی وت:

- بڕوا دەکەی بە دەنگەکەتدا وێنات دەکەم.. تۆ کێی؟!..

- با بڕوێن ئەوجا دەزانی من کێم!...

بە وەرامی کابرادا زانی ئەمەش هەر لە پێڕی ئەو دوو زەلامەکەی ترە، بەڵام هیچ خۆی نەشێواند، بە گفتوگۆیەکی ناسك و رووکەشانەوە بەلای هەردوو زەلامەکەی تردا تێپەڕین و کەوتنە ناو قولایی تاریکییەوە، هەمدیسان بەناوی بزمار کوتانەوە قوندەرەکەی دەرهێناو دەستی کوتا بەردێکی پڕ مووچی کەوتە بەر دەست و هەستی بۆ دواوەی راگرت، زانی دوو زەلامەکەی تر هاتن لەدواوەن، قۆندەرەکەی کوتایەوە، بەردەکەی لە مووچی دەستیا هێشتەوە و دی لەو بەر جادەکەوە پیاوێکی چرا بە دەست بە دەور ئۆتۆمبێلێکی لانکرۆزەردا دەسووڕێتەوە، زوو هاتە دەم و بە زەلامەکەی وت:

- ئەوە بۆ نا فەرمووی بڕۆین بۆ ماڵی خۆمان...

دەستی بەرەو پیاوە چرا بە دەستەکە راکێشا و وتی:

- وەرە میوان بە، لەوێ یەکتر دەناسینەوە..

وای وت و لێی دوور کەوتەوە و، بەرەو کابرای چرا بە بە دەست هەنگاوی نا...

- کابرا فیکەیەکی لێ داو بەرەو دوا بۆ لای دوو زەلامەکەی تر گەڕایەوە.. وا دەرکەوت پیلانەکەیان سەری نەگرت، تەڵەیان بۆ نێچیرێ نابووەوە لەوان هۆشیار تر بوو، وایان دانابوو لەسەر کۆڵانەکەی تردا کەولی بکەن..

***

(7)

پەڵە هەورە گەورەکانی ئاسمان بە پەلە رووی ئاسمانەکەیان دەتەنیەوە و ئەستێرەکانیان راو دەنان و ئەو دەرەوشانەوەیان کە لە قوڵاییی گەردوونەوە رەوانەی سەر زەوییان دەکرد لە پشت خۆیانەوە گلیان دەدایەوە، تاریکە شەوەکەیان خەست دەکردەوە، بارام تا نەچووە ناو حەوشەی ماڵەکەیان و فانۆسە کزبووەکەی لە پەردەی پەنجەرەکەوە هەست پێنەکرد وای دەزانی منداڵەکانی لەوێ نەماون, کە لە درزی پەنجەرەکەوە روانی دی هەموویان لەدەور چراکە گرمۆڵە بوون و خۆیان بەیەکەوە نووساند بوو، دەرگاکانیان لەسەر خۆیان کلۆم کردبوو، کە دەنگی بارامیان بیست هەموویان شڵەژان و لە خۆشیدا خەریك بوو بدەنە پرمەی گریان، لەو خۆشیەدا ئەوەیان لە بیر نەما کە ئەو ئێوارە هیچیان نەبووە بیخۆن، ئەویش بە دەست بەتاڵ هاتبووەوە، ئەوەشیان دەزانی کە لەمە ئێوارە داهات یەك دوکان نامێنێ، نانەوا خانەکانیش لەبەر گرانی نەوت و نەبوونی ئارد لە زووەوە داخرابوون و مشك و پشیلە تیایاندا راو راوێنیان دەکرد، خۆ ئەگەر هەشبووایە، بۆ ئەو سێ زەلامە رێگرە دەرفەتی ئەوەیان دایە بیر لە شت کڕین بکاتەوە؟!...

ویستی دڵی منداڵەکانی بداتەوە، لەو کاتەدا یەکێك بە توندی لە دەرگای دەرەوەی دا.. بارام وتی:

– داخۆ ئەوە کێ بێ بەم شەوە درەنگە لە دەرگا دەدا؟...

وای وت و خۆی ئامادەی ئەگەری بەڵایەکی ناکاو کرد...

منداڵەکانی دەستە داوێنی بوون کە دەرگا نەکاتەوە...

– کێیە؟!... شلێری کچی وای پرسیار کرد...

دەنگێك وەڵامی دایەوە خۆمانین...

دەنگی پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکدا تێکەڵاو دەبوون و دەوترا:

– خۆمانین



– خۆمانین: کێن؟، بارام وای وت بەرەو دەرگا رۆیشت

بارام دووبارەی کردەوە:

– خۆتان کێن!..

– شاسوار...

بارام لەبەر خۆیەوە، داخۆ (ئەحە چەتوون) بەم شەوەدا بۆ هاتووە...

ئەم پیاوە لە ناو خەڵکدا بە (ئەحە چەتوون) ناو دەبرا، بارام نەیدەزانی، ئەو لەبەر چی بە خۆی دەڵێ (شاسوار) و خەڵکیش وای دەناسن... ماڵیان لە کۆڵانەکەی ئەو دیوو بوو، بە خۆی و رەعنای ژنی و دوو کچی و کوڕێکی هاتنە ژوورەوە و ئەحە وتی:

– بەشداری خەمتانین، بەخوا درەنگمان زانیوە دەنا زووتر دەهاتین...

بارام پێشیان کەوت و وتی:

– فەرموون... فەرموون...

ئەوانە خوویەکی ناشرینیان هەبوو، بیانزانیایە یەکێك مردوێکی لێ مردووە، یان گرفتێك یان بۆنەیەکی هەیە، هەر کات بوایە دەچوونە ماڵیان، بە قسەی لووس و مەرایی خۆیان دەکردە بەشداری خەمیان، لەئێوارەوە تانیوەشەو لەو ماڵەدا لاقیان بۆ رادەکێشا و بابەتەکانی قسە سواوەکانی رۆژانەی ناو خەڵکیان خڕ دەکردنەوە و چەند جار لەوێ دووپاتیان دەکردنەوە چی هەبووایە دەیانخوارد و حەلۆشیان دەکرد و کاتێکیش کە دەچوونەوە نەوازشیان بۆ ماڵەکە دەهێنایەوە کە کەم دانیشتن و درەنگ هاتن!..

شلێر باوکی بانگ کردە ژووری ناندینەکەوە و پێی وت:

– بابە ئەمە وەختی هاتنە؟! بۆ دەرگات لێ کردنەوە؟!.

– کچم چی بکەم.. لەمە دەرگام کردەوە خۆیان لە ژوور کوتا...

– ئەمە حاڵە تا نیوەی شەو ناچنەوە...

بارام دەیزانی شلێری کچی کوێی دێشی، بۆیە وتی:

– کچم خۆ نەچووم بە شوێنیاندا و میوانیش دەرنەکراوە، ئەمانە بە ناوی پرسەوە هاتوون... راوەستە با دایکت بێتەوە ئەو کات بزانە چۆن دەکەوینە ناو دەست و پێیان... چۆن هەڵ دەتەکێین...

– جا ئێستا ئێمە چی بکەین؟..

– وەك چی؟..

- نە شەکر ماوە، نەشتێ هەیە...

- ئەوان بۆ پرسە هاتوون.. شەکری چی و شتی چی!..

- دەبێنە لەبەر دەمیان دانێ بزانە قاپەکەشت بۆ نالێسنەوە... بارام دەنگی هەڵبڕی و وتی:

- منیش بۆم دانێن دەخۆم...

شلێر بە تووڕەییەوە وتی:

- بابە دەنگت هەڵ مەبڕە عەیبە.. خۆ دەبێ بەلای کەمیەوە چاییەکیان بۆ لێ بێنین...

- پەنا بە تۆ خوایا!... دەبزانە شتێك نییە...

- گۆڵە چاییەکمان هەیە بۆ بەیانی هەڵمان گرتووە، ئێستا لێی دەنێم، دەبێ هەر ئێستا بڕۆی کیلۆیەك شەکر لە دوکانەکەی (حاجی سەلیم) بێنی...

- جا بەم شەوە دوکان کوا ماوە...

- بدە لە دەرگا لە حەوشەوە دوکان دەکەنەوە و دەتدەنێ...

ئەحە چەتوون مامۆستای سەرەتایی بوو، یەکێك بوو لەو مامۆستایانەی کە دائیرەی پەروەردە گیری بە دەستیانەوە خوارد بوو، گواستنەوە و کەمکردنەوەی مووچە و نەدانی سەر مووچە و سەرنج راکێشان و سەرزەنشت هیچ لەو سزایانە ئەویان لەسەر پێچی کردن و فێلبازی راست نەکرد بووەوە...

ژنەکەی ( رەعنا) ئافرەتێکی زۆر بلێی و خۆ هەڵکێش و ژەم رابردوو بوو، خۆی وا پیشان دەدا ماینێکی پاکیزە و چەمووشە بە کەس دەستەمۆ نابێ، کەچی بەیەك نیقورچ دەکەوتە ناو دەست و پێ، لەلای یەکێکی وەك بارامی بەرێزدا خۆی وا دەنواند کە لە کاروباری ئافرەتان نازانێ، لەگەڵێ شوێن و دانیشتنی ژناندا وتبووی بارام پیاوێکی فەقیرە و دەست نوێژ ناشکێنێ واتە لەسەر کۆشی بنو ترست نەبێ، هەر چەند پەریخانی ژنی بەو وتەیە سەخڵەت نە دەبوو، بەڵام بارام قسەکەی پێ تیرێکی ژەهراوی بو لە پیاوەتی ئەو دەدرا، ئەوەی رێز لە ناموسی هاوسێیان بنێ پیاوێکی مەرد و یارایە، نەك فەقیر و بێ دەسەڵات، بارام لە زووەوە دەیناسی و گەلێ شتی لەدەم بلە چوکلی برادەری ئەحە چەتوونی مێردییەوە بیستبوو، کە هەردووکیان، واتە ئەحە و چوکل کە دوور خرابوونەوە بۆ باشووری عیراق، سەر دەمێکیش ئەم رەعنا خانە لە یەکێتی ئافرەتانی زەمانی داگیرکەر دەستێکی باڵای هەبوو، یەکێك لە خزمەکانی بارام لەو سەردەمەدا سەرپەرشتکاری ئەو رێکخراوەی دەکرد، بۆ دڵنیا بوون لە قسەکانی بلە چوکل پرسیاری لە بارەی رەعناوە لێ دەکرد، ئەویش بەبێ پەردە شتەکانی ئەوی بۆ دەگێرایەوە...



کەچی لە حزووری بارامدا خۆی هەڵدەکێشا و سەرجەم قسەکانی بە دەور داوێن پاکی و ئادگار و رەوشت باشی دا دەسووڕانەوە...

زۆر جاریش بۆی ریکەوتبوو نیقورچێکی لێ بگرێ، ئێستا پەشیمانە کە نەیکرد، تا لە شەوێکی وەك ئەم شەوەدا دەمکوت بێ...

بارام لە دڵەوە دەیوت چی قسە دەکات هەموویان درۆن، تەنها ئەو قسەی راستە کە وتبووی: بارام پیاوێکی فەقیرە... وشەکەی بە وەرگێڕانێکی هونەری ( پیاوێکی بێ کارە)ی دەگەیاند، دڵی ئالۆشەکانی لەشی بەو جۆرە دەدایەوە...

ئەحە چەتوون کە زانی بارام، کەوتە ماخۆلان و چپە کردن، بە خاوی پێی وت:

- وەرە دانیشە پێویست بە هیچ شتێ ناکات... توخوا زەحمەت مەکێشن...

بەو قسانەی هانی دەدا، زەحمەت بکێشێ.. بارامیش بەو مەراییە پەست دەبوو هەر ئەوەندەی پێ وت:

- نا... قەی ناکات...

دوکانەکەی حاجی سەلیم بە دەرگای ماڵەکەیانەوە نووسابوو، گۆشەیەك لە حەوشەکەیان دابڕیبوو کردبووی بە دوکان، خەڵکی ئەو گەڕەکە هەموویان لەوێ شتییان دەکڕی، لە ناو حەوشەوە دەرگای چوونە ناو دوکان هەبوو، بەشەوان ئەگەر یەکێك بیویستایە لەپشتەوە دەرگای دوکانیان بۆ دەکردەوە..

بارام لە دەرگای دا..

- کێیە؟..

- بارام...

- فەرموو کاك بارام..

یەك کیلۆ شەکرم دەوێ..

(جوان خان) دەرگاکەی کردەوە، دەم و چاوی وەك مانگ لە ناو تاریکە شەوەکەدا دەدرەوشایەوە... بە زمانێکی شیرین وتی:

- وەرە ژوورەوە.. کەس لێرە نییە.. هەر خۆمم... وتەکەی کەس لێرە نییەی جوان خان،تەوژمێکی کارەبایی بوو لەسەری بارامەوە هات و هەموو لەشی گرتەوە و حەپەساندی، لە خۆی دەپرسی: ئەوە جوانە؟ بە من دەڵێ وەرە ژوورەوە!..

بە دەنگە ناسکەکەی کە وتی هەر خۆمم سیمفۆنییەکی یەزدانی بوو دڵی وەك بانکوت کەوتە لێدان و لە دەفەی ناوەوەی سنگی دەدا...

وشەی (کەس لێرە نییە)ی (هەر خۆمم) ڕێی لەو گومانە بڕی کە مەبەستی ئەوە بێ: بارام لەو تاریکیەدا ڕانەوەستێ بچێتە ژوورەوە...

جوان بە گورجی چرا فانۆسەکەی هێناو دەرگای دوکانەکەی کردەوە کە چراکەی دایە دەست بارام لە ناو کەوانەی دەسکی چراکەیدا دستە خڕپنە نەرمەکانی لە دەستی ئالآند و وەك منداڵێکی ساوای زمان نەکراوەی لێ هات، لەبەر تیشکی چراکەدا خەریك بوو بتوێتەوە، هەستەکانی بارام بەری ویستی بە تینیان گرت و پەردەی ئارەزووی دڵیان هێناو بە تیر ئەندازی چاوەکانی جوان کون کونیان کرد و بەدەور چراکەدا ئالآندیان، جوان زارکی فەردە شەکرەکەی کردەوەو لایەکی دا بەدەستی بارامەوە، بە بەهانەی ئەوەوە کە شەکرەکە نەرژێت دەستی بە بەر کەمەریدا برد و لاکەی تری فەردەکەی گرت... جوان بەبێ هەدەر زیاتر لە کیلۆیەك شەکری کردە ناو کیسەیەکی نایلۆنەوە و دایە دەستی و چراکەی لێ وەرگرتەوە و خۆی پیا نووسان.. هەر ئەوەندە ئاگای لە خۆ بوو چراکەی دەستی کەوتە خوارەوە و کوژایەوە و هەر دووکیان لە ناو تاریکدا نقووم بوون، کیسە شەکرەکەی دەستی بارامیش دیار بوو چمکی لەدەستی ترازابوو، وردە وردە ڕژا بووە سەر قوڵ و قاچی هەردووکیان چەند لەو تاریکییەدا مانەوە... بە تامترین کات بوو، هەرچی ڕووناکی ئەم گێتییە هەبوو هەمووی نەدەگەیشتە چرکەیەك لە چرکەکانی ئەو ساتە تاریکییە..

جوان خان چۆن حەزی کرد چراکە کوژایەوە و فلیمی خەیاڵەکانی نەسووتان هەروەهاش حەزی دەکرد ئەو شەوە بارام لێی جیا نەبێتەوە...

ئالۆش ئافرەتێکی سۆزانی جوانە تا پێی نەگەی بە هەزار چەشنە خۆی بۆت دەڕازێنێتەوە، بەڵام دوای پێی گەیشتنی بێزی لێ دەکەیتەوە...

هەی سەد نەفرەت بۆ ئەحە چەتوون و ژنە دەڵێچەکەی... وا ئێستا لە ماڵەوە پالیان داوەتەوە و چاوەڕوانی دەکەن... بارام وای لە دڵەوە دەوت.. چاوەڕوانی ماڵەوە هێنایەوە سەر خۆی و لە جوان خان خۆی ڕاپسکان و هاتە دەرەوە...

جوان لە حەژمەتی ئەو لەیەك پچڕانە، بەقینەوە دەرگاکەی لە پشتیەوە بە توندی پێوەدا.. حەقیەتی وا بکات لەوەتەی هەستی کراوەتەوە، تامەزرۆی ڕێکەوتنێکی وەهابوو، لەو گەڕەکەدا تاکە پیاو کە بە شایستەی خۆی زانیبێ بارام بوو، ئەو کاتەی کە هەردووکیان لە خانەی



مامۆستایان دەیانخوێند ئەو بەتەمای ئەوەبوو بارام داخوازی بکات، کەچی ئەو دڵی سەرگەردانی لایەکی تربوو، لەبەر سیاسەتکاری ئاگای لە دڵە سادەکەی ئەو نەبوو.. بۆ خوا بڵێین حاجی سەلیم، کە پێی دەڵێن سەلیمە ورگە کەی هاوشانی ئەو بوو، ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ؟!!,

بەڵام بارام بە جۆرێکی تر مەسەلەکەی جوان خانی لێکدەدایەوە:

پێی وا بوو لە داخی حاجی سەلیمی مێردیا وا دەکات و دەیوت:

– کابرا دەوڵەمەند بووە بە شاراندا دەگەڕێت و خۆی بە خوا پەرست دەداتە قەڵەم، جوان دەیزانی ئەو دەمامکەی بۆ چەواشە کردنی ئەوەوە، خۆ ئەگەر باوکی بە پارە بەو کابرایەی نەداباو لە خوێندندا بەردەوام بووایە لەوانە بوو ئێستا پایەیەکی گەورەی هەبوو، خۆی بە شای ژنان دەزانی، ئافرەتێکی بە قیافەت و خانم و قسەزان و جوان، ناوەکەی بە خۆیەوە بوو، بەڵام داخ باوکە چاوچنۆکەکەی بە پارە گۆڕییەوە و ئەوەش ئەنجامەکەیەتی..

جوان زۆر جار لەبەر خۆیەوە دەیوت: حەق بوو شوو بە یەکێکی وەك بارام بکەم، ئەو هاوشانی من بوو.. خۆ لە گوێی گادا نەخەوتبوو تا نەزانێ حاجی مێردی ئەو خێرە پڕ مەرایانە بۆ دەکات، ئەو خێراتە دەکاتە کلینیکسێك ناو نەفەکی شرواڵە پیسەکانی خۆی پێ پاك دەکاتەوە.. دەستی لەگەڵ پیاوە سیاسییەکانیشدا تێکەڵاو بوو، شارە و شار بە بۆنەی بازرگانییەوە دەیاننارد بۆ ئەوەی دەڵاڵیان بۆ بکات، لە گەورەترین ئۆتێلیشدا دەنووست، کە دەهاتەوە تلێپی تەڕی تیا نەدەما و جاروباریش ڕابواردنەکانی خۆی بە ناوی بەد ڕەفتاری برادەرەکانییەوە دەگێڕایەوە، کەچی دەکەن و چی ناکەن، هەر بە منداڵیش فێری بلحی خراپ کرا بوو، ئێستاش هەر بە شوێن ئەو بلحانەدا وێڵە، حەزی لە دوو دەکی و منداڵ بازی بوو.. هەر خوا خۆی بەندەی خۆی دەناسێ... دەزانێ چۆن ڕسوای بکات...

گەلێ جار جوان خان دەستی نزای بۆ بەرز دەکردەوە دەیوت:

– خوایا بە کردەوەی خۆی لەگەڵیا بکەی، وەك چۆنە وا لەسەر حەقیقەتی خۆی دایماڵی.. دیار بوو نزاکانی بە گوێرەی دڵی ئەو گیرا نەدەبوون، بۆیە ناچار بوو بۆ دەرفەت دەگەڕا تۆڵەی خۆی لێی بکاتەوە، هاتنی بارام لەو شەوە تاریکەدا دەرفەتێك بوو جارێکی تر وا بۆی ناڕەخسێتەوە... ئەوەی چەند ساڵ ئاواتی بوو بۆی هاتە دی، بەڵام وەك کسپەی ئاگری ناو تاریکە شەو بوو یەك بروسکەی داو چوو...

بارام شاسواری خەونەکانی بوو.. داخی ئەوە بوو لەسەر ماینی کەحێلی خۆی بە تەواوی دابەزێ تا هەموو راز و نیاز و هەست و نەستە خنکاوەکانی ناو قولآیی دەروونی خۆی بۆی هەلرێژێ..

داخی بارامیش ئەوە بوو مێملێك لە ماڵەوە چاوەڕوانی دەکرد... لەو بڕوایەشدا نەبوو جارێکی تر بەو جۆرە ئەو دەرگایەی بەو ئاسانییە بۆ بکرێتەوە.. لە رێی گەڕانەوەیدا خۆی بە دهۆلێکی دڕاو دەزانی، چەند لە خۆی دەدا تەپەی نەدەهات.. شلێری کچی شەکرەکەی لێ وەرگرت و وتی:

- بابە ئەوە خۆ کیلۆیەك نابێ!.. دەڵێی لێت رژاوە!..

بارام بە دەست سەنگی شەکرەکەی کرد:

- نازانم لێم رژاوە.. یان!؟.

- یانی چی؟... ئەوە بۆ قسەت تەواو نییە؟.. بابە کە چوویت وا نەبووی! ئەوە چیتە؟!

- هیچ نەبووە...

بارام خۆی خڕ کردەوە.. نەیویست شلێری کچی ئەوەندە بیداتە بەر پرسیار، بۆیە هەر ئەوەندەی بۆ هات و وتی:

- مێوانەکان رۆیشتن؟..

شلێر هەستی بە بێ مانایی پرسیارەکە نەکرد... وتی:

- تازە وا خەریکن شوێن گەرم دەکەن...

ئەو شەوە ئەحە چەتوون لەگەڵ رەعنای ژنیا زۆر دوان، یەك بۆ یەکیان دەسەندەوە، تان و پۆ بوون، ئەوەی باسی لێوە نەکرا تەنها باسی پرسە بوو، کەچی بە ناوی پرسەوە هاتبوون، بارام لەوەی لە ماڵی جوان خان گەڕابووەوە، زۆر بە قسەکانی رەعنا و خۆهەڵکێشانەکەی پەست نەدەبوو... بارام کەوتبووە ناو دەریای خەیالآتی جوانەوە،ئەوەندە گوێی بۆ وتە پڕوپووچەکانی ئەحە و رەعنا رانەدەگرت، ئەوانیش جاروبار رایان دەچڵەکاند و بە وشەی (تێگەیشتی) بیری رۆشتوویان دەهێنایەوە..

کە هەڵسان بڕۆن، بە پێوە چارەك ساتێك دوان، لەمە گەیشتە دەم دەرگای دەرەوە، ئەحە رووی کردە بارام و وتی:

- ئەرێ ئەوە لە بیرم چوو بڵێم: ئەمڕۆ بەیانی لە بەنزینخانەکەی ناو بازاڕ لەگەڵ پۆلیسەکاندا قسەت دەکرد خێر بوو؟...



- خێر بوو.. ئەوە بەیانی نەوتمان دەدەنێ، جا بەرمیلەکەم لەوێ دانا...

- لەلای پۆلیسەکان؟..

- بەڵێ...

ئەگەر زوو نەیان دایتێ بە من بڵێ.. کلکی ئەوانە لەدەستمایە، هەموو ساختەچین... ئاگاردار بە بەرمیلەکەت نەگۆڕن.. حەز دەکەی سبەی پێیان دەڵێم.. ئەوانە خۆت دەزانی زۆر خوێڕین...

بارام مێشکی بە قسە پڕپووچەکانی خەریك بوو بتەقێ لە خوای دەیویست بیبڕێتەوە...

پەریخان لەوێ نەبوو دەنا رەعنای ژنی یەك سات لە دەم دەرگادا دووبارە وتە جلفەکانی دووبارە دەکردنەوە...

لە دوا وتەیدا وتی:

- ئەوەشت پێ بلێم... قەت چاك نابێ...

بارام خەریك بوو لە داخاندا شەق ببا و نەیویست سەرە داوی بابەتی تری چەنە دانی بدات بە دەستەوە، هەر ئەوەندەی وت:

ئەوەی لە ناو تاریکە شەودا بێ وا دەبیێوێ.. ئەوەی وت و دەروازەکەی لە پشت پێوەدان و گەڕایەوە ناو منداڵەکانی دی خپ نووستن و، ئەویش لەسەر پشت راکشا و مێشکی خۆی لە هاژە هاژی قسەکانی ئەحە چەتوون پاك کردەوە و پەنای بردە بەر ئەو ئەندێشەیەی کە جوان خان پەردەی ئاسۆیەکی جاویدانی لەبەر دەمدا بۆ هەڵدایەوە، بەلآم ئاسۆیەکی پڕ لە تەم و توالۆی گومان و ئەجیا...

هەستی راگرت، شار بە تەواوی خامۆش نەبوو، دەم نادەم لەم گەڕەك و لەو گەڕەك دەنگی تەقەو و کسپەی ئاگری حەفتاو پێنجی وەك گرمەی هەور و نێزك شەوەکەیان رادەچڵەکاندو ناو جەرگیان دەبڕی و تارمایی کۆڵەکە دوشداماوەکانی کارەبای سەر شەقامەکانی شارەکەیان دەزرنگاندەوە... بە ئاستەم دەنگی ئۆتۆمبێلی ئاگر کوژێنەوە و ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن و هات و هاواری خەڵك تێکەلاو دەبوون.

خەمەکانی بارام و بەرمیل و پارە دزراوەکەی و فرۆشتنی کتێبەکانی و مردنی خونچە و سەردانی بێ مانای ئەحە چەتوون و بۆنی گولآوی جوان خان... هەموویان لەناو هەگبەی خەوێکی ماندوودا خامۆش بوون...

***

ئەو شەوە بارام خەونێکی سەیری دی:"لە خەونەکەیدا تاکە کراسێکی شڕۆڵەی لە بەردا بوو.. کابرایەکی رەشتاڵەی دێزی کەڵبە درێژ و کەتە، لە ناو بەرمیلێکی درێژدا راوی دەنا، تۆبزێکی سەرە ئاسنینی بزمارداری بە دەستەوە بوو، بەرمیلەکە ببوو بە تونێلێکی پێچاو پێچ و ئەوسەری دیار نەبوو، لەناویدا هێلکەی سپی هەڵرێژرا بوون، لە ترسی کابرا هەڕای دەکرد و پێی لە ناو لینجاوی هێلکەی شکا و فلیقاودا دەخزی، هەر چەند هەنگاوی دەنا دەخزی و دەکەوت... بەو تۆمەتەی راوی دەنا دەیوت بیگرن، ئەوە یەکێکە لەوانەی کە تۆپیان بە بۆری بەرمیلە نەوتەکانەوە دەنا.. کابرا پێی نەدەگەیشت، چەند ئەم لە ناو لینجی هێلکە شکاوەکاندا هەڵ دەخلیسکا ئەو دوو ئەوەندە، بەرمیلەکە لە ناوەوە بۆڕییەکی درێژ بوو، لە بانەوە دەسەگیری بۆ دروست کرابوو، نە بارام لەو بیرەدا بوو دەستیان پێوە بگرێ، نەکابرا.. بارام روانییە دواوە دی کابرا کوتەکەکەی لە دەست ترازاوە و بە دەمدا بەسەر هێلکە شکاوەکاندا کەوتووە و دەمرێنێ و هەوڵ دەدا بیگاتێ بەڵام سوودی نەبوو، بارام نەیدەوێرا بگەڕێتەوە دواوە، تۆبزە لە دەست ترازاوەکەی لێ بسێنێ، لەوە ترسا هەڵخلیسکێ و بە سەریا بکەوێ، ئیتر هەر بۆ پێشەوە تەکانی دەدا بەڵام بە تەواوی لە ناو لینجاوی هێلکەی شکاودا شەکەت ببوو، کابراش هەر تەکانی دەدا و دەستی نەدەگەیشتە کلکی تۆبزە لە دەست ترازاوەکەی".

بارام لەخەو راپەڕی، چاوێکی بە دەور خۆی و منداڵە نووستووەکانی دا گێراو گوێی گرت، میکرۆفۆنی مزگەوتەکانی شار فەزای شارەکەیان وەك کەوچك لە ماستاو بدەی دەشڵەقان و دەنگی (الله اکبر) دەگەیشتە کەشکەشانی ئاسمان، یەکێکی ناشارەزا ئەگەر لەو کاتەدا گوێی لێ بووایە لەوانە بوو وای زانیایە خەڵکی ئەم شارە هەموو وەکو پەڕەی گوڵیان لێ هاتووە و پەڕو باڵیان دەرکردووە و بوون بە فریشتە..! پەردەی پەنجەرەکەی لادایەوە، سەیری ئاسمانی کرد ئەستێرەکان لە پشت پەڵە هەورەکانەوە چاوشارکێ دەکەن،و دەبریسکێنەوە و سەما بۆ درختە سووتاو و کەل و کۆچەکان دەکەن و مژدەی چاك بوونەوەیان بۆ دەنێرن.. ئەها لە قوڵایی ئەو ئاسمانە شینەوە پەیامان بۆ دەنێرن و فێری درۆشانەوە و هەوڵدانمان دەکەن، لەگەڵمان نانوون، سەیرمان دەکەن، بزانن چۆن هەوڵ دەدەین، بوونی ئەوان  درۆشانەوە و تیشك ناردنە بۆ ئێمە، بوونی ئێمەش هەوڵدان و واز نەهێنانە... دەنا ئێمە چین و چ مانایەك دەبەخشین، ئاسۆ بۆ بەڕێ کردنی ئەستێرەکان کازێوەی دابوو، ئاسمانەکەش دیمەنی پاکی لە هەور و تواڵەکە دەهێنایە دەرەوە و وردە وردە خۆی ئارایش دەدا.



دیار بوو خۆی بۆ جەژنی نەورۆز ئامادە دەکرد... ئاسمانەکە بە هەموو جوانییەوە، ئەستێرەکان بەو هەموو بزاف و درۆشانەوەیان، دەنگی (الله اکبر) بەو هەموو شکۆمەندییەوە تابلۆی خەونە ناخۆشەکەی بارامیان را نەماڵی، هەندێ هەڵیان پڕوسکان، بەڵام بە تەواوی نەیان سڕیەوە...

ویستی شریتی ئەو فلیمە بەد فەساڵە بداتە بەر تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژ بۆ ئەوەی بیسرێتەوە، بەڵام لە ناخیدا وا چووبووە خوارەوە، تیشکەکە نەیدەگەیشتێ...

خەون و زیندە خەونی وای زۆر دیبوون... لەو رۆژەوە کە داپیرەی باسی (نەکیر) و (مونکیر) و ئەو دەعبا خۆ ملاسداوەی سەر شانی چەپ و عوزائیلی بۆ کردبوو، ئەو دەعبایە خزا بووە ناو خارووی ناهەستی، لە خوار خوارەوە خۆیان حەشار دابوو، هەر دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسایە، سەرە دیقانێیان دەکرد و تێکەڵاو بە خەونەکان دەبوون و خەونەکانیان سامناك دەکردن.

زیندە خەونەکان و رووداوەکانی ژیانی مرۆڤی کورد بەرو پشتی یەك کاڵان، لەو رۆژەوە کە خۆی دۆڕاند بە باڵایدا بڕاوە... هەموو کوردێك ئەو جۆرە خەونانە دەبینن.. راونان و تەعریب و ئەنفال کردن و بەتاڵان بردن و رووخاندن و لەسێدارە دان و گرتن و سووکایەتی کردن و لەوە لاشەوە گۆڕە فشاری  گۆڕی تەنگ و تاریك و بەسەر پردی لە موو باریکتر و لە گوێزان تیژ تر و دۆزەخ و ئاگرو سووتاندن.. زەمینەیەکی بەپیت بوون بۆ تۆقین و چۆکدادان، ئەوانە ژیانی پڕ بە روناکی و خۆشی دەکەنە تراژیدیایەکی سامناك و کارەساتی هەرگیز نەبڕاوە.. تۆ سەیری ناوچاوانی هەر کوردێك بکەی جگە لە سەرسامی و حەژمەت بەو لاوە چیتری تیا ناخوێنیتەوە، چاو نییە پەنگدانەوەی گومێکی کوێرەوەری و ئازاری تیا نەزابێ... ئەو کارە بەد فەڕانە کە نەژاد پەرسەکان دەربارەی خەڵك دەیانکرد دیوارێکی تری وێنەکان بوون کە لەگەڵ دیمەنە سامناکەکانی تردا یەکیان دەگرتەوە و تابلۆی خەونەکانیان تەڵخ دەکرد.. تۆقاندنە تۆقاندنی ئێمە دەردێکە لەوێوە هاتووە.. لەترس زانایانی وەراسەت نەبووایە دەکرا بوترێ: ئەمانە لەو رۆژەوە پێیان خستە ناو وڵاتی ئێمە جگە لە ترسنانەوە شتێکی تریان نەزانیوە هەر بۆ ئەوەش هاتوون، ئیدی ترسەکان وەك رووداوی چیرۆکێکی درێژ لەسەر یەك کەڵەکەیان کردووەو لەوانەشە کاریشیان کردبێتە سەر جیناتی کرۆمۆزۆمەکان، لەوانەشە پشت بە پشت بڕۆن و جێی خۆیان قایم بکەن..

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمەیان لە تاریکی ترسدا لە مەنگەنەی تۆقین داوە، هەرگیزو هەرگیز نامان گەنێ و ئاواتەکانیان نایەتە دی، ئەو رۆژەی کە ئێمە زنجیرەی ئەو تاریکییە دەپسێنین ئەو کاتە حیسابێکی تریان لەگەڵ دەکەین..

## (8)

لەگەڵ یەکەم تیشکی ڕۆژدا بارام بە گورجی خۆی لەبەر کردو دە دیناری لەسەر مێزی ناندینەکە دانا، بۆ ئەوەی منداڵەکانی سەموونی پێ بکڕن، ویستی بەرەو ویستگەی پاسەکان بڕوات، بەڵام کە بیری لە پەنجا دینار قەرزەکەی مارف ئەفەنی کردەوە، زوو ڕووی بەرەو ماڵی ئەوان وەرچەرخاند..

مارف لە ژوورەوە بوو، لە درزی پەنجەرەکەوە زانی (بارام)ە لە دەرگا دەدات.. دڵنیا نەبوو کە قەرزەکەی بۆ هێناوەتەوە، دەنا بە پەلە و بەبێ دواکەوتن بە دەمیەوە دەچوو... لە دوێنێوە مەراقیەتی بزانێ: ئایا نەوتەکەی وەرگرتووە یان نا... ئەگەر وایە... فرۆشتوویەتی یان نا؟...

بەڵام شتێکی لەو بارەیەوە بۆ ساغ نەبووەوە.. لە قوتابخانەش لە قوتابییەکانی خۆی، ئەوانەی کە ماڵیان لە بەنزینخانەکەی ناو بازاڕەوە نزیك بوو دەیپرسی کە ئایا کارمەندانی وەزارەتی مرۆڤایەتی نەوتیان وەرگرتووەوە!...

مەبەستی تەنها ئەوە بوو کە ئایا زوو پەنجا دینارەکە دێتەوە ناو دەستی؟

لەوێشەوە شتێکی وای بۆ ساغ نەبووەوە، خەمی ئەوەی بوو بارام پارەکەی بۆ سەر مانگ دوا بخات...

کە بارام لە دەرگایدا دوو ئەگەری دانا و وتی:

- بارام یان پارەکەی هێناوەتەوە، یان کارێکی تری هەیە...

دڵنیا نەبوو کە پارەکەی بۆ هێناوەتەوە، ئەگەر بیزانیایە وایە وا بە خاوی بە دەمیەوە نە دەهات..

- کاك بارام ئەوە تۆی؟..
- بەڵێ ئەوە منم...
- خێرە...
- خێرە...



وای وت و دەستی بە باخەڵی خۆیدا کرد و پەنجا دیناری لە پارەکانی جیا کردەوە و دایە دەستی و وتی:

- کاك مارف زۆر سوپاست دەکەم.. ماڵت ئاوەدان بێ... مارف کە چاوی بە پارەکەی کەوت لیکاوی خۆشی زایە ناو دەمی.. تەزووی شادمانی چاوەکانی بریقانەوە.. زوو پارەکانی لە بەرکی دزداشەکەی پەساند و وتی:

- جا پەلەی چیت بوو!.. بارام بە پەلە بوو بەرەو ویستگەی پاسەکە ڕووی نا.. مارفیش نەی پرسی ئەرێ نەوتەکەت وەرگرت؟.. فرۆشتوتە؟.. ئەو خەمی پارەکەی لێ نیشتبوو، وا پارەکەی خۆی هاتەوە دەستی و بۆی دەرکەوت بارام پیاوێکی ڕاستگۆیە..

شەوی ڕابردوو بیری لە زۆر شت کردەوە، بۆ ئەوەی گومان نەکەوێتە ناو ئەو کارانەوە کە دەیانکات و دڵنیا بێ، وای بڕیاردا بەیانی زوو سەرێکی فەرمانگەکەی بدات و هەندێ شتومەکی پێویستی خۆیشی هەبوون کە لە چەکمەجەی مێزەکەیدا داینابوون بیان هێنێتەوە و بە تەواوی پەیوەندی بەو شوێنەوە ببڕێ و خۆیشی دڵنیا بکات کە ئایا بڕۆی لێ کراوە یان گوزراوەتەوە بۆ چەسپاندنی خێزانداری و دەرماڵەی منداڵ و کابانی ماڵەوە ماوەیەك لەمەوبەر داوای دەفتەر نفووس و ڕەگەزنامەیان لێ کرد بوو، ئەوانەی هەموو لە چەکمەجەی مێزەکەیدا داینابوون و لەبیری چوون بیانهێنێتەوە.. لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە ناچار بوو سەرێکی فەرمانگەکەی بداتەوە...

بڕیارەکەی وا بوو بەر لە هەموو شتێ، چش لە نەوتەکەی بکات و بەرمیلەکە بێنێتەوە، ئەگەر لەبەر ئەو وردە شتانە نەبووایە، ئەمڕۆ کە ئێوارەکەی جەژنی نەورۆزە، وەك ڕۆژی بەر لە جەژنەکانی تر دەیکردە عەرەفە!.

پاسەکان بەرەو ژوور دەچوون و درەنگ دەگەڕانەوە، تارمایی ئافرەتە جوانەکەی دوێنێ ئەم شوێنەی کردبوو بە ئارامگەی خەیاڵ و حەسانەوەی ئەڤین... ئاواتی بوو جارێکی تر لێرەدا چاوی بەو ئافرەتە جوانە بکەوێتەوە.. سواری پاسەکە بوو، چاوێکی تێکرایی بە ئافرەتەکانی ناویدا خشان و چوو لە دواوە سوار بوو... لە پشتەوە سەرنجێکی سۆفیانەی ئاراستەی ئافرەتەکان دا.. لە تەمەن و کامڵیدا لە دایکی دەچوون، گەنجەکانیشیان وەك کچەکەی وەها بوون، هەموویان یەك ئافرەت بوون هەر چەند لە دەم و چاوا جیاواز بوون لەو بیرکردنەوەدا بوو، نەیزانی چۆن پاسەکە گەیشتبووە ئەو شوێنەی کە دوێنێ گەردەشی دڕنافیزەکە تیایدا قەوما.. لەوێ وەك دەستێکی نهێنی پاڵی پێوە بنێ دابەزی، لە دوا هەنگاوی دابەزینی دا دی جوان خان

لە یەکەم سەندەڵی لای دەرگاکەدا دانیشتووە، بە گوڕ تەکانی چوونە خوارەوەی دابوو، دەرفەتی پەشیمان بوونەوەی لە خۆیدا نەهێشتبوو.. لە خوارەوە ویستی سەرکەوێتەوە، بەڵام جوان وەك هەر نەیناسیٚ هیچ هەستێکی خۆی بۆی نەجوولاّن!... لە خوارەوە ویستی زەردەخەنەیەکی لەسەر لێو و هێمای پەشیمانییەکەی نەدیتنی لەسەر روومەتی خۆی دروست بکات, بۆیکرد بەڵام جێی خۆی نەگرت.. پاسەکە رۆیشت و ئەویش لەبەر خۆیەوە دۆش داماو خەریك بوو سەرو خواری شەقامەکەی لیٚ تێکچیٚ.. لەدڵەوە دەیوت:

– ئەی جوان خان خۆ من عاشقی تۆ نیم، دیارە دەتەویٚ فێری خۆشەویستیم بکەی، دەنا ئەو نەزاکەت و سۆزە و ئەو جەفا و بیٚ باکییەت لەچی!؟. ئەو چرایە تۆ لە دڵی مندا کوژانتەوە لە شوێنێکی ترەوە گڕی گرتەوە.. من هەموو کەسێکم خۆش دەویٚ و کەسیش دڵی لە من نەرەنجاوە، ئومێدە تۆش دڵت لێم نەرەنجا بیٚ...

وەرە سەیری ئەم قەدەرە جاویدانە بکە! تۆ بۆ کیٚ دەگریت و بە کیٚ ژێرت دەکاتەوە! من لە خەیاڵی شکار کردنی ئاسکە کێویەکدا بووم کەچی لەبەردەمما مامزێکی مەرەزی خۆماڵێم لیٚ یاغی دەکات!...

بارام تووشی وڕێنەی سەرو بەر بوو لە خۆ دەترسا تووشی جۆرە بارەیەکی دەروونی ببیٚ و هزری لە گێژەنە بترازیٚ... جاران بەو شوێنانەدا تیٚ دەپەڕی جگە لە خۆی و فەرمانگەکەی و منداڵەکانی هیچ شتێکی تر بیریان خجڵ نەدەکرد وا ئێستا کۆمەڵە رووداوێك بۆ لایەکی تری دەبەن و ئەو دوو ئافرەتەش هێزی دەدەنیٚ...

ئەگەر بیزانیایە جوان خان لە ناو ئەو پاسەدایە لەویٚ دانەدەبەزی و نەدەکەوتە شوێن تارمایی ئەو ئافرەتەی دوێنیٚ.. وردە وردە دەرۆیشت لە دڵیشەوە زۆر پەشیمان بوو کە لەوێدا دابەزی، ئەی چۆن پەشیمان نەبیٚ، دەبوو تا دوا وێستگەی پاسەکان دانەبەزیایە، هیچ نەبوایە جوان خانی دەدوان و هێمایەکی بۆ کارەکەی دوێنیٚ شەو بۆ دەکرد، ئەو کاتە دەیزانی تا چ رادەیك لە دەروونی دا کاریگەر بووە...

بەبیٚ هەدەری دەرۆیشت و جاروبار دەیڕوانییە دواوە و لای وابوو دوێنیٚ ئەمڕۆیە، یان ئەمڕۆ هەر دوێنێیە، ئەگەر بوونی جوان خان نەبوایە هەر وای دەزانی کە ئەو دەڕواو ژن و پیاوەکەی دوێنیٚ بە دوایەوەن.. با ئەم پرسیارە ئاراستەی ئەم بارامە بکەین کەوا ئێستا سەری دانواندووە و لەگەڵ سێبەرەکەی خۆیدا وڕێنە دەکات و بە خەیاڵ وای بۆ دەچیٚ ئەمڕۆ دوێنێیە! گریمان وا بوو، گریمان ژن و پیاوەکەی دوێنیٚ لەگەڵتا بوون و داوایان لیٚ کردی بەڵەدیان بکەیت



بۆ ئەو شوێنەی کە دەیانویست؟.. تۆ ئەوەندە ئازایت دەتوانی لە بەردەم ئەو پەیکەری جوانیەدا خۆت رابگری؟!. دەمت دەبوو بە ئەشکەوتی وێرانە و وەراق.. قەمتەری شەیتان لە دەمت دەکرا!...

ئەی ئەم شەوی رابردووە فریشتەیەك نەهاتە کۆشت؟ زانیت قسەیەکی جوانی لەگەڵدا بکەیت و تۆزیٚ بی لاوێنیتەوە؟ بۆ وا خۆت لەبیر نەماوە!... مێشکی خۆت لە گێلی دەدەیت، بەپیری دەچیتە بەر هەویری.. منداڵت گەورەیە.. پەریخانی ژنت شای ژنانە.. برۆ بە سەردەم بەرمیلەکەتەوە...

بارام زۆر لەو ئاخاوتنانەی بۆ خۆی کرد و تارمایی ئەو شتانەی بە دەست هێنان و بە دەم و چاوی خۆیدا سڕینیەوە وەك مامۆستای وێژە چۆن بە تەختە سڕ سەرتا پای هۆنراوە نووسراوەکان لەسەر تەختەی دەرس وتنەوە دەسڕێتەوە ئاوا بارام دەستێکی بە خۆیدا هێناو بەرەو بەنزینخانەکە هەنگاوی خێرای دەنا...

***

ئۆتۆمبێلەکانی هاتووچۆ و ئاسایش فرك و هۆڕیان بوو، بەرەو بەنزینخانەکە دەچوون و لەویٚ خاو دەبوونەوە، پەرۆش بوونیان و لێدانی هۆڕینی ئۆتۆمبێلەکانیان لە رەوشی قلیشانەوەی سەردەمی داگیرکەر دەچوو، خەڵکەکەش بۆ ئەوێیان دەڕوانی و لەوێشەوە دەردەپەڕین.. پۆلیسەکانی هاتووچۆ و ئاگر کوژێنەوە و ئاسایش خۆشیان حەزیان لەو بەزمانە دەکرد، بە ناوی کنترۆڵ کردنی رووداوەکانەوە خۆیان پیشان دەدا و دەستکەوتیشیان وەلاوە دەنا.. بارام کە نزیکی بەنزینخانەکە بووەوە دی بڵاوە بە خەڵك دەکریٚ..

ئافرەتێك لەو لاوە دەکڕوزایەوە بە توندی سنگی خۆی دەکوتا و دوعای ناشرینی دەکرد... لە نزیکییەوە منداڵێك فووی بە دەبدەبەیەکدا دەکرد، چەند هەوڵی دەدا پڕ نەدەبوو..

چەند زەلاّمێك لە ناو گوڕستانەکە گۆڕیان هەڵ دەکەند...

کابرایەکیش عارەبانەیەکی بە کەرە لاتەیەکەوە بەستبوو چەند پاڵی پێوە دەنا و لێی دەخوڕی کەرەکە لە بەر بیٚ هێزی رەوتی خۆی نەگۆڕی...

دوکاندارێکیش بە پەلە دەڕابەی دوکانەکەی دەهێنایە خوارەوە و دەرۆیشت.. پیرەژنێك لە ناو زەبڵدانەکەدا خەریك بوو وەك بۆ شتیٚ بگەڕیٚ وابوو...

ئۆتۆمبێلێکی پیکابی سەر بەتاڵ دوو سیٚ زەلامی تیاگیرابوون، چوار چەکدار پشت ملیان گرتبوون، پیکابەکە بە گورجی تێی تەقاند و بەرەو گرتووخانەکەی مەحەتە کشا... هەندیٚ لە

گرۆپەکانی پۆلیس لەو ناوەدا پژا بوون... دانیشتوانی ناو تەلارەکە لە بانیژەو بەلەکۆنەکاندا سەیریان دەکرد.. دیار بوو ئەو شتەی کە قەومابوو لە بەنزینخانەکەدا بوو، بارام بە پەلە خۆی گەیاندە شووراکە و لە پشتەوە سەیرێکی ناوەوەی بەنزینخانەکەی کرد،جگە لە تانکییە گەورەکان نەبێ هیچ شتێکی تر نەمابوو، ئەوەی ناوی بەرمیل بێ لەو ناوەدا نەبوو، ویستی بەرەو دەرگای پێشەوە بچێ، چەکدارێك دەنگی لێ بەرز کردەوە، ئەوجا زانی ئەو شتەی قەوماوە بەرمیلەکەی ئەویشی پێوە گلاوە، چەند هەنگاوێك بەرەو دەرگای کارگێری بەنزینخانەکە رۆیشت، دی پیاوە رەقەکەی دوێنی کە خۆی بەلێپرساوی ئەوێ دەزانی بە قۆناخە تفەنگ هێنایانە دەرەوە و دەرگای کارگێرییەکەیان پێ قوفڵ داوکلیلەکەیان لێ سەند:

بارام بەپەلە خۆی گەیاندێ و پێی وت:

- کاکە من دوێنێ بەرمیلەکەم لای تۆ دانا!.

کابرا بەلا لووتێکەوە وتی:

- هەر تۆ مابووی...

هەر ئەوەندە هاتە دەم و راپێچی ناو ئۆتۆمبێلی ئاسایشیان کرد... ئەفسەرێکی پۆلیس لە دوورەوە راوەستا بوو، بە یەکێك لە پۆلیسەکانی وت:

- بزانە ئەو ئەفەندییە چی دەوێ..

پۆلیسەکە لێ هاتە پێشەوە:

- ها چیت دەوێ؟..

- دوێنێ بەرمیلێکم لەم بەنزینخانە دانا بوو وا ئێستا دیار نییە...

کابرای پۆلیس سەرێکی سەرو رووخساری بارامی کردوو بە تەسەوە وتی:

- تاکە بەرمیلێك؟!

بارام پڕ بە دڵ پێی وت:

- بەڵێ بەرمیلێك...

کابرا خەریك بوو زەردەخەنەیەکی تێزدار بە رووی بارامدا پخش بکات، بەڵام لەبەر ئەفسەرەکە زوو کنترۆڵی خۆی کردو بە ئەفسەرەکەی وت:

- گەورەم.. ئەمیش بەرمیلی دیار نییە..

- ناوی بنووسە!..



وای وت و پۆلیسەکە لە ناو پارچە قاقەزێکدا ناوی بارام و باوك و ناونیشانی نووسی و بەپەلە لەگەڵ ئەفسەر و چەند پۆلیسێکی تردا سوار بون و رۆیین... چەند چەکدارێك مانەوە، ئیشێکی بەنزینخانەکەیان دەکرد، لە یەکێکیان چووە پێشەوە و لێی پرسی:

- ئەرێ ئەوە چی قەوماوە؟!..

کابرای چەکدار، بە پرسیارەکەی بارام دەم و چاوی خۆی مۆچ کردوو وەڵامی نەدایەوە... ماوەیەك لەو ناوەدا گێچکەی کرد و خۆی خافلان، ئەوەی بەو ناوەدا دەهات، ئاورێکی لە بەنزینخانەکە دەدایەوە و زوو تێدەپەڕی.. ماوەیەك لەو ناوەدا مایەوە... تێنەگەیشت چی قەوماوە، تا لە یەکێك لە ماست فرۆشەکانی ئەوێی پرسی:

- ئەرێ کاکە چی قەوماوە؟..

- کاکە لە چی دەپرسی، برۆ بەرێ خۆتا..

ئاخر من دوێنێ بەرمێلێکم لەوێ دانابوو.. ئێستا هاتمەوە بۆی، نە ئەوانە دیارن کە لەلایم دانان نە بەرمیلەکەم.. پۆلیسەکانیش ناویان نووسیم و نەمزانی بۆ چی بوو!..

- بۆ ناوی خۆت دانێ؟!..

- نەك هەر ناو..ناونیشانیش..

- بۆ بەرمیلێکی حیز خۆت تێکەڵاویان کرد..

- تێکەڵاوی چی؟!..

کەوای وت، کابرای ماست فرۆش تۆزێ بێدەنگ بوو.. دەیویست بزانێ مەسەلە چییە.. دەیزانی لەوە زیاتر کابرا بدوێنێ، رەنگە تووڕە ببێ.. لەگەڵ ئەوەشدا لێ پرسییەوە:

- کاکە پێم نالێی مەسەلە چییە..

کابرا بە تووڕەییەوە وتی:

- کاکە نازانم!..

وای وت و رووی لێ وەرچەخان.. لەبەر خۆیەوە وتی:

- دەیەوێ بە گرتنمان بدات..

بارام بەرەو بازاڕ شۆر بووە و لە دڵ خۆیدا دەیوت:

- لەبەر چی ئەگەر راستی بە من بڵێن تووشی گرتن دەبن.. یان لەبەر چی ئەوانە پێکەنینیان بە یەکێك دێ لە حەقی خۆی بپرسێتەوە، جا یەکێکی وەك من ئەگەر واز لە بەرمیلێك لە وڵاتی خۆمدا بێنم واتە بە ئاسانی واز لە نەوتەکەی کەرکووکیش دێنم کە

مافێکی نەتەوایەتیمە، ساڵەهای ساڵە دوژمن بە بەر چاومەوە دەیبا و ئێمەش زەقەی چاومان دێت..

بارام پیاوێکی گێل نەبوو، چاك دەیزانی دوژمنانی کورد هەموو کارێکی ناپەسەند بۆ تێکدان و پەشۆکاندنی حوکمڕانی کوردی ئەنجام دەدەن داخۆ ئەو شەوە جگە لەو بەنزینخانەیە چەند شوێنی تریان تاڵان کردووە؟!.. ئەوەشی دەزانی دوێنێ کە ئەو بەرمیلەکەی بە جێهێشت هەڵەیەکی کەمی نەکرد، هەڵە کردنیش بەشێکە لەوچالاکییە پاڵدەرانەی ڕەفتاری مرۆڤ و ڕاگرتنی بەرامبەر بەو تەگەرانەی کە دەبنە مایەی ئەزموون و شارەزا بوون و هەڵوێست وەرگرتن وەك دەڵێن: ئەگەر ئادەم هەڵەی بە خواردنی ئەو سێوەی کە خوا هانی خواردنی دا نەکردبایە دەبا فێری هەوڵدان و تێکۆشانی ئەم سەر زەوییە نەبووایە.. دەڕۆیشت و لە گەرمەی ئەو خەیاڵاتەدا بوو، لە پڕ کابرایەك رایگرت و پێی وت:

- ئەفەندی سەعات چەندە؟..

بارام وەك لەسەر شاپەڕی ئەندێشەدا بفڕێ لەپڕ بکەوێتە خوارەوە، هەڵوەسەیەکی بە دیار کابراوە کرد و خۆی هێنایەوە سەرخۆ و بە ئاستەم بە کابرای وت:

- ها چیت دەوێ؟.

کابرای خاوەن پرسیار حورمەتی پرسیارەکەی خۆی دەگرت بۆیە ئەویش وەك بارام بە دیار وەڵامەکەوە ڕاوەستا. دەنا خەلکی تر زۆر بوون هەمان پرسیاریان لێ بکات.. بۆیە وتی:

- بێ زەحمەت سەعات چەندە؟!

بارام تەماشای سەعاتەکەی کردوو بە ڕووێکی گەشەوە وتی:

- کاکە سەعات نۆ و نیوە...

کابرا کلکی بۆ پرسیارەکەی دروست کردو وتی:

- بە سەعاتی کۆن یان نوێ!؟..

بارام خەریك بوو تۆوڕە ببێ، بەڵام کە زانی کابرا بە سەرو سەکوت پیاوێکی بە ویقارە.. بۆیە بە تەوەسەوە وتی:

- کات کۆن و نوێی هەیە!..

وای وت و هەنگاوی نا..

کابراش بەبێ دەنگی ڕۆیشت..



بارام بەرەو بازاڕەکەی شێخەڵلا ملی نا، هێشتا بە تەواوی لە ناو ئاپوورەی خەڵك و جەنجاڵی بازاڕەکەدا نوقم نەبوو بوو، هەر لەو کاتەدا زۆر شتی دابوونە بەر پەڕەی هۆش و بیری خۆی، لەپڕ وەك شتێکی حەشار دراوی ناو قوڵایی ناخ دەرپەڕێت و ڕووبەری هەست داپۆشێ و خۆی بسەپێنێ ئاوا ئەو کابرایەی کە دەمێك لەمەوبەر لە پڕ پرسیاری لێ کردو وتی:(سەعات چەندە) ی هاتەوە یاد و لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئای! کوڕە خۆ ئەوە(وەلی بیلال) بوو! ئۆ..هۆ!.. تازە دێتەوە یادم!.. ئەوە یەکێکە لەوانەی هەموو کارو کاسبییەکیان قسە هەڵبەستن و جوینەوەی نوکتە کۆنەکانە، ئەوانە کۆمەڵە چەورە و لاکەوتەیەکی ئەم شارەن، هەر لە گەرد و گۆڵی بەیانیانەوە لە چایخانە کۆنەکەی(مەغدید) دا دادەنیشن، هەتا نیوە شەو، هەندێکیان هەر لەوێ دەخەون، کۆمەڵە کەسانێکی لاکەوتەن و پاشماوەی ئەم شارە کۆنەن، حیزبە سیاسییەکان بە دەمیاندا ڕشاونەتەوەو لا دراون. کاریان قسە هەڵبەستن و خۆ هەڵکێشان و بەکەم زانینی ئەم و ئەوە،خۆ بە مەغدور زانین و بێ ئاوە زوویی حیزبەکانە کە سوود لە ئەزموونیان وەرناگرن و ئەوانیش ئاوڕ لەوان نادەنەوە! ئەمانە هەر لەمە سەرە داوی هەڵەیەکی کەسێکیان بۆ دەرکەوێت، یان شتێکی لێ ڕوو بدات، ئەوەندەی بۆ یەکتر دەگێڕنەوە، هەریەك شتێکی بۆ دەخاتە سەر، تا وای لێ دێ دەیکەنە گوریسی هەزار سەرە و وەك چیرۆکی کۆمیدی، هەموو کاتە بۆشە بەسەر چووەکانی خۆیانی پێ پڕ دەکەنەوە..

ئەو کەسەی شتەکەی بۆ دەهۆننەوە لەناو کۆمەڵدا بەگێل و ناشارەزا و نەزان دەیدەنە قەڵەم و لەبەر چاو خەڵکی سووکی دەکەن... بە تایبەتی ئەوانەی کە خاوەن بیروڕایەکی نەتەوایەتی بن... بارام خەریك بوو خەمی ئەم کابرا لاکەوتەیە پەردەی هەستی تەڵخ بکات، ئەم مەسەلەی (سەعات چەندە و کۆن و نوێیە)ی بۆ بکات بە بنێشتە شینەی ددانە کەلو کۆچەکانی ئەو لاکەوتانەی کە ڕۆژگار دەستی لێ شۆرت بوون، بەڵام زوو دڵی خۆی بەو پەندە خۆش کرد کە دەڵێ:"دەریا بە دەمی سەگ گڵاو نابێ".

ئارەزووێکی دەروونی پاڵی بە بارامەوە دەنا کە خۆی لەناو دەریای بێ پایانی ئەو خەڵکەدا کە شەقامەکە قووتی دابوون تێکەڵ بکات و سەرنج بدات بزانێ چۆن کڕین فرۆشتن دەکەن.. لە سەرانسەری ئەو مەیدان و بازاڕەدا تا چاو بەناو بازاڕدا بڕ بکات، خەڵکەکە وەك ڕووبارێك لە بەهاردا لافاو بکات وەها خەڵك لە هات و چوودا بوون، لە مەیدانی شێخەڵڵاوە بەرەو پردی سەیداوا، لەو دیوی لای چەپەوە بەرەو چوار ڕێیانەکەی سێتاقان لەو دیوی لای ڕاستیشەوە

بەرەو مەیدانی کەران، لەو لاشەوە لە سینەما حەمراوە بەرەو خانەقای شێخ مستەفا و بازاڕی سورچی، لەبەر وردە فرۆشانی سەر عارەبانە و ئاپوورەی خەڵك دەرزیت هەڵ خستایە نەدەکەوتە سەر زەوی، لەبەر هەر دوکانێك لەمبەر و لەوبەری چەندان عارەبانە کرابوونە دوکانی گەڕۆك و هەموو ناو شەقامەکان بست بە بست بە کرێ درابوون، مرۆڤ ئەگەر پشووی درێژ و لەسەرخۆ نەبووایە نەیدەتوانی بە ئاسانی بەناو ئەو جەنجاڵەدا بڕوا..

بارام لەناو ئەو جەنجاڵەدا تاکە خڕۆکەیەکی نەبینراوی، نەناسراوی ناو تەنی ئەو کۆمەڵە بوو کە وەك داناوێڵەی گێژدراوی ناو بێژینگ خولی دەخوارد و دەسووڕا، حەشامەتەکە لە ناخەوە هاژاندی و دانیشتنی سەرمێز و بێنەو ببە و وەرگرتە و دەرکردەی ڕۆژانەی، نووسراوی هیشك و بریشکی ڕۆتیناوی ناو فەرمانگەکەی چەند ساڵانی، چەند کزر و وشکی کرد بووەوە بەقەد ئەو سەیرکردنی خەڵك و بیستنی ئەو هەرا و هۆریایەی کڕین و فرۆشتنەی ئەو ماوە کورتە کاریان لە دەروونیا نەبوو...

ڕۆیشت لەپڕ لەبەردەم دوکانەکەی، مەلا ڕەئوف دا خۆی دیتەوە و چاك و چلۆنییەکی خاوی لەگەڵدا کرد،:

مەلا ڕەئووف خەریکی رایی کردنی زەبوونەکانی بوو، کە چاوی بە بارام کەوت پێ وت:

- ها کاکە بارام فەرموو دانیشە..

فەرمووەکەی ڕەئووف بازاڕیانە بوو، بارامیش بە تەمای ئەوە بوو بە گەرمییەوە فەرمووی لێ بکات... لە دڵیشەوە حەزی نەکرد لە ڕۆژێکی وەهادا ڕێی بکەوێتە لای یەکێکی وەك مەلا ڕەئوف، ساڵانێکی زوو هەردووکیان پێکەوە مامۆستا بوون، ئەم ئەوەی بەبێ بەهرە و نەیار دەزانی کەچی وا لە ڕۆژێکی وەهادا ئەوان بۆیان هاتووە، ئەمیش وێڵی شوێن بەخت و پایەی نادیارە، ئەوەتا مەلا ڕەئووف لە سایەی دووربینی خۆیدا دوکانێکی لەو شوێنەدا داناوە و شا بە سەپانی خۆی نازانێ، ئەو زووی بۆ دەرکەوتبوو کە مرۆڤی مووچە خۆر هەرگیز ئۆخەی ناکات و قەت پارە لە گیرفانی خۆیدا نابینێ، تەنها نانە سکییە و هیچی تر...

بارام تازە حاڵی دەبێ و دەزانێ و ویقار و پیاوەتی مرۆڤ بەندە بە بارەی ئابوورییەوە.. تازە لەو راستییە تێدەگات!...

لەناو دوکانەکەدا کۆنە کورسییەك هەبوو، بارام هێشتا لەسەری بە تەواوەتی خۆی تەخت نەکرد بوو، ڕەئووف بە سەر زارەکی پرسیارێکی ناو بازاڕی لێ کرد..

- ها.. ئێستا خەریکی چیت؟..



وای وت و گوێی بۆ وەڵامەکەی نەگرت، یان وەڵامەکەی لا مەبەست نەبوو، چونکە دەیزانی بارام خۆی بە پیاوێکی ناو بازاڕی نازانێ، مەبەست لە پرسیارەکەدا تەنها دواندن بوو.. پرسیارەکەی کرد و بە دەست و بە چاو خەریکی وردە واڵە و شتومەك فرۆشتن و رایی کردنی زەبوونەکان بوو...

بارامیش هەر لە ناوەوە هەر خەریکی خۆی بوو، سنگی دەربەندێکی فراوان بوو، بەڵام لەو کاتەدا بوو بە سەرکەلێکی تەپوو تۆزاوی، خەریك بوو تووشی نەفەس تەنگی ببێ و پشی بگیرێ.. ئەو ڕۆژەی هاتەوە یادکە لەگەڵ ئەم مەلا ڕەئووفەدا پێکەوە مامۆستا بوون، ئەو وازی لە مووچەی مامۆستایان هێنا، ئەو کاتە پێی وابوو ئەو حەوسەڵەی دەرس وتنەوەی نەماوە لە دەست قوتابی نەگریس و خشتەی وانەکان و زڕەی زەنگ هەراسان بووە، وایان بۆ دەتاشی کە گوایا حەزی لەو ناوە پیرۆزەی پەروەردە نییە و نایەوێ نەوەی نوێ پێبگات، هەروەها دەربارەی دەوترا: گەواهی ناوەکەی خەسار کردووە، ئیتر بۆ خۆی تووشی بگرە و بەردەی مامۆستایان و تاقیکردنەوە بکات.. ئەو کاتە وا دەوترا، کەچی ئێستا خانووەکەشت بفرۆشی چما کەچە دوکانێت پێ دەکرێ؟.

ئەو دەمە نەدەزانرا گۆڕاندنی بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی پەڕەی زۆری هەڵ نەدراوەی هەیە، لە دوا ڕۆژدا دەکرێنەوە و ئەو کاتەش پێناسەیەکی تر بۆ ژیان و بەها کۆمەڵایەتییەکان دێتە ئاراوە..

مەلا ڕەئووف لەبەر چاو بارامدا بە دەست پارەی وەردەگرت و بەدەم سەودا و مامەڵەی دەکردو شتی دەفرۆشت، پەیتا پەیتا پارەی لە چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمی دەئاخنی و لە دڵەوە گاڵتەی بە جارانی خۆی دەهات کە مووچە خۆر بوو، حەزی دەکرد بارام لەوێ دانیشێ و ببینێ، بەڵێ گاڵتەی بەو مووچە خۆرانە دەکرد کە بۆ یەك دینار ئەو هەموو مامەڵە و چەند و چۆنی و سەین و بەینە دەکەن وەك بە زمانی حاڵ بڵێ:

- بارام سەیری ئەمسالی خۆت بکە.. بۆ دینارێك چۆن مامەڵە دەکەن, زمانیان بەلای پاڕانەوەدا دەسووڕێ بۆ ئەوەی خاتریان بگرم.. خوا هەڵناگرێ ئەویش خاتری دەگرتن، بەڵام لەکاتی مامەڵە کردندا جۆرە بەزەیی پیا هاتنەوەیەکیان دەردەبڕی، بارام وا هەستی دەکرد ناوەخەنی بەزەیی پیا هاتنەوەکە جۆرە سوکایەتییەکی تیایە..

جاروباررریش دەرفەتی وەردەگرت رووی بەلای بارامدا وەردەگێڕا و دەیوت:

- ئێ.. ئێستا لە چیایی!؟..

وەك بیەوێ بڵێ: لە بیرتە پێکەوە مووچە خۆر بووین، لەدەی مانگەوە چاوەڕوانی سەرمانگمان دەکرد! وا ئێستا بە چاوی خۆت دەبینی پارە وەك تاڤگەی ئاو بە سەرمدا دەبارێ..

مەبەستی لەو هێمابازییەدا کەمکردنەوەی بارام نەبوو چونکە دەیزانی ئەو لەو جۆرە فەرمانبەرانە نەبوو کە بەتیلایی یەك چاو تەماشای شت بکات، یان تەنها لە روویەکەوە بۆ شت بڕوانێ، ئەو واتە بارام هەموو هەوڵ و کۆششێکی بۆ بەرژەوەندی گشتی بووە..

گەلێ جار شتی پێداویستی لەلای مەلا رەئووف دەبرد لەکاتی هەبووندا دەیدایەوە. ئەو وای زانیبوو پێویستی پاڵی پێوە ناوە نەچێ بۆ دەوام و بێتە لای، بۆیە دواندی:

- نەچووی بۆ دەوام بۆ!؟.

- تۆزێکی تر دەچم..

کە بارام وای وت، ئەو وا تێگەیشت کارێکی پێیەتی، بۆیە وتی:

- فەرموو، هەر پێویستیەکت هەیە ئامادەم..

- سوپاست دەکەم.. بۆیە ئەمڕۆ دواکەوتم دوێنێ بەرمیلێکم لای پۆلیسەکانی بەنزینخانەکەی ناو بازاڕ دانابوو، ئەمڕۆ هاتم بیبەمەوە، ئەوجا بڕۆم بۆ دەوام کەچی کە هاتم ئەوەی نەمدی بەرمیلەکە بوو...

لەو کاتەدا کە بارام قسەی دەکرد کوڕێکی گەنج هات و چەند گەڵایەکی دۆلاری دایە دەست مەلا رەئووف و وتی:

- ئەمڕۆ دە دینار دابەزیووە، بۆیە نەمکڕی...

- باشت کرد...

وای وت و گەڵاکانی لە باخەڵی نان، پاش رۆیشتنی گەنجەکە ئەوجا رووی کردەوە بارام و وتی:

- جا بەرمیل بۆ لەوێ دادەنێی..

- وا رێکەوت لەوێ دایبنێم..

هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ گێرایەوە... بەڵام مەلا رەئووف لەبەر سەرقاڵی خۆی و بەرێ کردنی سەوداکارەکانی تەنها لا گوێیەکی بۆی شل کرد بوو، ئەویش بە کورت و کرمانجی بۆی گێڕایەوە..



دەتووت ئەو لەو سەرەوە هاتووەتەوە و پوختەی بە سەرهاتەکەی لایە، کە هاتە دەم لەبن کودی دا:

- لەم رۆژانەدا خەڵك شت لای برای خۆیشی دانانێ.. نەخوازەڵڵا بەنزینخانە و پۆلیسخانە.. ئەگەر دەتەوێ سۆراخی بکەی یان لەسەر سنوور یان لە بازاڕی کۆنە فرۆشان بۆی بگەڕێ..

هەر باشە خۆت نەگیراوی و تووندی بەنزینخانەی مەحەتە نەکراوی..

بوونی بارام لەو شوێنە و رۆژانی لەگەڵ مەلا رەئووف و سەرجەمی بە سەرهاتەکانی ئەو دوو رۆژەی دوایی، ئەوانە هەموویان لەناو دەروونیدا وەك جەنجاڵی ناو بازاڕەکە بەسەر یەکدا دەکەوتن و دەبوونە زەمینەی ئاڵۆوگۆڕێکی بنچینەیی لە ژیانی دا.. وشەی (نەچووی بۆ دەوام)لەو شوێنە و بەو شێوازە بە تەواوەتی مانای دەوامکردنی لا پووچەڵ کردەوە و پەردەیەکی رەشی بەسەردا کێشا، هەر لەوێدا هەستی بە جۆرە دڵ خێوراندنێ کرد و هەڵسا...

- خوا حافیز..

مەلا رەئووف بە شت فرۆشتنەوە خەریك بوو، بۆیە دەرنگ هاتە دەم و وتی:

ـ کاك بارام لە خزمەتداین..

- کاك بارام لەو رۆژەوە بڕیاری دا: ئەگەر مووچە خۆری ببێ بە ئاوی حەیات نەیخواتەوە..

جاران ئەگەر زۆر ناچار نەبووایە یەك رۆژ فەرمانگەی خۆی بەجێ نەدەهێشت و پێ وابوو ئەگەر رۆژێك لێی دوور بکەوێتەوە کەلێنێکی گەورە لە ماڵی کۆمەڵدا دروست دەبێ و لەوانەشە ژیان تارادەیەك لە جوڵە بکەوێ! وا ئێستا بۆی دەرکەوت کە ئەو لە فەرمانگەکەدا نییە و بەقەد سەرە دەرزییەك کاری لە هیچ نەکردووە و کەسیش پەکی لە هیچ نەکەوتووە، ئەوەش ئەو بیری لێ دەکردەوە وا نییە.. ئەو تەنها تاڵە موێکە لە ناو پێستەی کۆمەڵدا، کۆمەڵیش وا خەریکە لە دووریێیانی رووبەرووبوونەوەی چارەنووسی خۆیدایە، هەڵڕشتن و رەتاندنی ئەو خەڵکە لەو بازاڕەدا و حەپەساندنی سەرجەم وڵات پاڵاوتنی ئەو رەوتە مێژووییەیە کە دەشێ لە سەرەتادا هەموو خاشاك و خاپەرۆکێکی خۆی لابداو بە هۆشیاری هەنگاو بنێ، لەگەڵ بارودۆخ و هۆکارە دەرەکییەکاندا بەژیرانە هەڵس و کەوت بکات.

***

لەچوار ڕێیانەکەی لای بانك و لەبەردەم خولکەکەدا ڕاوەستا، سەیری ئاپۆرەی هاتووچۆی ئەو خەڵکەی دەکرد، دەروازەی هۆشی لە داوێن ئاسۆی تێڕوانین و لێکدانەوەیەکی ڕووناکدا کرایەوە، خەڵکەکە بە پەرۆشەوە دەجووڵان، وەك زەنگی شەڕ لێی دابێ و هەرکەس پەلاماری پێویستی خۆی بدا وابوو، لەو شوێنەدا وەك چوار ڕووباری لێڵ بە تەوەژم تێکەڵاو بەیەك بن وەها خەڵکەکە تێکەڵاو دەبوون و شەپۆلیان دەدا هەر لەوێشدا هەمدیسان دەبوونەوە بە چوار ڕووبار و جیا دەبوونەوە، بەشێکیان بەرەو بازاڕی شێخی چۆڵی بەشێکی تریان بەرەو چایخانەی مەچکۆ و بەرقەڵا و دووبەشەکەی تریان بەرەو شێخەڵا و مەیدانی پاسەکان و ماست فرۆشەکان، هەر ڕووبارێ چەندان لقی لێ دەبووەوە هەمووشیان لەبەر حەشامات لرپەیان دەهات، بڕوا ناکرێ ئەو قەڵا کەنفتە لەوەتەی هەیە جەنجاڵی وای لەبەردەم خۆیدا دیبێ.. لەو ساتەدا بارام لەو دیارەدەیە سەرنجی دەدا و دەرگای سرۆشی دەکرایەوە و هەموو شتەکانی لا ڕۆشنا و ئاشکرا دەبوون، ئەو هاتووچوونە، ئەو تەوژم و پاڵە پەستۆ و حەپەسان و هەڵپە کردنە، ئەو خەڵکە سەرو سیما هەمە جۆرە، نیوە سەر ڕووت و نیوە جامدانە و مشکی بەسەرو حاجی و مەلا و سەید و ئاغاو بەگزادە و خانەدان و بۆرە و چەورە و لاکەوتە و هۆشیار و بێ هۆش و وڕۆشنبیر و نەزان و گەداو دەوڵەمەندە، ئەو موسڵمان و ناموسلمانە.. هەموو وەك مزەی ئاش تێکەڵاو بەیەك ببوون و زرووف و کات و بەرژەوەندی هەمووی هێنابوون و تەتڵەی دەکردن و بەیەکەوە دەیشێلان بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا کۆمەڵێکی هاوچەرخ و چالاکیان لێ دروست بکات، لە مەیین و خەست بوونەوە و سڕی ڕزگاریان ببێ..

لە چاو ئەودا ئەو حاڵەتە ژانێکی نوێ بوو بۆ لە دایکبوونی ئەو کوڕپە تازەیە کە سەدان ساڵە چاوەڕوانی هاتنی دەکەین... کە هات ماڵی هەزاران کەلێن لێ کراوی بێ باوان ئاوەدان دەکاتەوە، قۆچانەکەی وەك عاسا لێ دزراوەکەی حەزرەتی سلێمان دەدۆزرێتەوە و گۆڕیچەی مێژووی ونکراوی هەڵدەداتەوە، ئەو گومبەتانەی کە بە گوارە و ملوانکە ڕفێنراوەکانی گەردەنی کیژۆڵانی ئەنفال کراو و (جاریە) فرۆشراوەکان سواغ درابوون هەڵدەتەکێنێ و زەردەخەنە دەخاتەوە سەر لێوی منداڵان و فرمێسکە گەرمەکانیان دەسڕێتەوە... ئەو کاتەش دۆش دامان بە دیار باری کەوتووەوە نامێنێ..

ئەو خەڵکە سەرجەم خەم و پەژارەی ڕۆژگاریان لە قوڵایی چاوە مات بووەکانیاندا حەشار دابوو، بەڵام نیو چاوانی برسی و کرژ و لۆچدارەکان نەخشەی پاشەرۆژێکی ڕووناکیان لێ بەدی دەکرا.



حەشامەتەکە هەر چەند زۆرینەیان پیاو بوون و تاکو ترۆکێ ئافرەتی عابا شڕ و ژاکا و ئافرەتی چاو نەترس بەر چاو دەکەوتن، بە گورجی دیواری ئەو جەنجاڵەیان دەبڕی و پەلاماری جێبەجێکردنی مەبەستەکانی خۆیان دەدا..

خۆ ئەگەر جاروبار شۆخێك لەناو ئەو حەشامەتە دا بەدی بکرایە، خەڵکەکە بەدزی و بە ئاشکرا ڕوانینی ئالۆشاویان ئاراستە دەکرد..

پیاوە پیرەکان لە ڕووی حەسادەتەوە حەزیان لە هاتووچۆی ناو بازاڕی ئافرەتان نەدەکرد، چونکە دەیانزانی کەڵکی ئاوڕ لێدانەوەیان نەماوە، لە جیاتی ئەوە زۆربەیان دوکانی پێویستییەکانی ئافرەتانیان دانابوو، بۆ ئەوەی بەڵکو جاروبار ئاو پژێنێکی ڕەگە وشك بووەکانی ئارەزووە دامرکاوەکانیان بکەن..

ئافرەتان کە دەهاتنە بازاڕ، هەزارەها چاویان لێ دەکرایەوە و ناچار دەکران کە یەکسەر بچنە ناو قەیسەرییەکان. وەك بڵێی بازاڕەکە بەشکراو بوو، شەقامە پانەکان بۆ پیاوان بوو، قەیسەرییە تەنگ و تارەکان هی ئافرەتان، چونکە وەك عابا ڕەشەکانیان تاریك و داپۆشراو بوون، لە لەشی پڕ گوڵاو مێینەی شارەکە ئاڵابوو، لەناویدا سەدان چاو کەژاڵ و بەژن و باڵا جوان چاویان بە شوێن کوتاڵی هەمە ڕەنگ و کاڵای هەمە چەشنە و بریسکەی زێڕ و تریفەی جۆرەها خشڵدا دەگێڕا و تیر چاوی خۆیان دەلەوەڕاند و دڵی خۆیان پڕ تاسەی ئەو بازاڕە مێینەیە دەکرد کە بۆ دڵ ڕفاندنی ئافرەتان دانرابوو. ماوەیەکی دوور بوو بارام پێی نەکرابوو سەری ناو قەیسەرییەکان بدات، کە چووە ئەوێ گەلێ پێی سەیر بوو، ئەوەی لەوێ هەیە، ئەوەی لەوێ مامەڵە دەکات گەلێ جیاوازی لەگەڵ دەرەوە هەیە، لە دەرەوە خەڵکەکە هەمووی لەژێر باری نەبوونی دا دەناڵێنێ و هەموو هەڵپەی دابین کردنی پارووەنانی ئێوارەیەتی، لەوێش خەڵك بە تێری مامەڵە دەکات و بە سەفتە پارە دەردەکات، کام شت گران بەهایە ئەو فرەتری لێ دەفرۆشرێ.. بارام زانی دەوڵەمەندەکانی شار لە تاریکدا خۆیان حەشار داوە لەوێوەوە دەست خراوەتە ناو بینەقاقەی ئابووری وڵات.. لە قەیسەریدا حەق بە دەست ژنان بوو، ئەگەر ژنێك لە پیاوێك ڕاچڵەکایە ئەو پیاوە حەیای دەچوو، بە تایبەت ئەگەر ژنەکە شۆخ بووایە، دوکاندارەکان لە حاڵەتێکی وەهادا بۆ خۆ بردنە پێشەوە لەو ئافرەتە کابرایان ڕسوا دەکرد، دەبوو یەکیەتیی ئافرەتان پەیکەرێك بۆ ئەو کەسەی کە بۆ یەکەمجار قەیسەری داهێنا دروست بکات، چونکە لەو شوێنەدا ئافرەتی وڵاتی ئێمە دەتوانێ هەناسەیەکی سەربەستانە و ئازاد بدات..

بارام مەبەستی بوو سەری ناو قەیسەری بدا، دەیویست خۆی لە هەتیتەی نهێنییەکانی کۆمەڵدا لە قالب بداتەوە و سەر لە نوێ چاوێك بە خۆیدا بگێڕێتەوە. پەند لەو خەڵکە وەربگرێ، پەندی یەك لاینە نا، بەڵکو پەندی تەواوی وا بە ئەزموونی ژن و پیاو ساز درابێ.. بەڵکو بتوانێ ڕێگەی بژێوی خۆی بگۆڕێ، واز لە نانی مووچە خۆری و تەمەڵی بێنێ و ڕوبکاتە دەرێکی تری ژیان، بۆی دەردەکەوت ئەو هەموو خەڵکە جێی خۆیان لەناو کۆمەڵدا بە ئاسانی نەکردووەتەوە، مەسەلە هەمووی هەوڵ و تێکۆشانە، کۆڵنەدانە هەوڵ و بەرخوردان مرۆڤ بەرەو بەختیاری بەرز دەکەنەوە.. دیتن و بەراوردکردنی شتەکانی ئەو ڕۆژەی بارام بۆ چوونی هۆشیارانە بوون، گسکیان لە تۆزی هەموو دڵەراوکەیەکی دا..

لە قەیسەریەکە هاتە دەرەوە..

بەرەو خوار، ڕوو بە وەزارەت کشا و لە دڵ خۆیدا دەیوت:

– زۆر باشە، ماوەتەوە سەر ئەوە برۆم ئەو شتانە لە چەکمەجەی مێزەکەدا کە بەجێم هێشتوون بیانهێنم.. تا بەبێ خەم بۆ ئێوارە خۆم ئامادە بکەم.. ئەی ئەم ئێوارە جەژنی نەورۆز و سەرەتای ساڵی تازە نییە!؟.. هەموو دیرۆکی کۆن و نوێی پڕ شانازی کورد لەم ڕۆژەدا دەفتەری خۆیان واڵا دەکەن و کوردان لەبەر دەم ڕۆژێکی نوێ دا رادەگرن.. هەنگاوەکانی خێراتر کردن و ڕووی بەرەو وەزارەت نا..



## (9)

ئەو وەزارەتەی کە جاران بەر لە چوونە ناویەوە بارام نیازی دەکرد هەر لەدەم دەرگای دەرەوەیدا پێڵاوەکانی داکەنێ وەك چۆن دەچێتە حزووری پیرێکی گەورە و چاکێکی بزرگ، ئاوا تەماشای دەکرد، بە دیتنی گەزگەز باڵای دەکرد، نەك لەبەر ئەوەی خۆی تیایدا فەرمانبەرە یان شتێکی تر بەڵکو بە هاتنە دی چمکێکی ئەو ئاواتانەی دەزانی کە هەزارەها شەهید خەونیان پێوە دەدی و ڕۆیشتن و نەیان دی.. وا ئێستا کە سەیری دەکا لەبەر چاوی گەلێ بچووك بووەتەوە!

هەموو دار و دیوار و دەرگا و، مێز و پلیکانە و پەنجەرە و ئامێرەکان و سەوداکارانی لا ئاشنا بوون، بە ڕۆژدا لەگەڵیدا دەهاتنە قسە بە شەودا دەچوونە ناو خەونەکانییەوە، ئەو چەند ئەوانی دەناسی، ئەوانیش لە هەڵس و کەوتی ئەو راهاتبوون و دەیانزانی چی دەزانێ و چی نازانێ، لە چیا شارەزایە و لە چیا کۆڵەوارە، کە بەیانیان دەچووە دەوام وای دەزانی هەموو شتەکان پێشوازی لێ دەکەن و بۆی دەقلێنەوە کەچی ئێستا بە مات و مەلوول دێنە بەرچاوی، بزە و زەردەخەنەکەی جارانیان نەماوە، وای دەزانی ئەم شوێنە کۆنە ئاشێکە لە وەرزی پایزدایە و ئاوەکەی وشکی کردووە..

بارام وەزارەتی لە بەر چاو کەوتبوو، کە چووە ژوورەوە وەك جاران بە گەرمی ڕۆژباشی لە دەرگەوان و کەسانی ناو پرسگەکە نەکرد، ئەوانیش بە قەد سارد و سڕیەکەی ئەو وەڵامی ڕۆژباشییەکەیان دایەوە، ئەو گوێی بە ناو نووسی ناوەکەی خۆی نەدا ئەوانیش دەنگیان نەکرد..

(ئاواز) تاکە ئافرەت نەبوو کە بە چاوی ڕێزەوە تەماشای بارامیان دەکرد بە نموونەی پیاوی یارا و دڵسۆز و ڕاستگۆیان دەزانی، ماوەیەك بوو دەیویست لێی نزیك بێتەوە، بەڵام لەوە دەترسا پەیوەندی لە نێوانیادا بەتین ببێ و بەرەو حەز لێ کردن رایکێشی، ئەویش بیوەژنە و مێردەکەی لەرۆژی کۆرەوەکەدا شەهید کراوە و هەتیو بارکەوتووە و منداڵی گەورەن و ماڵی خەزووری چەند بڵێی گیانی تیرەگەریان تیا مەیی بوو... بەڵام ئەو ئاوازە تاکە ئافرەت بوو کە بەئاشکرا لادانی

بارامی پێ تاوانێکی گەورە بوو.. دوێنێ کە هەواڵەکەی بارام بڵاو بووبووەوە، ئاواز خۆی پێ نەگیرا بوو و تبووی:

– ئەوە تۆڵەی راستگۆی و دڵسۆزییەتییە.. ناحەزان پاداش دەدرێنەوە، تۆڵەش لە دڵسۆزان دەسەنرێ!!.

وای وتبوو، چیمەنی دوو روو وتبووی:

– ئەوی تۆ دەیڵێی دەبێ ئێمە خائین بین!.

ئەویش وتبووی:

– نا.. من وا ناڵێم.. من دەڵێم ئەوەی بە بارامییەوە داوە ماری بێ ئیجازەی دوژمنانی کوردە.. بارام بەو تۆڵەیە، ناچەمێتەوە، لە حەق پەرستی خۆی ناکەوێ.. بەوە بیروباوەڕی ئەستوورتر دەبێ..

چیمەن وتبووی:

– ئەها.. بۆمان دەرکەوت!.. زۆرباشە! تا ئێستا ئەوەشمان نەدەزانی!.. باشە، باشە!.. چیمەن وەك پارێزەری وەزارەت رووبەڕووی ئاواز راوەستا بوو، ئاوازیش بە تەشەرە بڕندەکانی، نارەحەت دەبێ و دەداتە پرمەی گریان، دەست دەداتە جانتاکەی و دەیەوێ واز بێنێ و بڕوا.. بەڵام هەندێ فەرمانبەر دەستبەرداری نابن و دای دەنێنەوە و شتەکە دادەپۆشن.. بارام لە داڵانەکەدا تووشی ئاواز بوو، فایلێکی بە دەستەوە گرتبوو رۆژباشیان لە یەکتری نەکرد، بەڵام بەرووی یەکتریا وا گەشانەوە، سەدان مانای رۆژباشی تیا دەخوێنرایەوە، ئاواز بۆ بەشی خۆیەتی دەچوو، زوو گەڕایەوە و پێشی بارام کەوت لەدوا پلیکانەی سەرکەوتندا پارچە قاقەزێکی بۆ بارام دانا، بارام لێی تێپەڕی، ئاواز بۆ ئەوەی دڵنیا بێ کە ئایا هەڵی گرتووە یان نا.. زوو گەڕایەوە، بەلای بارامدا تێپەڕی و دەیوت:

– ئۆە.. پارچە قاقەزێکم لێکەوت..

ویستی بارام تێ بگەێنێ کە ئایا وەری گرت، یان نا..

بارام هیچ دەنگی نەکرد..

ئاواز پارچە قاقەزەکەی خۆی وەرگرتەوە و نایە ناو فایلەکەی و گەڕایەوە، ناو ژوورەکەی خۆی و دەستی بە ناو چەکمەجەی مێزەکەیدا گێڕاو وای پیشان دا شتێکی لەبیر چووە، سەر لە نوێ بەرەو بەشی خۆیەتی رۆیشتەوە.. بەڵام تا ئێستاش نەزانراوە ئەو نامەیە چی تیا نووسرابوو..

بارامیش حەزی نەکرد قسەی لەگەڵ دا بکات بۆ ئەوەی کەسی تر بەبۆنەی ئەوەوە تووش نەبێ..



لەگەڵ فەرمانبەرەکاندا چاك و چۆنییەکی گەرمی وای لێکردن و دەتوت سەرۆکی شاندێکی هەڵبژاردەیە و حکوومەت بۆ دەرەوەی دەینێرێ، سەرۆکی بەشەکە گەلێ بە ناشیرینانە ئەو لیستەی کە ناوی دوورخستنەوەی ئەو و چەندانی تری تیا بوو خستییە بەردەمی، ئەویش لاچاوێکی بێ بایخانەی وای پیاگێڕا، پێکەنین و دڵخۆشییەکەی نەبڕی و بەلا پەنجەیەك لەسەر مێزەکەی لایداو لەسەر وتەکانی خۆی درێژەی داو وتی:

– دیم.. دیم..

بە تێز و لالووتێکەوە ئاماژەی بۆ لیستەکە کرد.. وەك گاڵتە بە هۆشی سەرۆکی بەش بکات و دەیوت:

– ئەوە کۆن بوو!.. ئێستا شتێکی تر لە گۆڕێیە! .. ئەو شتانەی کە لە چەکمەجەکەدا بوون، لەبەر چاو ئەواندا یەکە یەکە ناوی هێنان و لە باخەڵی نان و بەدەم زەردەخەنە و روومەت گەشیەوە خوا حافیزی کردو وتی:

– یەکتر دەبینینەوە..

فەرمانبەرەکان، سەرسام مان، نەیانزانی بۆ ئەوەندە دڵی خۆشە و مەبەستی چی بوو وتی(ئیستا شتێکی تر لە گۆڕێیە)!..

گەلێ لەسەری دوان و راو بۆ چوونیان لەسەر بینا کرد..

مەخابن، کەس بە قەد بارام فرمێسکی بۆ بێ بەختی کورد نەرشتبوو کەسیش بەقەد ئەو ناو جەرگەی بۆ هەزاران هەزار منداڵی بێ نەوای کوردی ئەنفال کراونەبرژابوو، کەسیش بەقەد ئەو شانازی بەو وەزارەتانەوە نەدەکرد، وا ئێستا مۆرانەو جڕ و جانەوەری قەڵاچۆ نەکراوی ناو وەزارەتەکان وەك مار پێیانەوە داوە و وا دەزانن دنیا ئەمسەر و ئەوسەری هاتووەتەوە یەك و بارام لەو بەینەدا جەڕ دەدرێ و لە کۆڵ دەبێتەوە!..

لەسەر جادە بەرینەکە راوەستاو پشتی لە وەزارەت کردبوو سەیری ئۆتۆمبێلی ئەمبەر و ئەوبەری دوو سایتی شەقامەکەی دەرکرد بە گوڕ دەهاتن و دەچوون، ئەو خەڵکەی ناویان بە ناو دنیایەکی فراواندا گوزەریان دەکرد و بە خەندەی سەر لێویان ئەوەندەی تر پان و بەرینیان دەکرد، هەر دەهاتن و هەر دەڕۆین، ئەوەی دەهات نەدەگرایەوە، ئەوەش دەڕوات لا ناکاتەوە، هیچیشیان لە فەرمانبەر نەدەچوون، هەمووو رووکراوەو دڵگەش و دەم بە پێکەنین بوون، مانای بەختەوەریان بە ژیان دەبەخشی و بەدەم ئاسۆی ژیانێکی نوێوە دەچوون..

بەبێ ئەوەی فیکر بکاتەوە چەندی لە باخەڵدایە و چەندی بۆ دەمێنێتەوە بەشی چەند ڕۆژی دەکات..

لەمە دەستی ڕاگرتنی بۆ تەکسیەك درێژ کرد لەبەر دەمیا ڕاوەستا و یەکسەر سوار بوو. شوفێرەکە پیاوێکی دامەزراوی تەمەن لە دەور و بەری چل ساڵی دا بوو، لە تەکیا کەوتە ئاخاوتن وەك لە زووەوە یەکترییان ناسیبێ، وا بۆ یەکتری کرانەوە.. شوفێرەکان بە گفتوگۆدا...

سواربووەکانیان دەناسی بەپێی میزاجی ئەوان دەکەوتنە قسە کردن.. کە بارامی دی یەکسەر زانی فەرمانبەرێکی دیار و خاوەن کەسایەتییەکی دامەزراوە، بۆیە وتی:

- دیارە فەرمانبەری؟.

- بەڵێ تا ئەمڕۆ فەرمانبەر بووم...

- خانەنشین بووی یان بەجێت هێشت؟.

- خانەنشین نەبووم.. پێیان بەجێ هێشتم.

وای وت و یەکسەر شوفێرەکە لە مەبەستەکەی حاڵی بوو..

- پیرۆز بابیت لێ دەکەم.. ئەوەی وای کردووە خراپەیەکی چاکی لەگەڵدا کردووی!..

بارام حەزی کرد لەو بارەوە ڕای وەربگرێ، بۆیە هانی دا کە پتر لەسەر ئەو شتە بڕوات بۆیە وتی:

- چۆن؟.. تێناگەم..!

- با شتێکت بۆ بگێڕمەوە...

- فەرموو..

شوفێرەکە ڕووی بەلای بارامدا کرد و وتی:

"برای خۆت دەبینی؟.. شوفێری ئەم تاکسییەم، لە وەختی خۆیدا لە شارەوانی فەرمانبەر بووم، چەند ساڵێك بە مووچەیەکی مەمرەومەژی دەمگوزەراند، هەموو دەم پێویستییەکانی خۆم و ئارەزووی منداڵەکانم بە چاوەڕوانی مووچەی سەر مانگ سەرکوت دەکردن. کە سەرمانگیش دەهات مووچەکە هەر ئەوەندە بوو وردە قەرزەکانی لێ بدەمەوە، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دەکەوتمە سەر ساجی عەلی، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا نەبوونی لە ئاست ئەو مێوانانەدا کە سەریان لێ دەدایین شەرمەزاری دەکردم، سوێندت لەسەرم نییە، تا سوێندت بۆ بخۆم لەو ماوەدا نەمتوانیوە جەژنێك پارچە جلێکی نوێ بۆ منداڵم بکەم.. خواو ڕاسا ڕۆژێك لەگەڵ بەڕێوەبەرکەمدا لەسەر شتێك بوو بە دەمە قاڵەمان، ئەویش- خوا ڕاسی بۆ بێنێ- ڕاپۆرتێکی لەسەرم نووسی و دە ڕۆژ لە مووچەکەمیان بڕی، کە ئەوەم دی لەو ڕۆژەوە وازم لە مووچەی خۆری هێنا.. ئێستا ئەم تاکسییە و



کۆستەرێکم هەیە، کۆستەرەکەم داوەتە دەست برازایەکم لە نێوان هەولێر و کەرکووکدا کرێی پێ دەکات.. دوو کوڕی هەرزەکاریشم هەن یەکێکیان دوکانی کەمالیاتم بۆ کردووەتەوە، ئەویتریان لە ئیبراهیم خلیل نووسینگەی جگەرە هێنانی هەیە، ساڵی یەکدوو جار سەفەری دەرەوە دەکات.. جاران لە برسان قۆڕەی سکمان دەهات، وا ئێستا خوا نەیبڕێ بە هەر کونێکی ماڵدا دەست ببەین پارە بە دەستمانەوە دێت...

وای وت بارامیش لە دڵەوە دەیوت خۆزگا منیش وام بکردایە.. کابرای شوفێر وەك لە ناو دڵی بارامدا بێ، پێی وت:

- خەم مەخۆ، نەچووە بچێ، سەرەتای ڕێگە لە ئەمڕۆوە دەست پێ دەکات.. چاوێکی پیاخشان، هێشتا زۆرت بە دەمەوە ماوە، تا زووە خۆت بە دەم گێژاوی کارەوە بدە، بە کۆیدا بگرسێتەوە لەوێدا شان بدەرە بەری.. بە دوای چووندا مەچۆ..

قسەکانی کابرای شوفێر چەند بڵێی بێ گەرد و سفت و سۆ بوون، لەگەڵ ئەوەشدا بارام گومانی دەبرد کە ئەو قسانە ڕێ خۆشکەرە بن بۆ شتێکی تر و لە دڵەوە دەیوت:

- تۆ بڵێی ئەم قسە فەلسەفیانەی ئەم شوفێرە بۆ سابوون و دەم چەور کردن نەبن کە لە کاتی دابەزیندا باجییان نەدەم؟..

کەچی وا نەبوو کە دابەزی بەقورسی دەستی بۆ بەرکی خۆی برد، کابرا وتی:

- ئەوە چی دەکەی؟..

- کرێکەت!..

- کرێ لە فەرمانبەران لە ڕۆژێکی وەهادا وەرناگرم...

بارام زۆری هەوڵدا کرێکەی لێ وەرگرێ، بەڵام لێی وەرنەگرت.

- خۆ لە قسەکانم سەخڵەت نەبووی؟.

- خۆزگا هەموو کەس وەك تۆ ڕاستگۆ بونایەن..

بریا ڕێگەمان دوور بوایە، تا پتر گوێت لێ بگرم و تۆش گوێت لە من بووایە..

- تۆ من ناناسی.. من تۆ چاك دەناسم، ڕۆژێك دەبێ پێکەوە دانیشین.. ئێستا من خەریکی خۆ ئامادە کردنم بۆ ئێوارە پێکمانەوە جەژنی نەورۆزت پیرۆز بێ، ساڵی داهاتوو —ئومێد- ساڵی ڕزگار بوونمان دەبێ.. بەر لەوەی بڕۆی حەز دەکەم لە برا بچووکی خۆتەوە ئەم وتەیەم لێ ببیسی..

- برا گەورەیت.. فەرموو گوێم لێتە..

– بڕۆ بە بۆنەی جەژنەوە، ئەو مووچە خۆریەی ناخت بکوژە و سەر لە نوێ خۆت بینا بکەرەوە.. مەترسە و گوێ بە تەشەری کەس مەدە.. وای وت و تێی تەقان...

بارام لەبەر خۆیەوە:

– هەی هەزارە جەژنە بێ..

لە هۆش خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد و دەیدایە بەر خەیاڵی خۆی:

– ئەوە کێ بوو؟! لە کوێ من دەناسێ؟! دیت چۆن بە گەرمی جەژنە پیرۆزەی نەورۆزی لێ کردم.. هەی هەموو فەرمانبەری لەوچەو زل و زەلۆری مشەخۆری دەزگاکان بە قوربانت بن.

لە جەژنی رەمەزان و قورباندا یەکتری دەلێسنەوە، هەر وەسە سانی سانانی کوردان لەو رۆژانەدا لە دایك ببێ و چووبێتە سەر تەخت.. نانی شەهیدانی رێگەی رزگاری کورد دەخۆن و خوێنەکانیان دەکەنە زێر و لە قاسەکانیان دەپەسێنن، یان لە مل و مەچەکی ژنەکانیان دەکەن، ئەوانیش لەو دوو جەژنەدا، خوێنەکە لە خۆیان دەئالێنن وەك ئێستری شەش دانگ خۆیان با دەدەن و یەکتری ماچ دەکەن، پێیان وایە لەو رۆژانەدا سوارچاکی خۆیان دۆزیووەتەوە و لەو ڕۆژانەدا دایك و باوکیان چوونەتە پەردەوە ئەوانی کێلاوە.. با ئەوانە دارزێن و بە قوربانی شوفێرێکی وەها خاوەن هۆش و کورد پەروەر بن. لەو دوو جەژنەدا پشووی رەسمی دەدەن، بۆ لای یەکتر دەچن، چی خۆش و بەتام بێ دەیخۆن، رەفتارە ناکوردانەکەیان بە خێر و خێراتی ریابازی تیف تیفە دەدەن، بەرات و خەڵات لەو دوو بۆنەدا دەبەخشن کەچی لە جەژنی خۆیاندا یەکێکیان جەژنە پیرۆە لەوی تریان ناکات.. بە خوا چاك بوو لە ناوتان نەمام...

با ئەم جەژنی نەورۆزە رایی بکەم، ئەوجا دەزانم چی دەکەم..

خۆم بە دەم ئەو دنیا بەرینەوە دەدەم هەر کاسبییەك هاتە پێشم شانی دەدەمە بەر، خۆ هیچ نەبێ ئێواران بە باخەڵی پڕ و روو سوورییەوە دەگەڕێمەوە ناو منداڵەکانم...

وتەکانی شوفێرەکە متمانەیەکی تری دا بەو نیازەی کە بارام ماوەیەك بوو لە دەرون خۆیدا رەچاوی کرد بوو، رووناکییەك بوو گشت دڵە راوکەیەکی لەو بارەوە رەواندەوە و ئەوەی بە سەریا هات بوو هەمووی حەشاردا و گەشی هێنا و رەشی داپۆشی..

وای دانا بوو بەر لە نوێژی عەسران سەری ماڵی خونچە بدات لە پەریخانی ژنی حاڵی ببێ و بزانێ لەبارەی جەژنی نەورۆزەوە چی دەڵێ، خۆ ئەگەر پێی وابوو تازییە و جەژنیان نەوتووە، ئەو کاتە پێی دەڵێ: ئاگری ئەمساڵمان بۆ ئازاد بوونی کەرکوکە و یادی هێنانە دی بەشێکە لە



ئاواتەکانمان، خۆ ئەگەر وتی: خەڵك تەشەرمان لێ دەدەن، ئەو کاتەش دەڵێم: جا ئەگەر ئێمە لە تەشەری ناحەزان بترسێین دەبێ دەست لە خۆمان بشۆین..

هەروەها لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەوە ئەمساڵ لەبەر تازیەیە، ئەی ئەوە نەبوو چەند ساڵانێك بەر لە ئەمساڵ تەشەرەیان لێ دەداین و منیش دەمکوتم دەکردنەوە و دەمووت:

– بڕۆن مردوتان مرێ چەند نەزان و مێشك قوفڵ دراون، لە جەژنەکانی تردا سمێڵتان چەور دەکەن و خوێنێکی زۆر دەمژن و ورگی خۆتان دەکەن بە چاڵی قەڵاچۆ کردنی پەلەوەر و ئاژەڵی بێ دەسەڵات.. کەچی ئاگر رێتان رووناك دەکاتەوە و هێزتان دەداتێ و مووسا ئاسا رێنماییتان بەرەو بارەگای یەزدان دەکات، ئەو کاتە مرۆڤ کە پێی هاوێشتە ناو رووناکی ئەژیارەوە ئەو رۆژە بوو لەبەر ئاگردا دانیشت.. دەستی مرۆڤ لەو رۆژەوە بووە بە پێشەنگی هۆشی کە ئاگری بە دەستەوە گرت.. ئاوا پلارم تێ دەگرتن و هۆشیارم دەکردنەوە.. لە گەرمەی ئەو خەیاڵاتانەدا بوو، رای خۆی سەبارەت بەدوا راو بۆ چوونی پەریخانی خێزانی گۆڕی و پەڕەیەکی تری بۆ لادایەوە و دەیوت:

– جەژن کردن و تازییە و ماتەمی هەوێنی یەکن و بڕوا ناکەم پەریخانی خێزانم بتوانێ بە ئاسانی لە تیلمەی ئەو بەند و باوەی کۆمەڵ بەو ئاسانییە خۆی لابدا، ئافرەت چەند مەعلان و کارامە بێ هەر ئافرەتە و کەچووە ناو کوڕی ئافرەتانەوە دەبێتەوە ئەو پەڕ قاقەزەی جاران، چی لەسەر نەخشکرابێ دەوری دەکاتەوە.. لۆچە لیخنەکانی ناو کۆمەڵ لە ناخی ئافرەتدا خۆیان مات دەکەن و درەنگ خۆیان بە دەستەوە دەدەن و بەئاسانی پاك نابنەوە..

هێشتا رۆژ بەرەو ئاوا بوون شۆڕ نەبووبووە و خۆر رووی ئاسمانەکەی بە خوێنی شەهیدان سواغ نەدابوو، حکوومەتی هەرێمی کوردستان بڵاوی کردەوە کە نابێ کەس ئاگر بکاتەوە، بەڵکو تەنها حکوومەت لە جیاتی خەڵك ئاگرێکی گەورە دەکاتەوە.. بڕیارێکی جوان بوو، بەڵام جوانتر وەها بوو داوای لە هەموو هاووڵاتیان بکردایە، هەر کەس مۆمێك لەسەربانی خۆی لەگەڵ هاتنی تاریکدا پێ بکات، ساڵان بۆیە لەگەڵ هاتنی زەردە پەڕدا منداڵان، خەڵك لە شەقامەکان، لەبەر ماڵەکان تایەی لاستێك و پووش و پلاشیان دەسووتان و چڕە دووکەڵیان بەردەدایە شارەکە، گوزارشت بوو دژ بە داگیرکەر و تەقینەوەی رك و کینە بوو دەربارەی رەفتارە بەدەکانی.

بارام کە گوێی لە بڕیارەکەی حکوومەتی هەرێم بوو، ئەو پووش و پڵاشەی کە بۆ سووتاندتی ئێوارەی جەژن ئامادەی کرد بوو نەی هێنایە پێشەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وازی لە ئاگر کردنەوەکە نەهێنا.

***

**(10)**

جەژن بۆنەیەکی نەتەوەیی و یاد کردنەوەیەکی مێژووییە.. بە یاد کردنەوەی سالآنەی لە دەروونی میللەتدا دەبێ و دبێتە مۆرکێکی نەتەوایەتی گەل، لە بیر بردنەوەشی دەبێتە مایە و رێ خۆشکەرەی تواندنەوە لە تۆنەی ئەوانەدا کە لەهەر چوار دەورمان مڵآسەیان بۆ کەوڵ کردنمان داوە...

مەشخەڵەی جەژنی نەورۆز لە سەردەمی داپلۆسینی کورددا خەریك بوو سەر نوگم بێ، رۆشنبیران فریاکەوتن، مەشخەڵەکەیان هەڵ کردەوە و دایانەوە دەست نەوەی نوێ، بە هەڵ گرساندنەوەی ئەو مەشخەڵە سەر لە نوێ نەتەوە لە خەوالۆ بوون بە ئاگا هاتەوە و ئاگرەکە بوو بە چەقڵی ناو چاوە نەگریسە برسییەکانی دوژمن، بارام بە باوەڕێکی بە تینی دوور لە گومانەوە دەیڕوانییە مەسەلەی نەورۆز، کە ئێوارە داهات ئەو چۆڕە نەوتەی کە بۆ چرای سووتەمەنی ماڵەوە دانروا بوو، چۆڕاندییە ناو قوتوولەیەکی بە تاڵی دۆشاوی تەماتەوە و هەندێ پڕو پیتاڵی خڕ کردەوە وەك پلێتە بەسەر بۆرییەکەوەی بەستن و لەسەر بەیتوونەی سەرەوەی خانووەکەیان قیتی کردەوە، لەمە تاریك داهات نەوتەکەی بەسەردا کردوو، گڕی تێ بەرداو، تاریکییەکەی ئەو ناوەی راو نا..

لەگەڵ داگیرسانی ئاگرەکە شریتەکەی ئێوارەی نەورۆزی ساڵی(1991)ی ڕاپەڕین و رزگار کردنی شاری کەرکوکی خستە ناو ریکۆردەکەوە مژدەی رزگار کردنی شاری بابا گوڕگوڕی بە هەموو کوردان و گەلآنی داگیرکەران داو بە دەنگە بەسۆزە و بەتینەکەی دەیوت ( کەرکووکە.. کاکە کەرکووکە) ئەوەی بەوێدا تێدەپەڕی هەڵوەسەیەکی دەکرد و سەیرێکی ئاگرەکەی سەر نەردەوانەکەی دەکرد و گوێی بۆ مژدە دانەکەی شاری ئاگر دەگرت هاوسێکانیش لە سەربانەوە بە کام و چێژەوە دەیانڕوانییە ئاگرەکە و گوێیان بۆ ئەو یاد کردنەوەی رزگاربوونی شاری ئاگری ئەزەلی کوردان دەگرت.. لە دڵەوە سەد ئافەرینییان بۆ بارام دەنارد و دەیانزانی ئەو هەر پیاوەکەی ساڵانی توند و تووشی جارانە، ئەو کاتە ئاگرێکی وەهای دەکردەوە توونە



تاریکەکەی شەمشەکوێرەکانی دەشڵەژان.. منداڵانی گەڕەك چاویان لەو دەکرد و هەریەك شاپلێتەیەکی نەوتاوی بە لوولە ئاسنێکەوە دەبەست و لەبەر دەرگا تا دەکوژایەوە خۆیان پێی خەریك دەکرد و دووکوڵی رەشیان بە قوڕگی دوژمنانی کوردا دا دەئاخنی..

منداڵان لە هەموو گەڕەك و گۆرەپان و شەقامێکدا شڕە و پڕە و کۆنە تایەی ئۆتۆمبێل و تراکتەر و پاسکیلیان خڕ دەکردنەوە لەگەڵ ئاوا بوونی رۆژدا ئاگریان تێ بەر دەدان و شارەکەیان لە ناو چڕە دووکەڵی رك و قینی پیرۆز دەرحەق بە رژێم دەردەبڕی، رژێم سەر لە ئێوارەی نەورۆز هەوڵی دەدا بەهەر جۆرە بووە کنترۆڵی ئەو رەوشە بکات و رکێفی منداڵان لە دەست بگرێ، بەڵام بێ سوود بوو، بە ناوی دین و بە هەڕەشەی کوشتن و گرتن و خۆراك بڕینەوە گوڕەشەی دەنواند بە هۆی پۆلیسی فریاکەوتن و هاتووچۆ و ئەمن و رێکخراوی گەڕەك و موختارەکانەوە لە هەوڵدا بوون ئەو ئاگرە نەکرێتەوە، بەڵام تا دەهات خەستر دەبووەوە بە تایبەتی پاش ئەنفال کردن و کیمیاوی بارانەکەی رژێم، لەهەر شوێنێ ئاگر مەشخەڵەی بدایە زوو دەیگەیشتنی و دەیانکوژاندەوە، گەلێ جاریش پۆلیسە کوردەکان کە دەگەڕان بە فەرمانی رژێم ئاگرەکە بکوژێننەوە لەمە دەرفەتیان بۆ بڕەخسایە خۆیان نەوتیان بەسەر ئاگرەکەدا دەکرد بۆ ئەوەی باشتر مەشخەڵە بدا... ئیدی رژێم لەو ساڵانەی دوایی دا بەر لە بەرپا بوونی راپەرین لە دەست ئاگر کوژاندنەوەی ئێوارەی نەورۆز وڕس دەبوو، دەرەقەتی کوژاندنەوەی نەدەهات، ناچار بوو بەهانەیەکی تر بدۆزێتەوە بۆ واز هێنان لەو ئاگرە، گوایا ژینگە پیس دەکات یان لەگەڵ ئایندا ناگونجێ، کۆنە پەرست و داخ لە دڵ و تەفرە دراوانیش رەواجیان بە قسەکانی رژێم دەدا! خۆ ئەوانەی کە ئاگریان دەکردەوە مەبەستیان بوو بەو ئاگرە چاوی ناحەزان و خۆفرۆشان کوێر بکەن.. مەسەلە خودی ئاگرەکە نەبوو، بەڵکو جۆشدانی بیری کوردایەتی و گەشاندنەوەی گیانی نەتەوایەتی بوو.. لە سەرەتای شۆڕشدا، پێشمەرگە لە قەدپاڵ و سەر لووتکەی شاخەکان ئاگری نەورۆزیان دەکردەوە، بەوە مژدەی دوا رۆژێکی رووناکیان دەدا و پیرۆزبایی ساڵی نوێیان دەکرد و بڕوا و متمانەی خۆیان بە دوا رۆژێکی رووناك لە دڵی خەڵکدا تازە دەکردەوە... ئەو ئێوارە لە سەر بانی ماڵەکەی بارام و لەسەر تەلاری شیراتوون نەبێ کەسی تر ئاگری نەکردەوە! ئەم لە سەرەوە تاریکی راو دەنا ئەو لە خوارەوە، ئەم بۆ چەسپاندنی دەسەڵات بوو ئەو بۆ بەردەوام بوونی ئەو بیرو باوەڕە بوو کە لە ناخی گەل دا جێگێر ببوو، ئەو زاری حکوومەتی کوردستان بوو بە حکوومەتی رژێمی راگەیاند: بە بانگەوازێك جگە لە بارام کەس ئاگری نەکردەوە. بەرپرسی ئاگرەکەیان خستە ئەستۆی حکوومەتەکەیان چونکە دەزانن حکوومەتەکەیان

گوزارشت لە ویژدانیان دەداتەوە و بەر جەستە بوونی ئەو ئاواتانە بوو کە بە خوێنی شەهیدان نووسراوە.. بەڵام ئاگرەکەی بارام دەنگی گەلە و خەفە نەبووە..

نیشانەی رانەوەستاندنی گەلە.. ئاگرێکە چاودێری هەنگاوەکانی حکوومەتی نیشتمانی هەرێم دەکات..

بەیانی جەژنی نەورۆز بوو، بارام و منداڵەکانی لەسەر خوانی بەیانیان دانیشتبوون، گزەنگی رۆژ لە کەلێنی هەورە خەست و ماتەکەوە هات و لە پەنجەرەی ژوورەکەیانەوە چەپکە تیشکێکی ئاوێزانی بە ناو خوانەکەدا پەخش کرد...

لەگەڵ یەکەم پارووی نان خواردندا لە دەرگای دەرەوە درا.. بارام بە پەلە پاروەکەی قووت داو دەم و دندانی بەسەری زمانی خاوێن کردەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێك ئەوی ویست ئامادە بێ.. یەکێك لە منداڵەکانی بە پەلە بەرەو دەرگای دەرەوە رۆیشت...

بارام چەند ختوورەیەك بە دڵێدا هاتن:

- داخۆ کەسێکە پێویستی بە شتێ هەیە..

هەرگیز فیکری بۆ ئەوە نەدەچوو وەك جەژنەکانی قوربان و رەمەزان هاوسێیەکیان کاسە جەژن بگۆڕێتەوە و جەژنە پیرۆزانە و گەردن ئازادی لە یەکتر کەن و ساڵی پێشو بەرێ کەن و رووی گەشی هەوڵ و تێکۆشان بکەنە ساڵی نوێ.. بیریشی لەوە نەدەکردەوە کە جاران لەمە لە دەرگا دەدرا راستەوخۆ بیری لە هاتنی جاندرمە و ئەمن و بکوتەکانی رژێم دەکردەوە، ئەوانە ئێستا نەماون، ئەو سەردەمە رۆیشت و گۆڕ بەگۆڕ بوو، لەو سەردەمەدا کە لە دەرگا بدرایە مرۆڤ وێنای چاکە خوازی نەدەکرد... بەڵکو مرۆڤ تا بۆی دەردەکەوت ئەو دەرگادانە هاتنی جاندرمەکانی رژێم نین لە دڵەوە بە رۆژانی رابردووی خۆیدا دەچووەوە دەیخوێندنەوە و دەیوت: داخۆ دوێنێ چ قسەیەك لە دەمم دەرپەڕیووە، داخۆ بە چ وتەیەك پێکەنیوم و نەمزانیوە پلار دانە لە رژێم!.. ئەو جۆرە وێنانە و ختوورەیە لە کاتی لێدانی دەرگادا ترس و تۆقینێك بوون لە زوڵوماتی کوشتن و بڕین و سەر نوگم کردنی رژێمەوە هاتبوون، ئەو خۆی لە خۆیدا کارەساتێکی کەم نییە.. سەیرە یەکێك لە دەرگا بدات راستەوخۆ هۆشی مرۆڤ بەلای خراپەدا بڕوا! نەك بەرەو چاکە..

بارام ناحەق نەبوو لەگەڵ دەرگا لێداندا بەلای ئەو شتانەدا بڕوا، چونکە ئەوەی هەیە و چاوی کراوەتەوە جگە لە کوشتن و گرتن و مردن و راونان چیتری بەرچاو نەکەوتووە، لەوەتەی هەیە رۆژێك نەدیتبوو خەڵکی ئەم وڵاتەی ئۆخەی لە خۆیان بکەن.. نەك هەر لە سەردەمی



ژیانی ئەودا، بەو چیرۆك و بەیازانەی بەر ئاگردانی کوردەواریشدا دەردەکەوێ باو باپیرانیشی هەمیشە بەشیر و تیر ترسێنرابوون، لەبەر ئەوە بە خۆی دەوت:

- بڕوا ناکەم لەم وڵاتی ئێمەدا یەکێك لە دەرگای بدرێ یەکسەر بیری بەلای هاتنی مێوانێکی ئازێزدا بڕوات..

دەرگا کرایەوە، بارام دی یەکێك لەگەڵ منداڵەکەیدا کەوتە قسەکردن.. منداڵەکە بەرەو دوا گەڕایەوە و دەنگی هەڵبڕی..

- بابە.. بابە!..

لایەکی دەرگا کرابووەوە کڵاوی پۆلیسێك لە درزی دەرگاوە بە دەرکەوت.

- بابە پۆلیسێکە دەڵێ" ئێرەماڵی بارامە؟" وەرە بزانە چی دەوێ!..

بارام خۆی نەپەشۆکاند بە ئاستەم و لەسەر خۆ بەرەو دەرگا چوو..

دەیوت:

- چی تیایە، پۆلیس، پۆلیس خۆمانە، دیارە کارێکی رەسمی پێ راسپێدراوە.. جا خوا دەکا ئەوان گوێ رایەڵی یاسای حکوومەتی کوردستان دەبن، حەپسیشمان بکەن خەڵاتە.. ئۆخەی ئەمە ئەو رۆژەیە کە ئاواتمان بوو حکوومەتی نیشتمانی خۆمان هەبێ، ئۆخەی وا هەیە و خەون نییە و راستییە، ئەوەتا پۆلیسیشی هەیە..

لەخوێنی شەهیدان بە زیاد بێ کەوا هاتووەتە بەرهەم.. دەرگاکەی کردەوە..

- فەرموو برا.. جەژنت پیرۆز بێ..

کابرای پۆلیس وەرامی جەژنە پیرۆزەکە نەدایەوە!.. بارام لە دڵەوە دەیوت:

- دیارە یان زۆر بێ ئاووزە یان هەر پۆلیسەکەی جارانی رژێمە و بەجێ ماوە، وا ئێستا لە پەنای حکوومەتی نیشتمانی دا خۆی مات کردووە..

- تۆ بارامی!؟..

- بەلێ خۆیەتی...

- وەرە لە مەخفەری گەڕەك داوات دەکەن..

- خێرە..؟..

- نازانم خەیرە، یان خێر نییە.. داوات دەکەن..

بارام زوو هاتە دەم

- کوا پسووڵەی تەبلیغت پێیە!؟ تا ئیمیزای بکەم و دوای کەمێکی تر بێم!..

- نا وەرە لەگەڵم..

بارام زەردەخەنەیەکی پڕ بە پێزی نواند:

- چۆن بێم لەگەڵت!.. کێ دەڵێ تۆ پۆلیسی ئەو مەخفەرەی!..

- ئەگەر پۆلیس نیم ئەی چیم!؟..

بە زەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزەوە:

- کوڕم ئەوە خۆت دەزانی ئەوی؟. ئەو نیت!.. پسووڵەی تەبلیغ بێنە و بۆت ئیمزا بکەم..

پۆلیسەکە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو هیچی پی نەوترا.. لەبەر دەرگاکە چەقی بەست" نەیزانی چی بکات..

بارام بە توندی خۆی نواند و وتی:

- کۆڕی باش تەبلیغی رەسمی نەهێنی نایەم.. ئەوەی تۆی ناردووە، پێی بڵێ وای وت: (تەبلیغی رەسمی نەبێ نایەم)..

دەرگاکەی پێوە داو بەرەو دواکشایەوە..

پۆلیسەکەش هەندێ لەبەر دەرگا راما و لە پاشەدا بەلۆژە لۆژ بەرەو مەخفەر گەڕایەوە..

بارام بە توندی لەگەڵ پۆلیسەکەدا جووڵایەوە کەچی لەدڵەوە ئەو رەفتارەی خۆی لا پەسند نەبوو، لە دڵەوە سەرزەنشتی خۆی دەکرد و دەیوت:

- هەر چەند هەڵوێستەکە وای دەخواست، بەڵام تۆ بڵێی ئەگەر ئەو پۆلیسە کورد نەبووایە ئەو کات بمتوانایە بەو جۆرە لەگەڵیدا بدوێم!؟.

بەڵێ لەم رۆژانەدا پیاو چۆن بە قسەی پۆلیسێك بەرەو مەخفەر دەڕوات.. دیار بوو کابرای پۆلیس بە نەبەدڵی کاری دەکرد و بڕوای پێی نەبوو.. بارام بەو جۆرە، دەیوویست پاساو بۆ هەڵوێستەکەی خۆی و پۆلیسەکە بێنێتەوە، لە لایەکی ترەوە بەزەیی پیا دەهاتەوە و دەیوت:

کێ ناڵێ ئەویش کوردێکی کلۆڵ نییە، ئەی ئەوە نەبوو ماوەیەك لەبەر دەرگا هاتووچۆی کرد لە دواییدا بزر بوو!..

بارام لە خۆی دەپرسی:

- بۆچی لە پۆلیسخانە بانگم دەکەن؟.. دیارە ئەمرۆ پشوی جەژن نییە!.. جا پۆلیس پشوو دەزانن چییە!.. تۆ بڵێ بۆ ئەوە نەبێ چونکە ئاگری نەورۆزم کردبێتەوە! جا ئەگەر وابێ جیاوازی لەنێوان حکوومەتی هەرێم و رژێمدا چییە!.. ئەی ئەوانیش لەبەر ئەوەی ئاگری نەورۆزم



دەکردەوە لەو مەخفەرە بانگیان نەکردم! جا ئەگەر وابێ چۆن جیاوازی لە نێوان حکوومەتی خۆمان و رژێم دا بخەم..

ئەوە بوو چەند ساڵێك لەمەو بەر بەیانی زوو بۆ (منظمة)کەی تەنیشت مەخفەر بانگ کرام، چونکە ئێوارە ئاگری نەورۆزم کردبووەوە، ویستیان بیکوژیننەوە نەم هێشت.. ویستیان بە ناوی ئاییینەوە سەرزەنشتم بکەن، پێم سەلماندن کە ئاگر بەشێکە لەنووری خوای گەورە، هەر ئەو دەمە وازیان لێ هێنام و گەڕامەوە، تۆ بڵێ ئەم بانگ کردنەم وەك هەمان بانگ کردن نەبێ!؟..

شلێر کە زانی باوکی خەیاڵی بەلای شتێکدا رۆییوە رووی تێ کرد و وتی:

- بابە.. ئەو پۆلیسە چی دەویست..

بارام ویستی شتەکە سانا بکات و وتی:

- شتێکی وا نەبوو.. وتی: وەرە بۆ مەخفەر..

- بۆ مەخفەر!؟..

- بەڵێ.. دڵتان ختوورە نەکات هیچ نییە..

- ئەی دوایی؟..

- وتم برۆ تەبلیغی نووسراو بێنە ئەوجا دێم..

یەکێك لە منداڵەکانی:

- بابە نەچی..

بارام دڵی دایەوە...

- نا.. هیچ نییە.. با تەبلیغی نووسراو بێنی، ئەوجا دەچم.. یەکێك لە منداڵەکانی:

جا مەخفەر لە دیوارە رەقەکە بەولاوە چی ماوە تا تەبلیغی پێ بنووسنەوە..

بارام ئەو تێبینییەی لا پەسەند بوو، بۆیە ئەم قسەی خستە بانی وتی:

- زمانە عەرەبییەکەیان لێ رووخاوە و کوردییەکەش لای ئەوان دانەمەزراوە!

مەسەلەی شکاندنی فەرمانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەربارەی ئاگری نەورۆز نزیکترین رووداو بوو لای بارام، بۆیە یەکەمجار بیری بۆ ئەو لایەنە, دەچوو، دەنا خۆ مەسەلەی بەرمیلەکەو رووداوی بەنزینخانەکەی دوێنێ سێبەری بۆ هەموو بیر و هۆشێکی کرد بوو، وای بڕیار دابوو پاش جەژنی نەورۆز بە دوای سۆراخ کردنی بەرمیلەکەیدا بڕوا و وازی لێ نەهێنێ، وای دەزانی واز هێنان لەو بەرمیلە واز هێنانە لە نەوتەکەی کەرکووك... ئەو خۆی بە نموونەی هەموو کورد دەزانی، بڕوای بەم پەندە هێنابوو (مشتی نموونەی خەرمانێکە)...

هێشتا چێشتینگا بوو ئۆتۆمبیلی سەیرانکەرانی ڕۆژی نەورۆز بە بەردەرگایاندا خوار دەبوونەوە.. بۆ ئەوەی دڵی منداڵەکانی بداتەوە و سەیرانیان لە بیر بچێتەوە، وای پیشان دا کە مادامەکی دایکیان لەوی نییە و تازییان هەیە باشتر وایە لە ماڵەوە ئۆقرە بگرن وای دایە قەڵەم ئەوانیش کە دەچن، ئەو ماڵانەن کە بەهۆی شەڕی برا کوژی وێرانکارییەوە خۆیان دەوڵەمەند کردووە، بەڵام یەکێك لە منداڵەکانی قسەیەکی وای کرد بارام خەریك بوو نەتوانی پاساوی بۆ بێنێتەوە کە وتی:

- باسی تازییە مەکە.. جا ئەگەر وایە، ئێوارە بۆ تاکە کەس لە گەڕەك ئاگری کردەوە تۆ بووی! تاکە کەس ریکۆردی کردەوە و زەماوەندت بۆ کەرکووك گەرم کرد هەر تۆ بووی! کامەیە تازییە؟!

بارام فریای خۆی کەوت دەم و دەست ئەم وەرامدانەوەی کردە بەر بەرچی ئەو منداڵەی کەوای وت:

- نا..! ئەوە جیایە و ئەوەش جیایە!.. گیانی شەهیدان کە خونچەش یەکێکە لەوان وایان پێ خۆشە، ئاگری نەورۆز نەکوژێتەوە، زەماوەندی رزگاری بوونی شاری ئاگر بگێردرێ.. شلێر کەوتە بەینەوە و وتی:

- خەڵك ئەو دیو نابێنێ، تەنها چاویان پێوەیە، چاویش تەنها سەیری ئەم دیو دەکات، ئەوەی تۆ دەیڵێی هەر خۆت دەیزانی:

جا ئەگەر واش نەبێ کوا ئێمە سەیرمان پێ دەکرێ...

تا چاومان لە مووچە بێ ئەمە سەرەمانە و ئەوەش دەرەمانە... قسەکەی شلێر سەری بابەتەکەی قاپات کرد و هەموو برینەکانی باوکی کولاندەوە... بۆیە بە گەرمییەوە وتی:

- لە ئەمڕۆ بە دواوە، ئێمە مووچە خۆر نیین..

شلێر بە وتەکەی باوکی راچڵکاو بەبێ هەدەر وتی:

- ئەی!؟..

- ئەی!.. ئەی!.. تۆ ناڵێی تا وابین ئەمە سەرەمانە و ئەوەش دەرمانە؟!..

شلێر خەریك بوو لەوتەکەی پەشیمان بێتەوە و نەوازش پیشان بدات، بۆیە وتی:

- باوکە من مەبەستم ئەوە نەبوو..

بارام وتەکەی شلێری بڕی و وتی:



- وتەکەت تەواوە بە دڵم بوو حەزم کرد وات وت، ئەمڕۆ نەورۆزە دوا ڕۆژی زستانە و یەکەم ڕۆژی بەهار، لەرێکەوتی بەیانییەوە من مووچە خۆر نیم..

- ئەی چی؟..

- مووچە خۆر نیم.. ئیتر جارێکی تر من بە بۆیباخ و قاتی ئەفندییەوە نابینی.. بارامی ئەفەنی نەما..

شلێر و سەرجەم منداڵەکان وتەکەی باوکیان لا سەیر بوو، گەلێ بە دڵنیاییەوە، قسەی دەکرد، لەو ڕۆژەدا کە دنیا وەك ئەشکەوتێکی تاریکی لێ هاتبوو خەڵك لە ناویدا بە سەریەکدا کەوتبوون و دەست بەتاڵ بوون سکی خۆیان بە شانیادا دابوو دەبێ لە شوێن و زرووفێکی وەهادا، کە دەسبەرداری ئەو سەرە داوەی بژێوییان بێ؟.. داخۆ چۆن چۆنی کارێکی تری گوزەرانیان بۆ مسۆگەر دەکات!؟ روو لە کوێ دەنێ؟

شلێر لەوە دەترسا باوکی تووشی نەخۆشییەکی دەروونی بووبێ.. یان بە کارێکی نا پەسەندەوە تلا بێ، ویستی لەو بارەوە بیدوێنێ، تا دڵنیا بێ، یان هیچ نەبێ ئەو وتەی کە لە دەمی ترازا مەبەستی تانەدان نەبوو.. دەمی کردەوە شتێ بڵێ.. لە پڕ زەنگی تەلەفۆنەکەیان لێی دا..

بارام تەلەفوونەکەی هەڵگرت:

- هەلۆو!؟..

- ماڵی کاك بارامە؟!...

بەڵێ خۆیەتی..

- بۆ ماوەی یەك کاتژمێری تر لە پۆلیسخانەی خانەقا ئامادە دەبی.. دەنا پۆلیس دەنێرم بت هێنن!..

- نابێ بزانم بۆ؟

- کە هاتی دەزانی..

تەلەفوونەکەی داخست..

بارام منداڵەکانی کەوتنە ناو گۆمی بیر و گومانەوە.. بارام لە دڵەوە دەیوت:

- دیارە لە پشت هەر هەنگاوێکی نوێدا نیازێکی تاریك خۆی حەشار داوە.. دەبێ کارەکە ئەوەندە گرنگ بێ خۆم نەرۆم پۆلیس بنێرن بە خورتی بمبا!.. سەیرە!.. منداڵەکانی شڵەژان و

چاوەڕوانی دەمی باوکیان دەکرد کە شتێ بڵێ، چونکە بە گوێرەی وتەکەی کە وتی(نابێ بزانم بۆ..).

دیار بوو شتێك رووی داوە، لەگەڵ وتەکەی نیشانەی سەرسامی لە نێوچاوانی وا خۆی نواند کە شتێکی نابەدڵ هەڕەشەی لێ دەکات.. بۆیە یەکێك لە منداڵەکانی خۆی پێ نەگیرا و وتی:

- بابە.. ئەوە چی بووە؟!..

بارام زوو هەموو شوێنەوارەکانی ئاخاوتنی تەلەفوونەکەی لەسەر نیگای خۆی سڕیەوە ووتی:

- شتێکی وا نییە.. دیارە دەڵێن، بۆ بەکردنەوەی ئاگری نەورۆز سەر پێچیت لە فەرمانەکانی حکوومەتی هەرێم کردووە. بۆ ئەوەی دەمی بەرو هاوسێ نەکاتەوە و هەڵاوی ناو هەناوە بۆگەبنیەکانی خۆیان بەرووی ئەودا نەدەن، بڕیاری دا بۆ پۆلیسخانەکە بڕوات.. بەو رۆیشتنە دەمی هەندێ کۆنەپەرستان و چڵکاو خۆران قاپات دەکات، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە بیروڕاکانی دەسڵەمینەوە و وا مێشکیان قانگدرا بوو: نابێ کورد ببێ بە خاوەنی خۆی!!.

خۆ ئەگەر پۆلیس بهاتبا و بارامیان ببردبا، ئەو جۆرە کەسانە دەرفەتیان بۆ دەهات و هەزار و یەك ناتۆرەی نابەجێیان بۆ دەتاشی، لەوانەش بوو لە دڵەوە، دەیانوت: دەبخۆ ئەمە ئەو رۆژەیە کە تۆ بۆی مرد بووی، دەی قەدری عافیەت بزانە!..

ئەو منداڵەکانی واتێگەیاندن- خۆیشی لەو گومانەدا بوو- لەبەر کردنەوەی ئاگرەکەی ئێوارەیە و شکانی فەرمانی حکوومەتە..

ئەوانیش دەیانزانی هەموو ساڵێك بەو بۆنەوە بۆ پۆلیسخانەو و (منظمة) بانگ دەکرا.. خەمی ئەوەی لێ نیشتبوو منداڵەکانی تووشی پووکانەوە بن، شتەکە باش لێك نەدەنەوە، وا بزانن ئەوەی باوکیان بۆی تێ دەکۆشی جگە لە نەهامەتی شتی تری لێ سەوز نابێ..! راستە هەموو کەس ئاگری نەورۆز دەکاتەوە بۆ ئەو رۆژەیە، بەڵام هی ئەو بە مانایەکی تر بوو.. بە ئاسایی خۆی گورج کردەوە.. بەر لەوەی خوا حافیزی بکات وتی:

- لە پۆلیسخانە بانگ کراوم.. هەر ئێستا دەڕۆم و دەگەڕێمەوە..

ئەگەر پتر لە کاتژمێرێکم پێ چوو بە دوامدا وەرن...

***



## (11)

تاکە کەس کە لەبەر دەرگای پۆلیسخانەکە راوەستا بوو ئەو پۆلیسە بوو کە بە بارامی راگەیاند لە پۆلیسخانە ئامادە بێ.. کەبارام بە بەردەمیدا تێپەڕی بە تەوسەوە پێی وت:

- لەگەڵ مندا بهاتبای باشتر نەبوو!..

بارام گوێی نەدایە، هەندێ نێوچاوانی لێ گرژ کرد و خۆی کرد بە ناو پۆلیسخانەکەدا، پێی وابوو ئێستا یەکدو و پۆلیس فەرمووی لێ دەکەن و دەیبەنە لای بەر پرسیاری پۆلیسخانەکە.. پۆلیسەکەی بەر دەرگا بە دوایدا چوو بە شێوەی فەرمان پێی وت:

- راوەستە تا خەبەر بە سەرۆکی عورەفا دەدەم..

چووە ژوورەوە دوای چەند چرکەیەك هاتە دەرەوە، بە ئاماژە بارامی تێگەیان کە چاوەڕوان بێ..

بۆ ماوەی چارەکە ساتێك بە حەوشەکەدا هاتووچۆی کرد و لێکی دەدایەوە، پشی بە حەوشە تەسك و پۆخڵاوەییەکە دەگوشرا و هۆشی تیایدا کۆت دەدرا، سەیری هۆدە تاریك و پەنچەرە ژەنگاویەکانی دڵە پڕ کینەکانی نەژاد پەرسانی دەهێنایەوە یاد.. لە هۆدەیەکی تەسك و تاریك و رزیوی دەرگا ئاسنینی ژەنگاوی قوفڵدراودا، چوار دەم و چاو لە پشت کونی دەرگاکەوە وەك ئەستێرەی ناو تاریکە شەو دەدرۆشانەوە، یەکێکیان بە بارامی وت:

- خاڵە جگەرەمان نەماوە، ئەگەر پێتە سەرەو جگەرەمان بدرێ..

بارام ویستی لێیان نزیك ببێتەوە، پۆلیسەکە تێی خوڕی..

- نزیکیان نەکەویت...!

- بۆ لە ژووری ئیعدام دان!؟.. خۆ نایان فڕێنم..

یەکێك لە بەند کراوەکان بانگی کرد:

- مامۆستا بارام ئەوە لێرە چی دەکەی؟!..

بارام هەندێ لێیان نزیك بووە و سەرنجی ئاراستەی خاوەن دەنگەکە کرد و وتی:

- من کاروانی مەلا جەوهەرم.. بە قوربانی کەوشەکانت بم بە ماڵ خۆمان بڵێ خەم نەخۆن ئەوە من لێرەم، ماوم.. بارام ویستی بڵێ ئەوە بۆ گیراوی، بەڵام کابرای پۆلیس دەرفەتی نەداو بەرەو ژووری سەرۆکی عورەفا بردی.. پیاوێکی کەتەی، چوار شانەی قەڵەوی جامدانە بەسەر لەوێ دانیشتبوو، لاقی لەسەر لاقی دانابوو، سەرۆك عورەفای پۆلیس بە تەوازوعەوە بەرامبەری لە پشت مێزێکی شەق و شڕ دانیشتبوو گوێی بۆ قسەکانی کابرا شل کرد بوو، ئەم وەك سەرەك ئاغایەك دەدوا و ئەویش وەك نۆکەرێك بۆی بە چۆکدا هاتبوو..

- ڕۆژتان باش..

بارام وای وت. سەرۆك عورەفا ویستی لێوی وەرامدانەوەی بۆ بجولێنێ، بەڵام کە زانی کابرا بایەخی نەدایە و وەرامی نەدایەوە، ئەویش (ژیانت باش)ەکەی خۆی لە ناو زاری خۆیدا تواندەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا بارام گوێی لێ بوو کابرای جامدانە بەسەر مڕاندی و بۆڵەیەکی لێوە هات! وا چوو بە گوێیدا کە وتی:

- ئەو جۆرە قسانە دایکی ئێمەی(...)!...

بارام باش لە بۆڵەکەی کابرا حاڵی نەبوو، بەڵام بایەخ پێ نەدانەکەی ئەو گومانەی لا بەهێز کرد کە شتێکی خراپی وت، لێشی تێك چوو کە ئایا ئەو مڕەیە کە کردی کلکی بەردەوام بوونی قسەکانی نێوان خۆی و سەرۆك عورەفا بوو یان بەرپەچ دانەوەی ڕۆژباشییەکەی ئەو بوو، دەنا بارام دەیزانی چۆن ناڵی دەکات.. نەچووە بچێ دووبارەی دەکاتەوە، ئەو کاتە شتەکەی بۆ ساغ دەبێتەوە.. ئەم لەوێ وشك ڕاوەستا و ئەوانیش لە قسەی خۆیان نەکەوتن، بارام بە ئەنقەست ویستی ئەو پەتەی نێوانیان بپسێنێ، بۆیە هاتە دەم و بە متمانەیەکی بە تینەوە وتی:

- جەنابی سەرۆك عورەفا ئیشتان بە من هەبوو؟..

سەرۆك درەنگ هاتە وەرام، نەیویست لە پڕ قسەکەی کابرا وەك بنیشتی نەجوراو لە دەمیا ڕاگرێ.. دوای کەمێ وتی:

- ئەی بەبێ ئیش کەس بانگ دەکرێتە ئێرە..

- حەز دەکەم بزانم ئیشەکە چییە؟..

- ئیشەکەت؟!..

- بەڵێ..

هەندێ خۆی بێ دەنگ کرد، ئەوجا سەری هەڵبڕی و بە تەوسەوە ڕووی تێکرد و وتی:



تۆ بارام ئەفەنی؟!..

- خۆیەتی؟؟

- کێ تۆی هێناوەتە ژوورەوە؟.

- ئەی ئێوە منتان داوا نەکردووە!؟..

- بڕۆ دەرەوە ڕاوەستە تا بەر پرسیاری پۆلیسخانە دێتەوە، ئەوجا ئیفادەت لێ وەردەگرێ..

- ئیفادە؟..

- بەڵێ.. جارێ فەرموو لە دەرەوە ڕاوەستە..

بارام بردنە ژوورەوە و هێنانە دەرەوەکەی بە سووکایەتییەکی گەورە زانی بە تایبەتی بە ئاگاداری ئەو کابرایە کە ئەگەر بە کەرێك بیگۆڕیتەوە زەرەرە..

لە دەرەوە ڕاوەستا، مات بوو، دڵی پڕ کەسەر بوو بەتایبەتی بە بۆڵەی ئەو وڵاغە کە لەوێ دانیشتبوو، خەمی ئەوەی هەبوو لە دەستی دەرچێ بزمارێك لەناڵەکانی نەدا..

باشە ئیفادەی چی؟ چی قەوماوە؟ چی ڕووی داوە؟.. کۆمەڵە پرسیارێك لە ناو کاسەی سەریا گینگڵەیان دەدا، وەك جنۆکەی سەر کانیاو هەڵکوت و داکوتیان بوو، ئەوەی لە خۆیدا شك دەبرد و ئەوەی بە بیریا دەهات جگە لەو شتانەی کە لە ماڵەوە بیری لێ دەکردنەوە شتێکی تری کە شایستەی ئیفادە وەرگرتن بێ نەدۆزییەوە، دڵی بەوە خۆش بوو دەیوت:

- ئەگەرئەوەی بۆی بانگ کراوم نالەبار بووایە ئیفادەی نەدەویست و یەکسەر ڕەوانەی ئاسایش یان مەحەتەیان دەکردم.. یان هیچ نەبێ لە ژووری چاوەڕوانینیان دەپەساندم، بەڵام مەسەلەی ئیفادە وەرگرتنەکە کاسەی سەری کاس کرد بوو،

لەبەر حۆیەوە دەیووت: ئەمەش لە دوو حاڵەتدا دەبێ، ئەگەر گوناح بار بووایە لەماڵەوە تا پۆلیسخانە کەلەمچە دەکرام دەخرامە ژووری چاوەڕوانییەوە تا ڕۆژی دادگا.. مادامەکی لە کونەکەیان نە پەساندووم دیارە تۆمەتەکە تاوانێکی وا نییە.. کێ دەزانێ لەم ڕۆژانەدا پیاو چەندان تۆمەتی دەدرێتە پاڵ و بە خۆشی نازانێ..

بارامێکی وا ڕەوشت باش و دڵسۆز و بێوەی هەرگیز بە بیریا نە دەهات وا بەو جۆرە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ناو حەوشەی پۆلیسخانەیەکدا چاوەڕوانی پۆلیسێك بکات کە هۆشی لەبەر پێی خۆی بەو لاوە بینا ناکات، یان بەو چەشنە لە گەڕە پۆلیسێکی لاکەوتە، ڕۆژباشی لێ بکات لێوی نەجوولێنێتەوە، ئەو بیری بەلای ئەوەدا نەدەچوو کە گەلێ ڕێزی لێ نراوە، چونکە ئەوەی بۆ پۆلیسخانە بانگ بکرێ بە سەلامەتی دەرناچێ، سەلامەتی و کونە ڕەشەکە خەڵاتی

پۆلیسخانەیە ئەوەتا هێشتا بۆ سووتی داخکردنی بەعسییان شریقەی لێدانی کێبڵ و قولاپەکانی سێدارەدان لەوی شاخەیان کردووە..ویستی بەرەو دەرگای ئەو کۆڕە بڕوا کە لێی پارایەوە و وتی :(بە ماڵی خۆمان بڵێ خەم نەخۆن ئەوە من لێرەم ماوم). تا بزانێ بۆچی گیراوە و پێویستی بە چی هەیە، هێشتا هەنگاوێکی بەرەو ئەو هۆدەیە نەنابوو، لە پشتەوە هەستی سرمەی (سەلامخود)ی پۆلیسەکەی بەر دەرگا و هاتنی ئەفسەرێك کرد، رووی وەرچەخاند و دی: ئەفسەرێکی رەشتاڵەی دوو ئەستێرە لەسەر شان کردی بە ژوورەکەدا کە سەرۆك عورەفا و پیاوە کەللە زلەکەی تیا دانیشتبوون، بارام بەبێ پرس بە دوایدا کردی بە ژوورەکەدا، هەردوو زەلامەکە لەبەر ئەفسەرەکە هەڵسانەوە و جێیان بۆ بەتاڵ کرد.. بەڵام بایەخیان بە بارام نەدا..

بارام سەیرێکی ئەفسەرەکەی کرد و زوو ناسییەوە و لە دڵ خۆیدا دەیوت:

- کوڕە.. خۆ ئەمە ئەو زەلامەیە کە لە بەیانی راپەڕینەکەدا لەسەر بەیتونەی ئەم پۆلیسخانەدا لە پشت رەشاشێکەوە راوەستا بوو پارێزگاری ئەم شوێنەی دەکرد، ئەو کاتە بەم پۆلیسخانەیان دەوت (منظمة یرموك). ئەم ئەفسەرە خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی خەڵکە راپەڕیوەکە بترسێنێ و نەهێڵێ نزیك بکەونەوە، ئەوە بوو من و حاجی زراری هاوسێمان کە یەکەمجار پەلاماری دەست بەسەرا گرتنی ئەم بنکەیەماندا، ئەمە ویستی بە رەشاشەکەی بمانترسێنێ، حاجی زرار دەنگی بۆ هەڵ بڕی و هەڕەشەی لێ کرد:

- کوڕە! هۆ کابرای سەر رەشاش؟ تەقە نەکەی هەر چوار دەورت گیراوە، ئەگەر دەتەوێ سەلامەت بی، دەست نەکەیتەوە.. لەما بوو یەکدووانێکی تری خەڵکی گەڕەك گەیشتنە سەری و گرتیان، هێنایانە خوارەوە، یەکێك لەوانە ئەم کاروانەی مەلا جەوهەر بوو، کەوا ئێستا کەوتووە بەر دەستی و لەو کونە رەشەی پەساندووە! ئێستا بەوە کەیفی دێ کە ماوەو و نەکوژراوە! کە هێنایانە خوارەوە دەمانچەیەکی لەبەر قەدا بوو لێیان سەند و ویستیان لێی بدەن و بیکوژن، من فریای کەوتم بەسەر ئەوانەدا کە لە دەوری خڕ بوو بوونەوە نەڕاندم:

- کوڕینە لێی گەڕێن، مادامەکی تەقەی لێ نەکردین، کوڕی چاکە و حەق نییە بیکوژن، ئەویش هەر هاواری دەکردو دەیوت:

- منیش وەکو ئێوە کوردم...

یەکێك لەوانە کە گرتبوویان دەمانچەکەی لێ سەند و دوو سێ قونکە دەمانچەی لە گازرای پشتی داو هەڕەشەی کوشتنی لێ کرد.. منیش پەلاماری ئەوەم داو دەمانچەکەم لێ سەندەوە و دامەوە پێی و وتم:



- کوڕم ئەو پیاوە ئەگەر خراپەکار بووایە بەرەشاشەکەی دەیتوانی پەنجا شەست کەسێکمان بەر بداتەوە، یان هیچ نەبێ بە دەمانچەکەی یەك دووانێکمان بکوژێ، کە دەمانچەکەم دایەوە لە جەماوەرەکە کە رۆژانە ئەوێ دوورم خستەوە و وتم: بڕۆ لە ماڵ خۆتا خۆت کڕ بکە و، جارێکی تر خزمەت بە داگیرکەر مەکە..

ئەویش هەر دەیوت:( منیش وەك ئێوە کوردم)، یەکێك لە گەنجە راپەڕیوەکان دەیوت:

- کاك بارام، درۆ دەکات، زۆڵە کوردە و نۆکەرێکی رەسەنە، ئێمە دەیناسین، لێمان گەڕێ با رەوانەی دۆزەخی بکەین.. ئەی نەت دی بە دەمانچەکەی فیشەکێکی گڕاوی بە بەشی دۆسیەکانەوە نا بۆ ئەوەی کونیەی خوێن مژ و سیخورەکانی گەرەك و شار نەکەوێتە دەست خەڵکە راپەڕیوەکە!..

من ئەوەم نەزانیبوو! ئەو چڕە دووگەڵە کە لە رێکخراوی یەرمووکەوە بەرز بووەوە، دووکەڵی سووتاندنی کونیەی چڵکاو خۆرەکانە.. بەو کوڕەم وت:

- کوڕی باش وەك ئەوان نەکین، ئەوەی بیگرین، بیکوژین، جا ئەگەر وا بکەین ئێمە و ئەوان جیاوازیمان نامێنێ..

بارام بەیانی راپەڕین و رووداوەکەی ئەو بەیانییەی بەو جۆرەی سەرەوە کە لەبەردەم ئەفسەرەکەدا راوەستا بوو بە خەیاڵ خۆیدا وەك بیرەوەرێکی خۆش یاد دەکردەوە و بەتیلاییی چاویش سەیرێکی دەم و چاوی ئەفسەرەکەی دەکرد و بە خۆی دەوت:

- بەڵێ خۆیەتی، وەك چۆن ئەم پەنجانەی دەستم دەناسم ئاواش ئەو دەناسمەوە خۆیەتی..

- کابرای ئەفسەرەش کە بارامی دی، موچرکێك سەرتاپای لەشی هاژاند و دیمەنەکانی ئەو بەیانییەی بە خەیاڵ خۆیدا دەهێناو دەبرد لە دڵەوە دەیوت:

- ئەمە ئەو پیاوەیە کە بەیانی راپەڕینەکە خۆی و چەند کەسانێك کوتایانە سەر ئەم شوێنە کە ئەو کاتە پێمان دەوت (منظمة یرموك)، حەز دەکەم بمناسێتەوە، تا بزانێ هەر رەنجێ بدەن بەرهەمەکەی بۆ ئێمەیە!.. ئەم پیاوە نەبووایە ئێستا من و چەند کەسانێکی تر ئێسکەکانیشمان نەمابوون، رەنگە نەمناسێتەوە، با خۆمی لێ ئاشکرا نەکەم، ئەم پیاوە حەقی بەسەر منەوە هەیە، بەڵام وا بزانم جارێکی تر بکەوینەوە ژێر دەستی قیمەمان دەکات.. قەت لەبیرم ناچێ چۆن لەو گەلە گورگە رزگاری کردم، جگە لەوەش دەمانچەکەی لە هەتیوە خوێڕییەکە سەندەوە و دایەوە پێم.. جاروبار بە دزییەوە سەرنجێکی ئاراستە دەکرد، بەڵام دەم و چاوی خۆی نەدەدایە..

بارام نیازی کرد بلّێ: تۆ ئەو کەسە نیت کە بەیانی راپەڕینەکە رزگارم کردی!.. بەلاّم لە دوا چرکەی نیازەکەیدا وای بە باش زانی نەیلّێ تا بزانێ مەسەلە چییە و چی لێ دێ..

ئەفسەرەکە رووی کردە سەرۆك عورەفاکە و وتی:

ئیفادەت وەرگرت..

- والێی وەردەگرم..

سەرۆك عورەفا زوو پەڕەیەك قاقەزی دەرهێناو ناو نیشان و گەڕەك و پیشە و کارو کاسبی بارامی نووسی و راوەستا، ئەوجا نۆبەی ئەفسەرەکە هات، بەبێ ئەوەی سەر هەلّبڕێ پرسیاری لێ کرد:

- کاك بارام شتت دزراوە؟..

- شتێکی وا پێ نازانم

- هەر هیچ..!

لەو کاتەدا بارام بیری بۆ دزینی مالّەوە دەچوو، چەند جار مالّی دزرا بوو، بەلاّم ئەو وازی لێیان هێنابوو، چونکە دەیزانی ئەوەی مالّی بدزرێ، شکات کردنی لە پۆلیسخانە بێ سوود بوو، گومان دەکرا کە خۆێشیان دەستیان لە دزینەکاندا هەبێ، پۆلیسخانەیەك کۆنە خۆ فرۆشێك ئەفسەری بێ، دەبێ مرۆڤ چ ئومێدێکی پێی هەبێ..

بۆیە ئاگادار کردنەوەی ئەمانە، سەر ئێشەیەکی بێ سوود بەرپا دەکات، دوژمنکاریشی بە دوای خۆیدا دەهێنا، بۆیە حەزی نەکرد ئەو دزیانەی کە لێی کرابوون ناویان بێنێ و خۆی تووشی بگرە و بەردەی پۆلیسخانەکان بکات.

ئەفسەرەکە لەسەر پرسیارەکانی خۆی بەردەوام بوو:

- ئەی بەرمیلت نەدزراوە؟..

کە ناوی بەرمیلی هێنا زانی مەسەلەکە چییە.

- ئۆە.. ئەو رۆژە بە ئەمانەت لە بەنزینخانەکە لای پۆلیسەکان بەرمیلێکم بۆ نەوت دانابوو بەیانی کە چوومەوە، نەمابوو.. ئەو بەرمیلەتان مەبەستە؟!

- چەند بەرمیل بوون؟..

- یەك.

- رەنگی چۆن بوو؟

- مەیلەو قاوەیی؟.



- قاباغی لەسەر بوو؟

- وابزانم.

- قۆپاو بوو؟..

- قۆپانێکی وا نەبوو

- شکت لە کێیە؟..

- دەبێ شکم لە کێ بێ!.. من لەوێ دامنا، بەیانی کە چووم بیهێنمەوە، دیم هەرایە و بەرمیلەکە نەماوە..

- چ نیشانەیەکی پێوەیە؟..

- نیشانە! وەك چی؟.

وەك ناو، پیشە، قۆپان، ئەو شتانە..

- نازانم..

بەو جۆرە ئەفسەرەکە پرسیاری دەکرد و سەرۆك عورەفاکەش بەو جۆرە ئیفادەکەی نووسی و بەبارامی ئیمزا کرد..

ئەفسەرەکەش ئیمزای کردو بە بارامی وت:

- برۆ خوا حافیزت، رۆژی دادگا کە تەبلیغت بۆ هات ئامادەبە..

بارام بە دەم و چاوێکی پڕ لە نیشانەی سەرسووڕمانەوە سەیرێکی ئەفسەرەکەی کردو ئەویش روانینێکی ناکاوی بۆ کردو زوو سەری داخستەوە...

روانینەکەی بارام ئاماژەی بۆ ئەو رۆژە پیرۆزە دەکرد کە ئەو شوێنەی تیا پاك کرایەوە، روانینەکەی ئەویش پڕ لە مخەنەتی و کەم ئەمەکی و سپلّەیی بوو.

بارام چەند بلّێی مرۆڤێکی هەستیارو وریا بوو لەنێو نیگای خەلّکەوە قولاّیی دەروونیانی دەخوێندنەوە، ئەی ویست ئەو دەرفەتەی لە دەست بڕوا، کابرا وابزانێ نایناسێتەوە.. لەکاتی روو وەرچەرخاندنی و دەرچوونیدا هەر ئەوەندەی بۆ هات بلّێ.!

- وای لێ هات!..

ئەفسەرەکە بەر لەوەی هەلّگێڕو داگێڕی (وای لێ هات)ەکەی بارام بکات، پۆلیسەکەی دەرەوەی گازکردو پێی وت:

- ئەو پیاوە تا بەر دەرگای خۆیان رەوانە دەکەیتەوە..

قسەکەی بەو نیازەوە کرد کە گوایا پاداشتی بارام دەداتەوە.. بارام بەبێ ئەوەی بۆی بڕوانێ وتی:

کاکە سوپاس..

بارام وای وت و پیاوە سەر زلە جامدانە بەسەرەکە بۆڵەیەکی تری لێوەهات، بەڵام ئەمجارەیان بۆڵەکەی ئاشکرا بوو وتی:

- ئەو رۆژباش و سوپاسە بوون دایکی ئێمەیان(..)!,

بارام دەرفەتی قۆزتەوە و بەرەو دوا گەڕایەوە و وتی!

- ئەوەچی دەڵێی!!..

- ئەوەی گوێت لێ بوو..

کابرای سەر زل بەرکەوە وتی، چونکە پشتی بە ئەفسەرەکە بەستبوو..

بارام پڕ بە متمانە و بەخۆ پەرمینەوە، رووی تێ کردو پێی وت:

- دەی گوێ بگرە با منیش پێت بڵێم: هەرچی وشەی (تشکر و مەشکور) هەیە لەو رۆژەوە کەوتووەتە سەر زمانی ئێوە مانان و تا ئەمڕۆ و هەتا هەتایە هەمووی بە قوربانی (س)ێ ی (سوپاس) و (رێ)ی رۆژباش بن، ئەو دایکەی تۆ کە بەو (تشکر)ە (گە..)وە بەو رۆژباش و سوپاسە نەبێ لەو داوێن پیسییەی پاك نابێتەوە.. تێ گەیشتی؟!..

کابرا واقی وڕما و دەمی بەیەکدا هات و چی پێ نەوترا. ئەوەندە نەبێ کە وتی:

- دەزانم کێ ئەو مەمیلەی لە دەم ناوی..

- ئەوەی لە دەمی ناوم ئەو دایکەیە کە دەیانی وەك تۆ شیرەکەی بە حەرامی دەخۆنەوە! وای وت و بە ئاستەم هاتە دەرەوە.. بەرەو ماڵ رووی نا، هەستی کرد پۆلیسەکە لە دوایەوە، شوێنی کەوتووە و فەرمانی ئەفسەرەکەی جێبەجێ دەکات.. پێ وت:

- پێویست ناکات رەوانەم بکەیتەوە..

- فەرمانە، تا بەر دەرگای خۆتان دێم..

- قەی ناکات، کە گەڕایتەوە بڵێ: تا ئەوێم گەیان..

کابرای پۆلیس، گەڕانەوەکەی بارامی بە دڵ نەبوو، وای دانابوو وەك ئەوانەی ناو حەپسخانەکە توندی ئەوێ بکرێ...

❊❊❊



لەبەر دەرگا (شلێر و ئەڤین)ی کچی و مارف ئەفەنی راوەستابوون، وادیار بوو گەرەکیان بوو، بەرەو پۆلیسخانەکە بەدوای بارامدا بچن، بەراوەستانەکەیاندا زانی زیاتر لە کاتژمێرێکە رۆیشتووەو نەگەڕاوەتەوە، خۆی وتبووی ئەگەر پتر لە کاتژمێرێکم پێ چوو بەدوامدا وەرن، ئەڤین، هەواڵەکەی بەنزیکترین هاوسێیان کە مارف ئەفەندییە گەیاندبوو.. هەر ئەو ساتە هەواڵەکە بە سەرتاسەری گەڕەکەکەدا بڵاوبووبووەوەو هەر ماڵێ بە ئارەزووی خۆی هەواڵەکەی هەڵسەنگاندبوو، وا گەورە کرابوو ئەسڵی مەسەلەی چوونەکەی تیا بزر ببوو، چوونە پۆلیسخانەش لە خودی خۆیدا بەشتێکی ناشیرین دەنرخێنرا.. بۆیە بارام کە دی ئەوانە لەبەر دەرگادا راوەستاون و دەیانەوێ بە شوێنیا بێن بە کارێکی باشی نەزانی و خەتای خۆیشی بوو، دەنا ئەڤین نەدەچوو هەواڵەکە بە مارف بگەینێ.. مارف بەر لە منداڵەکانی لێی پرسی:

- خێر بوو بانگیان کردی؟..

- هەر مەسەلەی ئاگرەکە نییە ئەی هەموو ساڵێ ئەو بەزمەم پێ ناکەن.

بارام پێی باش نەبوو راستی چوونەکەی بۆ پۆلیسخانەکە باس بکات بۆ ئەوەی تێکەڵاو بە رووداوەکەی دوێنێ شەوی بەنزینخانەکە نەکرێ و ئەوجا دهۆڵی بۆ لێ بدرێ..

مارف لە زووەوە داخ لە دڵی ئەوانە بوو کە ئاگر دەکەنەوە، بارامیش هەر لە زووەوە ناو دڵی ئەوی خوێندبووەوە، جگە لەوەش پیاوێکی فیکر کۆن بوو، حەزی لە گۆڕانکاری نەبوو. پێی وابوو ئەوەی هەیە هەر ئەوەیە، پاشەرۆژ شتێکی تری لە باردا نییە، گەلێ جاریش بارام لێ بیستبوو کە دەیوت:

- یەك بەدوان نابێ و دووسەر لە مەنجەڵێکدا جێیان نابێتەوە، واتە ئەگەر کورد حەقی خۆی وەربگرێ و ببێ بە دەولەت دەوڵەتی رەسمی رژێمیش هەبێ ئەمە دوو، وتەکە بەسەر خۆیدا دەشکایەوە، چونکە مێشکی ئەوەندە تەسك بوو دووشتی بەیەکەوە بۆ وێنا نەدەکرا، هەر چەندیشی دەکرد نەی دەتوانی جیاوازی لە نێوان میللەتی

کورد و داگیرکەراکانیدا بکات، دایکە نەزانە کۆنەپەرستەکەی وا مێشکی قوفڵ کردبوو بەسەد جەڕومەنگەنە کۆت درابوو نەدەقی دەشکا، نە رووناکی دەچووە ناوی.. گەلێ جار هەوڵی دابوو بە بارام بڵێ: تۆ لەو تەمەنەدا چیت لە ئاگر کردنەوە داوە، بەڵام هەرچەندی کردبوو یارای ئەوەی نەبوو، چونکە بارام هەر شتێکی کە دەکرد دەیزانی بۆ دەیکا، کارەکانی لەسەر بنەمایەکی باوەر پێکراو دەکرد، تا بەر پێی خۆی بە رووناکی ئەدیبایە هەنگاوی نەدەنا و قەت دەستی لە تاریکی نەدەکوتا..

مارف لە پەنای ئەوەدا کە گوایا بۆ بەرژەوەندی بارام قسە دەکات لەو هەڵوەێستەدا، ویستی لە پەنای دڵسۆزییەوە هەندێ کەف و گوڵی خۆی دامرکێنێتەوە.. هەر ئەوەندە پێ وترا:- چەند ساڵە دەمەوێ پێت بڵێم تۆ و ئەو شتانەیان نەوتووە!..

بارام وتەکەی مارفی بە تیرێکی ژەنگاوی زانی کە لە دەستێکی چەپەڵەوە ئاوێژرابێ..

مارفیش هەرگیز چاوەڕوانی ئەو بەرپەچ دانەوەی بارامی بەو شێوەیە نەکرد کە پێی وت:

- دیارە تۆ لە بەر من وا دەڵێی: پێت وایە بەو نزایە دەڵێم ئامین!؟.

کاک مارف بەڕاستی ئێستا هەست بەبوونی خۆم دەکەم کە هەم: بۆ پۆلیسی خۆم، بە فەرمانی خۆم، بۆ بەرژەوەندی خۆم بۆ دادگای خۆم بانگم بکەن، کە شتی خۆم بۆ خۆم بو دیارە هەم و ماوم..

هەرچەند مارف لە مەبەستەکانی بارام حاڵی نەبوو، بەڵام زانی قسەکانی بۆ دەمکوت کردنی بوون تا جارێکی تر لەو رووەوە قسەی هەڵەق و پەڵەق نەکات...

بارام ئەوەندە بە گەرمی تەریقی کردەوە، خەریك بوو جەڵەوی قسەکانی لە دەست بەر ببێ.. باش بوو مارف تەپڵی سەری لە بەرو دوای قسەکانی بارام تەپەی دەهات و لە شوین خۆیدا تەزی بوو.. وەك تۆپەڵە قوڕێك بەدەمیدا بدەی کپبوو.. بارام کە زانی مارف وەك یەخسیرێکی بێ دەسەڵات لە بەردەمیدا وشك بوو.. ئەوجا لەسەرخۆ رووی تێ کردو پێی وت:

- کاك مارف.. لەمن حاڵی بەو مەڵێ پیاوێکی شێتە، واشبڵێی لێت ناگرم.. من منداڵێکی نەناسراو و نەزان حوکمم بکات گەلێ لە حوکمی خەلیفەی عەرەبان و (قیوامولسەڵتەنە)ی فارسان و (صدرالاعظم)ی تورکانم سەدان جار لا پەسەندترە.. ئێستا ئەمڕۆ هەستم کردووە کە چەن مایەی شانازییە خۆت حوکمی خۆت بکەی و بە زمانی خۆت پرسیارت لێ بکەن و وەرام بدەیتەوە...



## (12)

چوون و هاتنەوەی لە پۆلیسخانەکە بارامی دواخست، وای دانا بوو پاش نان و چا خواردنی بەیانی هەموو هێز و توانای خۆی جەم بکاتەوە و خۆی بهاوێتە ناو تاقیکردنەوەیەکی نوێوە، کە زانی هێشتا سەرەتای رۆژەو کەمی رۆییوەو زۆری ماوە، هێزی نایە بەرخۆی و ناوی خوای لێ هێناو بەرەو بازاڕ کەوتەڕێ.. بازاڕ بمگرەو هاتم.. لە دڵ خۆیدا دەیوت:

- گریمان من کەسانێك بووم وەك ئەو برا کوردانە کە پێیان دەڵێن ئاوارە! بۆ یەکەمجار هاتمە ئەم شارەو دەمەوێ کارێ بدۆزەوە، کاسپییەك بکەم، بژێوی خۆم و منداڵم بەرێوەببەم، هیچ دەسمایەشم نییە، چۆن کەلێنێك بدۆزمەوە کارێکی تیا بکەم هەم خۆم پێی بژێنم هەم پێی بناسرێم؟.. کەلێن زۆرن، دەر لە زاو زێدان، هەر چەندە رێی دەرفەت گیرابێ، بەڵام دەرگای گۆڕاندن ناگیرێ، گۆڕاندنیش رۆژانە چەندان دەرو پیشە و دەرفەت دروست دەکات، هیچ ماقووڵ نییە نەتوانم لەناو بێشەی هەزار بە هەزاری کۆمەڵدا دەرێك بۆ خۆم نە دۆزمەوە.. ئەو وتانەی دانە بەرتیشکی خەیاڵی و خوا حافیزی لەو بارامە کرد کە لە سەرەتای مووچە خۆرییەوە مامۆستای سەرەتایی بووە، لە دواییدا گواستراوەتەوە ناو شار و لەیەککێك لە بانکەکانی ناو شاردا فەرمانبەری کردووە لەم دواییەشدا کرا بە فەرمانبەر لە یەکێك لە فەرمانگەکانیوەزارەتی حکووەتی هەرێم دا، چەند رۆژێك بەر لە ئەمڕۆ بە ناوی گواستنەوە دوور خراوەتە.. ئیتر ئەو بارامە نەماو ویستی بچێتە ناو پێستێکی ترەوە و بە کارێکی تر لە بەرگێکی تردا بناسرێ.. با بزانین بارام دەتوانێ وا بکات؟..

هەر چەند ئەو لە کاروباری مووچە خۆرییەوە قاڵ ببوو، لە سەرەتا بەو قاڵبەوە دەقی گرتبوو، پێی وابوو بە عەزمی بەتین و یارا دەتوانێ، لەو قاڵبە بێتە دەرەوە!..

- ئەی کابرای شۆفێر چوونی توانی خۆی لەو بوارەدا تاقی بکاتەوە و دەوڵەمەند ببێ!..

نەچووە بچیّ ئەمە ئەو و ئەوە مەیدانی کار” فرمان.. " چەند خۆشە ئێواران کە دەگەڕێیتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆت بە باخەڵی ئاوەدان و دەستی قورسەوە بگەڕێتەوە"..

(خوا کەرەم)ی ناسیاویان تەنەکەچی بوو کە بەیانیان لە نانەواخانەکەدا پێکەوە نانیان دەکڕی ئەو بەسەد جڕەجڕ تا دوو سێ نانی دەکڕی، ئەویش وێڕای یەك سەردەستە نانی گەرم و مەنجەڵە ماستێك و هەندێ لۆبیاو جار و بار چارەکە کیلۆیەك قەیماغی دەکڕین و بەبێ ترس و ئەژمار پارەی دەدا.. دەی بارام ڕۆژت هاتووە کەی وەك خوا کەرەمت لێ دێ.. دەی بڕۆ ئەوە تۆو ئەوە بازاڕی هەزار پیشەو کار و فرمان، خۆت فڕێ بدە ناویانەوە و بەشی خۆت بەرەو جێی خۆت تیایدا دیاری بکەو ئازایەتی و چەلەنگی خۆت بهاوە ناو کەلێنێکەوە..

بارام لە بازاڕی کەرانەوە دەستی پێ کرد، بازاڕەکە وەك بێشەو جەنگەڵانێکی چڕ وەهابوو، چاوی کردەوە، گوێی بۆ شل کرد، یەکەمجار بوو دەیزانی ئەو خەڵکە چی دەڵێن، چۆن دەفرۆشن، چۆن سەودا دەکەن، بە ناو وردە فرۆش و سەدان لەنگە فرۆش و سەدان عارەبانەدا تێپەڕی، جۆرەها وردە فرۆش و سەوزە فرۆش و پینەچی دین، هەندێ لەسەر عارەبانە و هەندێ لەبن حەسیر و نایلۆن و کەپری بە گونیەو تەنەکەدا بوون و هەندێ لەسەر زەوی هەندێکی تریش سەر پێی بوون، سندوقێکی بچووك وەك سەبەتەیان دروست کردبوو قایشێکی پانیان تێ خستبوو لە ملیان دەکرد واتە دوکانەکانیان لەبەر کەمەریاندا و لەبەر هەردوو دەست و بن کەپوویاندا وەك " کەرکوڵ و بارسووك" لەگەڵ دوکانەکەیاندا دەسووڕانەوە، یان دوکانەکەیان لەگەڵ خۆیدا دەگێڕا.. لەناو بازاڕەکەدا شوێن پێیەك بە تاڵ نەمابوو، ئەگەر هەبووایە منداڵێك تیا کزوڵەی دەکرد، یان شتی دەفرۆشت، یان دەرۆزەی دەکرد..

باشە بارام تۆ خۆت سەر پشك بە، لە کام لەوانەوە دەست پێ دەکەی؟. پارەیەکی وەهات نییە دوکانێك بکڕی، ناسیاوێکی وەهاشت نییە، دوکاندار بێ لەبەر دوکانەکەیدا جێی خۆت تیا بکەیتەوە و شت بفرۆشی و خۆت تاقی بکەیتەوە! کەچە خانووێکت هەیە، ئارامگەی منداڵەکانتە، گریمان فرۆشتت وا دوکانێکت پێی کڕی، تاماوی لەوانەیە پارەکەی پڕ ناکەیتەوە، دیارە ئەو خەڵکەش لەپڕ نەبووە بە کوڕێ.. ئەی چی دەکەی، ئەگەر وردە فرۆشی بکەی، یان سەوزە فرۆشی بکەی، دەبێ لەیەکدوو دەستە شقارتەوە یان لە یەکدوو دەسکە توورو کەرەوزەوە دەست پێ بکەی، تا پلە بە پلە دەست لە شتی گەورە گیر دەبێ، تا وەك ئەوانەت لێ دێ کە دوکانەکانیان بایی هەزاران دینار شتومەکی تیایە.. دیارە ئەو دوکاندارانە، ئەو سەوزە فرۆشانە لەوەختی خۆیدا دوکانەکانیان لەناو چنگیاندا بووە، بووە بە سەبەتەی بەر سینگ و ئەو جا بووە



بە عارەبانەی دەس و ڕاکێشانی وڵاغ و ئەو جا دابەزیوەو لەسەر زەوی شوێنێکی گرتووەو سەقامگیر بووە بە خوایین و چەرمەسەرێ یەکیان بە دوو کردووە و دوو بەسێ و هەروەها تا دەسمایەیەکیان پێکەوە ناوە.. بارام وەرە سندوقێکی بچووك وەدەست خەو پڕی بکە لە نوقڵ و شەکرۆکە، یان لە پاکەتی جگەرەو بگەڕێ و بانگێشتیان بۆ بکە، جا تۆ خوا خەڵك نالێن دیارە بارام شێت بووە!. جا تۆ خوا فەرمانبەرێکی کارامەی وەك بارام وای لێبێ بۆ فرۆشتنی دەسکە توورێك یان بۆ فرۆشتنی تۆپە شقارتەیەك بگەڕێ و بسوڕێ و هاوار بکات!.. ئەمەکارە جا وەرە مەبە بە قەشمەر جاڕی منداڵە وردەو جگە لە خۆی حەیای منداڵەکانیشی نەچێ!..کام هێز هەیە بتوانێ ئەو ئازایەتییە بنوێنێ و ئەو قوربانییە بدات یان لە هەڵوێستی بارام دا بێ و ئەو کارە بکات!..

بارام ئەگەر دەتەوێ کاری وا بکەی و بارامێکی تر بخەیتە کار بڕۆ لە شارێکی تردا ئەو کارانە بکە کە نەناسرێ..

نەکەی دەس لەو جۆرەکارانە بدەی دەنا دوو ڕۆژ نابا شێت دەبی و شێتیش نەبی، سەد قورئان بکەیتە ملت هەر بە شێت دەدرێیتە قەڵەم..

ئیدی وای دانا ئەوو ئەو جۆرە بازاڕەیان نەوتووە..

ئەی چی بکات باشە؟..

بەلای هەر دووکاندارێکدا دەڕۆیشت هەڵوەسەیەکی دەکرد و دەیدایە بەر خەیاڵ و دەیوت:

- ئەم جۆرە کەسابەتە لە من ناوەشێتەوە..

قەساب خوێن مژ و پیس و پەلۆخن و بێ بەزەیین، سەرەتاش هەموو جۆرە سەرێکی ڕشکن و کولکنیان دەچێتە لاو بۆنی کرێژو زیرگی پشت ملیان پیاو گێژو وڕ دەکات،

سەوزە فرۆش هەمیشە دەستیان لە ناو چلپاو قوڕدایە، عارەبانە ڕاکێشانیش شەڕە شەقی دەوێ و لەو ناوە شێتەوە، کۆنە فرۆشیش گەڕیانی ناو کۆلانانی دەوێ..

بەلای هەر گروپ و تاقمێکدا گوزەری دەکرد پیشەکەیانی لێك دەدایەوە، یان حەزی لێ نەدەکرد یان لەگەڵ تەمەنی ئەودا نەدەگونجا یان بۆ ئەو دەسی نەدەدا.. عەتر فرۆشی و پێڵاو فرۆشتن و سەعات چییەتی لەدەسەڵاتی ئەودا نەبوون، جاران بەلای ئەو هەموو دووکاندارو وردە فرۆش و چەقاڵ و بەقاڵەدا تێدەپەڕێ، یەك تۆزقاڵە سەرنجی ڕانەدەکێشان وا ئەمڕۆ وەك قوتابییەك تازە فێری ئەلفوبێی زمانێکی بیانی ببێ یەك لەدوای یەك سەیری پیتەکان بکات و وشەیەکیان لێ دروست بکات کە تەواو ماناکەی نەزانێ، ئاوا یەك لە دوای یەك تەماشای

دوكان و كاسبكارانی دەكرد، گەلێ جار خۆی دەهێنایە پێش چاوی خۆی و دەیوت تۆ بڵێی ئێستا خەڵك من بەیەكێك لە شێتەكانی ناو شار نەزانن؟.. كێ ناڵێ ئەوانیش لە یەكەم هەنگاوی شێت بوونیاندا لە رەوشی ئێستای منەوە دەستیان پێ نەكرد بێ..!

بەرەو قەیسەرییەكان كەوتە رێ بەڵكو لەوێ لە كونجێكدا بتوانێ كارێك پەیدا بكات. لەوێش زۆر گەڕا، زۆر سەیری دوكاندارو كوگاكانی كرد، بەو روانین و سەیركردنەی ئەمرۆی خۆی لە جیهانێكی نوێدا هاتە پێش چاو، روانینی ئەمڕۆی بەو چاوانە نەبوو كە جاران جاروبار لێرەدا تێدەپەڕی و بەرووكەشی سەیری شتەكانی دەكرد بە چاوێكی ترو بە رووانینێكی تر بوو.. ئەو كاتە شتی دەدی، ئێستا شت وێنا دەكات، ئەو جووڵەو بزوتنە بازرگانییەكە لەوێ وێنای دەكرد بۆ ئەو شتێكی نوێ بوو..

دوكانێكی نەدی ئۆستایەك و یەكدوو شاگردی نەبن، كوتاڵ فرۆشێك نەبوو، یەكدوو منداڵی خۆی یان ناسیاوی لە بەر دەستدا نەبن، هەر دەرێك، هەر كەلێنێك كە دروست ببوون دەست بەجێ پڕ ببوونەوە، هەستی نەكرد كەس شاگردی گەرەك بێ، ئەگەر هەشبێ كەس شاگردی وەك ئەوی نەدەویست..

بەلای وێنەگرێكدا تێپەڕی، وای بۆ هات ئەگەر ببێ بە وێنەگر، یان ئامێرێكی فۆتۆكۆپی هەبێ باشتریش، ئەی كەل و پەلی وێنەگرتن و فۆتۆكۆپی لە كوێ بێنێ؟.. هێزی دایە بەر خۆی و چووە ناو دوكانی وێنەگرەكەوە.

- فەرموو كاكە.. وەرەژوورەوە..

- نا هەر لێرە دادەنیشم.

لە سەر ئەو كورسییە كە لە دەمی دەرگادا بوو دانیشت و راما..

- كاكە وەرە ژوورەوە، لەبەر ئاوێنەكەدا خۆت رێكخە..

- نا.. برام من بۆ وێنەگرتن نەهاتووم..

كابرا راچڵەكاو هەردوو چاوی ئەبلەق بوون.

- ئەی خێرە!؟..

بە شوێن كارێكدا دەگەرێم..

كەوای وت، ئەو هەناسەیە كە خەریك بوو لەسەر سنگی چۆك دادا، دابەزی و پاڵی بە كورسییەكەی بنیەوە ناو سنگی دەرپەڕان..

- كاری چۆن چۆنی..



- هەر كارێ بێ- شاگردی، بەردەستی..

- ئیشی وامان نییە و شاگردمان ناوێ.. لێرەش خۆت دەزانی شاگرد راگرتن قسەی لە دوایە..

كابرا درێژەی بە قسەكانی داو وتی:

- خاڵە بە گوێی من دەكەی منداڵت لە برسا بمرێ، یا رۆژەی دە شەڕ و شۆڕ لە ماڵەوە بێنێتەوە باشترە لەوەی بیكەی بە شاگردی هەندێ دوكاندار، بە تایبەتی، وێنەگر و زێرنگر و ئەوانەی لە ژوورەوەی دوكاندا كاردەكەن.. تۆ نازانی، من ئەو شتانە دەزانم!..رەنگە گیرت بە دەست منداڵتەوە خواردبێ و بتەوێ بیكەی بەكاسبكار، خوا دەزانێ خەیری تیا نەماوە، دنیا خراپ گۆڕاوە، ئەگەر دەتەوێ فێری كاسبی بكەی، خەیر لە خۆی ببینێ عارەبانەیەكی بۆ بكڕەو لە سوچێكدا لەسەری دانیشێ، ئەمڕۆ خەیر هەر لەوەدایە..بارام بە ئاستەم سەری بۆ وتەكانی كابرای وێنەگر دەلەقان، كە لێ بووەوە پێی وت:

- ئەی ئەگەر بیەوێ فێری وێنەگری ببێ!؟..

- من شاگرد راناگرم، چونكە ئەوەندە پەیدا ناكەم بەشی ئەوی لێ بدەم، ئەگەر هەر دەتەوێ فێری وێنەگرتنی بكەی، ئامێرێكی بۆ بكڕە، وەك دەیان وێنەگری ناو بازاڕ،

كامێرا لە شان بكات، بۆ شووشتنەوە، یان هەر كارێ من ئامادەم.. حەزیش دەكەی دەیان وێنەگری تر هەن بچۆلایان بەڵكو یەكێكیان پێویستی بە شاگرد هەبێ.. بەڵام بەگوێی من دەكەی خزمی خۆت نەبێ نەكەی بینێریتە لای... بارام لە دڵەوە دەیوت:

- دیارە ئەم كابرایە، وا بە لووسی قسەكانی دەكات گومان لە نا راستیان دوور دەخاتەوە، وا دیارە گوێزی باخەڵی خۆی دەژمێرێ.. دەیەوێ بەو قسانەی ئەم دنیا پان و بەرینەمان لێ تەڵخ بكات..ئەوەی من مەبەستمەو ئەوەی ئەو قسەی بۆ دەكرد زۆر لەیەك دوور بوون.. لەسەرخۆ هەڵساو وتی:

- باوابێ!..

كابرا بەساردییەوە پێی وت:

- بەخێر هاتی..

بەخێرهاتنەكەی بە جۆرێ وت، پاڵ پێوەنانێكی بۆ دەرەوەی دەگەیاند..

بارام ویست و خواستێكی پۆلاّیینی هەبوو، وتەكانی كابرای وێنەگر بە قەد باڵە مێشوولەیەك كاری تێنەكردو دەیوت:

– ئەم شارە هەزارەها دوکاندارو کاسبکاری تیا جێ بووەتەوە، هیچ بە عەقلیدا ناچێ جێی منی تیا نەبێتەوە.. وازی نەهێنا، چەندان ساڵ بوو تەمەنی لەو شارەدا بەڕێ کردبوو بەقەد ئەو ڕۆژە شارەزای کون و قوژبنی ئەو بازاڕە نەبوو.. دەیوت:(ئێستا من لە ناو پانتاییئەم شارەدا بەلەسە بووم و دەمەوێ لە کونجێکی تریا خۆم بگرمەوە، سەر لە نوێ ژیانم بە شێوەیەکی ترو لە قالبێکی تردا بناسرێتەوە)..

چەند خواستی پۆلاینی بوو ئەوەندەش منجڕ بوو، ئەوەندە و ئەوەندەی تریش دابینکردنی بژێوی منداڵەکانی هانیان بەرەو ئەو مەبەستە دەدا کە لە پێناویدا خەریك بوو..

کە وتەکانی شۆفێرەکەی دەهاتەوە یاد، ئەوەندەی تر خۆی تەیار دەکرد.. بە دەم ئەو بیر کردنەوەو سەیرکردن و ڕوانینەدا گەیشتە لای مسگەر و چەرخ چێییەکان. بە خۆی دەوت:

– سەیرکە ئەو خەڵکە چۆن وەك شارە مێرووله لە جووڵە ناکەون و خەریکن، بە دەستێك شت دروست دەەن و بەو دەستەکەی تریان دەیفرۆشن و ماندوو بوونیان پێوە دیار نییە سەیرکە تێکەڵاو بوونی زرنگە و زڕاندنەوەو ئەو هەموو تەقەو هەراو هوریایە پێشکەوتن و زاڵ بوونی مرۆڤە بەسەر خۆی و سەرجەم سروشتدا..

خۆ ئەگەر بارام دڵی کراوە تر بوایە و لە قوژبنێکدا تروسکایی وەدەست هێنانی کارێکی بۆ دەرکەوتایە لەوانە بوو ئەو دەنگ و زڕو هۆڕی تەنەکەچی و مسگەر و لەحیمچیانەی لادەبووە سیمفۆنییەکی بیتهۆڤن.. وەك یەکێك چەندان ساڵ لە زیندانێکی تاریکدا بووبێ و لەپڕ بە ڕۆژی نیوەڕۆ لە ناو بازاڕدا بەربدرێ وابوو.. وردە وردە دەڕۆیشت و سەرنجی دەدا لەم دوکان بۆ ئەم دوکان، خەڵکەکە هەریەك بەکاری خۆیەوە خەریك بوو، دەنا ئەگەر بیانپەر دەژایە سەر ئەوەی بۆ بارام بڕوانن لەوانەبوو بە شتێکی نوێیان دەدایە قەڵەم و دەیاندایە بەر پلار و تەشەر.. ئەو دەیویست مەسەلەکەی خۆی بە یەکێك ڕابگەیێنێ، بەڵام لەبەر سەوداو مامەڵەکردن کەسێك نەبوو گوێی بۆ شل بکات و دەستی پێوەبگرێ.. لەبەر دوکانی تەنەکەچییەکدا ڕاوەستا، خاوەن دوکانەکە پێیاوێکی ریش سپی نوورانی بوو، سەیری دەستی دەکرد، پیاوەکە پێی وابوو نوێنەری یەکێك لە فەرمانگگانی حکوومەتەو دەیەوێ دەك بۆ فەرمانگەکەی بکڕێ، بۆیە پێی وت:

– فەرموو کاکە..

– هەروا دەمەوێ سەیر بکەم..



– فەرموو، فەرموو، وەرە ژوورەوە..

لەناو دوکانەکەدا لەسەر ژێرەخەرێکی ئاسنین دانیشت، کابرای خاوەن دوکان گەلێ ڕێزی لێ نا لە چایخانەکەی ئەو بەرەوە چایەکی بۆ بانگ کرد.. پێی وابوو داخۆ بارام سەرۆکی لیژنەی شتوومەك کڕینی یەکێك لە وەزارەتەکانە، وای دانا بوو ئەگەر لای ئەو دەکاتێك بۆ فەرمانگەکەیان بکات و وا مامەڵەی لەگەڵدا دەکات هەر دوو لا قازانج بکەن ئەوەندەی ماستاو بۆ سارد کردەوەو خۆی هەڵکێشا، بارام ڕووی ئەوەی نەما بڵێ: بەشوێن کارێکدا دەگەڕێم، بۆیە ناچاربوو بە ئاستەم و ویقارەوە بڵێ:

– دەکاتی ساردا و مەتری بە چەند دەکەن؟

– گەورەم!.. بە ئارەزووی تۆیە خەڵك بە چەندی دەکات من مەتری دیناری کەمتر بۆ دەکەم و پسوولەی پارە دانیشت لەسەر سپیەتی بۆ ئیمزا دەکەم!..

بارام هەڵساو بە متمانەیەکی تەواوەوە وتی:

– باشە دێمەوە لات..

– حەزدەکەی لە هەموو شوێنی بپرسە..

– باشە..

– لەخزمەتین.. دوکانی خۆتە..

لەدوکانەکە هاتە دەرەوە، بەخۆی دەوت:

– بارام بیچمت لەوە ناچێ بۆ کاسبی دەس بدات، تۆ بۆ ئەوە دەس دەدەی لە پشت مێزێکی پان و پۆڕ دانیشی و کارو فەرمانی ڕەسمی بەیەکسانی و ڕاست و دروست جێبەجێ بکەی، بەڵام ئاخ لەوێش لەدەست چەکە خۆڕ و پیاوی دوو ڕوو و ریاباز سەرو دڵم ساتێك ڕەحەت نەبوو، مەگەر هەر خۆم بزانم ژیانی فەرمانبەری چییە و لەسەر چی بەندە سوپاس بۆ خوا لەوێ نەمام..

ئێستاش تووشی نەگبەتی بووم: خەڵك بڕوا ناکات من عەوداڵی کارێکم.. بۆ کوێ دەچی هەر دەیدۆزمەوە، ئەی زوو داوای خۆت بۆ ناخەیتەڕوو، خۆ ئاو نیت بتخۆنەوە، یان بەفر نیت بتوێتەوە.. لەسەرەوە هۆشی بەو شتانەوە خەریك بوو دڵیشی لە ناو سنگیدا گەمەی بەخۆی و ئەو خەڵکە دەهات، ژیانی لابووە قەشمەری جاڕ..

بەناو تەنەکەچی و چەخماخچییەکاندا تێپەڕی و لە تەنیشت دوکانی شووشە فرۆشێکدا هەڵوەسەیەکی کردو سەیری ئارایشگە و جامخانەکەی دەکرد، نەی دەزانی هەڵوەسەکەی لەوێدا

زۆری کێشاوه یان کەم.. ئەوەندەی زانی ئافرەتێکی عابا لەبەری کەڵەگەت و بەژن و باڵاجوان. شانبەشانی راوەستاو پێی وت:

– خەڵکی ئەم شارە نیم، بە شوێن پیاوێکی وەك تۆدا دەگەڕێم یارمەتیم بدات!..

لەوەختی قسەکردنەکەیدا، پەنجە شووشەییەکانی لە درزی عاباکەیەوە دەرخست، سنگی تانزیك سەر ترۆپکی هەردوو مەمکەکانی دەرکەوت، ملوانکەی ئەو گەردنە بەرزو شوشەییەی و قاژە یاقووتی گۆی ئەنگوستیلە زێڕەکەی پەنجەی راستی، بەڵگەی نگین و ئۆچاخ زادەیی دەگەیاند. دڵی پیاوی بۆ ناو گەنجینەکەیەك رادەکێشا کە پێت وابوو، بە نزای سەدان موغان و مەلاو هاخام و قەشە لە ئاسمانی حەوتەمەوە دەستێکی نهێنی شۆڕی کردووتەوە، گەمەی دڵ رەفێنی بە پەنجە ناسکەکانی لەسەر گەردنە مینا ئامێزەکەی بە جۆرێ دەکرد، وات دەزانی پەنجەکانی سەماکەرەی بالێی ناو ئۆپراکانی فیردەوسە، قسەکانی و پەردەلادان لەسەر سنگە مەڕمەڕییەکەی تێکەڵاو بەیەکتر دەبوون. ئەویان جیهانی بیستنی کەیل دەکردو ئەمیان جیهانی دیتن هەردوکیان تیشکێکی ئاوێزان بوون لە ناخەوە هێزی ئارەزووی هەڵ دەتەکان، بەنداوی حەزەکانی دەتەقان، بەڵام بارام توانی ئەوەی کە چاوی بۆی عەوداڵ بووە بیکاتە بەرەبینی ئەو بەنداوەو خۆی لەهەڵ خلیسکان رزگار بکات، جگە لە بارام ئەوەی کە چاوی بەو عەقیقە سەوزەی ملوانکە زێڕەکەی گەردەنی کە نووکی بەرەو درزی ئەو دوو گلۆپە قیتەی سەر کەمەرە شۆڕەبکەوتایە، یەکسەر زمانی لە دەمیدا لەنگ دەبوو، دەکەوتە ناو ئەو داوە جاویدانەوە کە دەربازبوونی لێی ئاسان نەبوو..

مۆچرکێك بە لەشیا هات، بەڵام نەیتوانی ئەو پەرۆشییەی کە بە ئاستەم لەسەر دەموچاوی نوخشەی دابوو بیرەوێنێتەوە، یان گەشەیەك بە نێو نیگای بدات.. رووی تێ کردو وتی:

– پیاوێکی وەك من!؟..

– بەڵێ ئەوەی من بۆی دەگەڕێم. تۆی..

– من بەشۆێن کارێکدا دەگەڕێم..

– ئەو کارە منم..

بارام ویستی خۆی لێ لابدا، ئافرەتەکە پارچە قاقەزێکی لەبەر مەمکەکانی دەرهێنا.. دەی ئەو قاقەزەم بۆ بخوێنەوە!..

بارام بەنا دڵییەوە قاقەزەکەی لێ وەرگرت.. لێی نووسرابوو:



"شوێنت هەیە دێم لەگەڵتا.. شوێنت نییە وەرە لەگەڵم: دێی بە ئیمانی، نایێی پەشیمانی.."!

راما، لە دڵ خۆیدا..

- خوایا من بۆچی دەگەڕێم و چی دێتە رێم!.. ئەمە چییە!.. ئەهریمەنە دەیەوێ لە خشتەم ببا، یان فریشتەیە دەیەوێ فڕێم بداتە ناو کونجێکی نوێی ئەم ژیانەوە، یان پەرییە دەیەوێ فریووم بدات!؟..

ئەو رۆیشت و لەناو هاتوو چۆی خەڵکەکەدا نقوم بوو، ئەمیش راما، نەی دەزانی داخۆ چەند ساتە لەوێ راماوە.. نەی دەزانی کێ چاوی لێ بووە، کێ ئاگای لەو سەین و بەینەبووە!..

سەری لەو نهێنییە دەرنەچوو، لە دڵەوە بە خۆی دەوت: لەکەیەوە ئەم بازاڕە ئەمانەی تیا پەیدابووە؟!..

– تێناگەم ئەوە چی بوو! ئەگەر ئەهریمەنەو ئەگەر فریشتەیە، من هیچ کامییانم نەدیوەو لێکیان جیا ناکەمەوە، هەر کامییان بێ ئافریدەی فیکری مرۆڤن، گوایا یەکێکیان دەرگای خێر دەکاتەوەو ئەویتریان دەرگای شەڕ، خەیرو شەڕەکەش بە بەرژەوەندی مرۆڤەوە بەندن، یەك دەرگایە لایەکی خەیرە ئەویتریان شەڕ.. نیشانە نەکراوە کام دیوی خەیرەو کام دیوی شەڕە.. گریمان ئەوە نوێنەری ئەهریمەن بوو، چی تیابوو ئەگەر چەند هەنگاوێك لەتەکیدا بڕۆم ئەی مامۆستا کەمان کە قوتابی سەرەتایی بووین پێ نە دەوتین:" ئەهریمەن نوێنەری راستەقینەی یاغی بوون و راپەڕینە و دژ بە نەریتە مەییوەکانە.."!..

وای وتوو پەلاماری دا بیگاتێ، بەڵام هەی هو!.. ئەو لە ناو رێچکەی هاتووچۆی هەزاران ئافرەتی ناو قەیسەرییەکاندا توابووەوە، بە ناو پێچاوپێچی قەیسەرییەکاندا بە شوێنیا گەڕا بۆ دەم و چاوی هەموو ئافرەتەکانی دەڕوانی و بەزمانی حاڵ دەیوت ئەوە منم، ئەگەر دەمناسییەوە، ئەوەتا هاتم..

زۆر گەڕاو زۆر سووڕا، هیچ سۆراخێکی نەکرد..

دوای ماندوو بوونێکی زۆر هاتەوە ئەو شوێنەی کە ئافرەتەکەی لێ بزر بوو.. ئەو لەبەر ئەوەی بواری پەیوەندییەکانی لە نێوان فەرمانگەکەی و ماڵەوە زیاتر نەبوون و ئەوەندە بەناو قەرەبالغی بازاڕدا نەگەڕا بوو، ئاگای لەوە نەمابوو کە شارەکە لەماوەی ئەو دەساڵەی دواییدا چەندان گوند و شارۆچکەی خۆی قووت دابووەوە، لە ئەنجامی کارەسات و کوشتن و بڕیندا هەزاران بریندارو ناتە سەرو بێ دەرو کلۆڵی لە ئامێز خۆی نابوو.. کە هاتەوە ئەو شوێنە، لە

کۆی داوای عەودالْ بوونی دۆزینەوەی کاریْ لیْ پسابوو لەویْوە گریْی دایەوە، مەسەلەی ئافرەتەکە لای بوو بە زیندە خەویْك.. هەر دەڕۆیشت و لای دوکانداریْك هەڵوەسەیەکی دەکرد، دەتوت مامۆستای سایکۆلۆژییەو دەیەویْت لە سروشتی خەڵك لە کاتی کارکردندا تیْ بگات.. جاروبار تامپۆنی لەگەڵ ژن و پیاواندا دەکردو داوای لیْبووردنی لیْ دەکردن، ئەوانیش سەیریْکیان دەکردو دەڕۆیشتن.. نزیکی نیوەڕۆ بوو، دەنگی بانگبیْژی مزگەوتە یەك لەدوا یەکەکانی ناو بازاڕ هەواڵی نیوەڕۆیان گەیاند، لە دڵ خۆیدا بڕیاری دا ئەو نیوەڕۆیە بچیْتە مزگەوت، چەند ساڵ بوو وازی لە نویْژکردن هیْنابوو، کەچی وائیْستا حەزیْکی ناوەکی پاڵی پیْوە دەنیْ ئەو نیوەڕۆیە لەگەڵ خەڵکدا نویْژ بکات، چی تیایە، بەڵکو لەویْ لەگەڵ یەکیْکدا ئاشنابیْ و دەریْکی بۆ بدۆزیْتەوە.. بەلای ئەوەوە، نویْژو هەموو چالاکییەکانی ئادەمیزاد وەزیفەی سەرەکیان بەردەوام بوونی خودی ئادەمیزادە کە هەیەو دەیەویْ رەو بکات، یان هەموو چالاکییەکانی مرۆڤ یەك تابلۆ دروست دەکەن "ژیان" بۆ ئەو کاتە هەر نەتەوەیەك بەپیْی بەرژەوەندی خۆی گوزارشتی دەکات.

لەپشت مەلاوە لە ریزی یەکەمدا راوەستابوو هەستی کرد کابرای تەنەکەچی هاتە تەنیشتەوە، بۆیە زوو پاش مەلا سەلامی نویْژی دایەوە تا دڵنیا بیْ کە ئەوەی تەنیشتی ئەوەیان نا ؟! بە سەلام دانەوەکەی سەرنجیْکی سەرتاپای پیاگیْرا، بۆی دەرکەوت، خۆیەتی، ئەویش کە سەلامی لای چەپی دایەوە سەرنجی بۆ ئاراستەکرد و ناسییەوە..

مەلای پیْشنویْژ کە لە نویْژ بووەوە بۆ خویْندنی نزاکان رووی کردە خەڵکەکەی پشتی دەستی کرد بە راویْژکاری دینی..

بارام ئەو راویْژانەی مەلای دەیان جار بیستبوون، لای وەك کونینەیەکی عەمارە پووی لا هاتبوو لە دلەوە دەیووت: ئەوە چۆن خەڵك لەو قسانە هەراسان نابن، یان مەلا چۆن رۆژانە هەر دەیانلیْ و دەیانلیْتەوە، ئەو بە شویْن شتی نویْدا ویْل و شەیدا بووە، کەچی لەبەر دەم مەلادا وابەرەو دوا دەگەڕیْتەوە، کەم کەسیش لە کرۆکی قسەکانی مەلا حاڵی دەبوون بە پەلە دەری دەدان و هەڵی دەڕشتن، ئەو مەبەستی بوو بلیْن مەلا وتاری دینی دا، مەبەست تیْگەیشتن و لیْ وردبوونەوە نەبوو، واتە گرینگ ئەوە بوو کارەکەری سەر شانی ئەنجام بدا، گرینگ ئەوە نەبوو بزانیْ خەڵك چوونی لیْ تیْدەگەن..

بارام بەو نویْژکردن و خۆ دیتنەوە لەناو کاسپکارانی ناو بازاڕدا جۆرە هیْورییەکی دەروونی بۆ خۆی سازدا، پەردەی سەر دڵی لە گەردی ئەو ئارەزووانەی کە ئافرەتەکە خەریك بوو دەرگای



کپ بوونەوەیان بۆ واز بکات پاکژ کردەووە، ویستی گویْ بۆ راویْژەکان نەگریْ و بڕوا، بەڵام کە سەرنجی پشتەوەی خۆی دا سیْ چوار ریز خەڵك وەك دیواری کۆنکریْت کراو ریزیان پیْکاوەودەستیان بەرەو ئاسمان پان کردووتەوە، پیْی جوان نەبوو بازیان بەسەردا بداو خۆی دەرباز بکات، ناچار خۆی مات کردو مەلاش هەر دۆڵە کوتاوەکەی دەکوتایەوە، ئەویش سەری داخست و تەماشای نەخش و نیگاری مافوورەکەی بەردەمی دەکرد، وازی لە هەستی گویْگرتنی هیْنا، چی بۆ ژوورەوەی میْشکی رەوانە دەکرد وەری نەدەگرت، چونکە ئەو جۆرە راویْژانە ریْگەی هیْنانەدی ئەو شتەی کە ئەو بەشویْنیا ویْل بوو کۆر دەکردەوە، ئەم پەلەی بوو، ئەویش داوای پەلە نەکردن و خوایینی دەکرد..

خۆ ئەگەر بارام بڕوای بە تینی ئەو شتەی کە بڕیاری لەسەر دابوو نەبوایە. وەك خەڵکانی تر دڵهۆرە بوایە، دەبوایە بە بیستنی قسەکانی مەلا بە لۆژە لۆژ و دەست لە چۆك دریْژتر بگەڕیْتەوە سەر هەواری خاڵی و منداڵی برسی..

ئەو هەوڵی دەدا بارامی فەرمانبەری جاران لەخۆیدا بکوژیْ، گرفتی لەوە دابوو: بارامی ناو میْشك و هۆشی خەڵکی بە هیچ جۆر نەدەکوژرا بەوە نەبیْ لە شویْنیْکدا خۆی بە کاریْکی ترەوە بناسیْنیْ.. بە نەخشی مافوورەکەی بەردەمیا، جوانی ژیان و بەرهەمی تیْکۆشانی مرۆڤ لە هۆشیا رەچاوتر دەبوو، بە هەوڵ و ئازار چەشتن و ماندووبوون و کۆڵ نەدان ئەو ژیارو هونەر سازییە هاتووەتەدی، تەنانەت نزا خویْندن و رایْژکارییەکانی مەلاشی بە بەشیْك لە هەوڵ و کۆشەشی مرۆڤ دەزانی کە هەموویان لە کۆتاییدا یەك دەگرنەوە و دەچنەوە سەر میْژووی داهیْنان و رەنجی پەنجەی مرۆڤ.. لەوەتەی هەستی کراوەتەوە لەو باوەڕەدایە.. مرۆڤ کارە، رانەوەستاندنە تیْکۆشانە، داهیْنانە..

❊❊❊

## (13)

بارام ئەو رۆژە گەلێ ماندوو بوو، هەرچەندە کاری دەس نەکەوت، بەڵام بە ئەزموونێکی نوێدا تێپەڕی و ئەو راستییەی پتر لا روون بووەوە، کارو کاسبی تاقیکردنەوەی ژیانە و هێزی ئەژیار و توانای بزاڤی کۆمەڵایەتی، ریشەی لەگەڵ تەمەنی مرۆڤدا داکوتاوە، ئەو کەسەی کاسبە گوڵە گەشەی نا کۆمەڵە، ئەو کۆمەڵەی تەمەڵە هەمیشە لاواز و ماندووە..

راستە بارام لەو رۆژەدا هیچی بە هیچ نەکرد، بەڵام ئەوەی زانی کە بوار و رێچکەکانی دابین بوونی گوزاران گەلێ زۆرتر و سەختن لەوەی ئەو بیری لێ دەکردنەوە.. لە گسکدەرێکی ناو شەقامەکانەوە بیگرە تا دەگاتە سەرۆکی وەزیران و گەورەترین کەس، لە مامۆستایەکەوە تا دەگاتە بازرگانێکی گەورە، یان وردە فرۆشێکی پیادەی ناو بازاڕ و قاچاخچییەکی ناو دەوڵەتی کارەکانیان لە سروشت و مەبەست و سوودی کۆمەڵایەتیدا یەکن و هەموویان وەك کۆئەندامەکانی لەشی مرۆڤ بەیەکەوە بەستراون, هەریەك لە رۆڵی خۆیدا لەوەی تر کەمتر نییەو بەبێ یەکتریان ناکرێ، کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندییەوە بەست ئەو کاتە مۆرکی چاکە و خراپە و چاکەیان لێ دەرێ..

بارام بیری دەکردەوە، بۆیە خۆی لە هەموو حاڵەتێکدا بەدۆڕاو نەدەزانی، خۆ ئەگەر کارێکی دەستکەوتایە گۆی هونەری تیادەبردەوە، بە خەڵکی دەسەلمان ئەو و کارکردن هاوسەری یەکن، ئەوەشی دەزانی کە هەندێ کۆنە کۆمەڵەی کارو لایەن هەبون، گوایا جاران بۆ ئەوە دانرابوون کە کار بۆ یەکێکی بە تاڵ بدۆزنەوە، بەڵام لە رۆژێکی وەهادا ئەو جۆرە کۆمەڵانە خۆیان دەسەپاچەو چوار پەل ئیفلیج ببوون و ئەندامەکانی خۆیان فێری تەمەڵی کردبوون، ئەو دام و دەزگا بەناو کۆمەڵایەتییانە لەبەر دەم وەرچەرخانی رەوتی مێژوو راپەڕینی کورد دا، هەموو بەندو کۆنترێتەکانی هەڵوەشابوونەوە، یان داوەشابوون.. ئەو هەزاران هەزار کەسانەش کە دەستیان دابووە کەسابەت و لە بەردا ئاویان دەردەهێناو، خۆڵ لە ناو مشتیاندا دەبوو بەزێر، زەروورەتی ژیان و پێویستی هێز و توانا هونەر یەکەیانی لە یەخسیر بوون دەرباز کردبوو، جگە



لەوەش بارام رکی لە، کارو کاسبی یەك دەبووەوە کە بە رێگەی دامەزراندن و رۆتینەوە بێ، ئەی ئەو چەندان ساڵەی پێشوو وانەبوو کە ئەنجامەکەی دەستی ماندووی ناو هەمانەی بەتاڵ بوو.. وێرای ئەوش لە بۆتەیەکی تەسکی وەها جەڕاندبووی وشکی کردبووەوە..

لە مزگەوتەکە درچوو یەکسەر رووی کردە لای کۆنە فرۆشەکانی پشت قەڵاو بەناویاندا تێپەڕی، وەك دەستێکی نهێنی رای بکێشێ بەرەو شوێنی فرۆشتنی کۆنە دەرگاو پەنجەرەو بەرمیل و کورسی و کەنەبەو کەت و شتومەکی بیناسازی و ناو ماڵ و ئاژەڵداری و ماڵداری.. بازاڕێکی سەیر و عاجباتی بوو، دەتوت شاری واق واقەو هەڵ تەکێنراوە، کەرەسەی قەڵا سەخت و تەلار و ئەفسوناوییەکانی لەوێ بەسەریەکدا کەوتوون، بۆن خوێن و شوێن کەڵبەو جنجرۆکی ژەهراوی عەزیا و ئەژدیها و دێو بە کەپووی مرۆڤدا دەدا..

ئەو کاتە زانی ئەو خانوانە ئەو قەڵاو ساختمانە هەزار بە هەزارەی ناوشار و دەووبەری شار کە داگیرکەران بۆ تواندنەوەو لە ناوبردنی مرۆی کورد دروستی کردبوون بۆچی لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا دوای راپەڕین لە ڕەگ ریشەوە دەرهێنران و ئاسەواریان نەما..

بە دیتنی ئەو بازاڕە، ئەوەندەی تر باوەڕی بە خۆی و نەتەوەکەی بەتین بوو چونکە ئەو رەگ و ریشە دەرهێنانەی مۆڵگەکانی داگیرکەر گوزارشتێکی راستەقینەبوو بۆ ئەو رکە پیرۆزەی کە ساڵەهای ساڵ بوو لە سنگدا پەنگی خوارد بووەوە، لە هەمانکاتیشدا خەمی ئەوەی لا نیشت کە کوردیش وەك داگیرکەران فێری تالآنی و ئەنفالکردن ببێ..

بارام وەك خولی بێ ماڵ بە ناو ئەو هەمو شتانەدا دەگەڕاو سەیری شتەکانی دەکرد، لە دەروازەیەکەوە بۆ دەروازەیەکی تر دەچوو، لە دەروازەی کۆنە بەرمیل فرۆشێکەوە چووە ژوورەوە جگە لە دەیان بەرمیل کە لە پشتەوە دانرابوون، دارو دەسەك و پەنجەرەی کۆن و نوێ، دەرگای دوو دەری و سێ دەری و دەروازەی بەرین تەپکرابوون.. وەك کڕەرێك سەیری دەکردن و لەلای بەشێکەوە بۆ لای بەشێکی تر دەچوو، تا گەیشتە ناو بەرمیلەکان، بەرمیلێك لە پشتەوە بەجیا دانرابوو لەمە دی ناسییەوە کە ئەوە بەرمیلەکەی خۆیەتی، بۆ ئەوەی پتر لێی دڵنیابێ، بە دەوریا سووڕایەوە و سەرنجی دەدایە دی ناوی یەکێك لە منداڵەکانی بە قەڵەم بۆیەیەکی سەوز بەپیتی عەرەبی و لاتینی لەسەری نووسرابوو، کە دڵنیابوو هینەکەی خۆیەتی رووی تێکردوو وتی:

– ئەی بەرمیلەکەم! چەند ساڵە لە ماڵەوە کەوتبووی. داخۆ سەدان جار بەلاتدا تێپەڕیوم یەکجار ئاوڕم لێت نە داوەتەوە!. حەقتە ئەم هەموو دەردی سەریەت بە سەرمدا هێنا. وا

ئێستا بوی بە کێشەیەك لە گەردەنی یەکتری ئالاوین، جارێکی تر من و تۆ لە یەکتر ناترازێین، تۆ ناوی جگەر گۆشێکی منت پێوەیە کە ناوەگری داپیرە گەورەمە، ئیتر چۆن وازت لێ دێنم، تۆ هی منی و منیش خاوەنی تۆم، داخۆ چەند دەستاودەست پێ کرابێ! مەرج بێ وازت لێ نەهێنم، ئەگەر وازم لێ هێنای با بەر نەفرەتی مێژوو بکەوم.. خەمت نەبێ ناوت بە ناوی خۆمەوە لەدەفتەر دراوە.. لەو کاتەدا کە بارام راز و نیازی خۆی بۆ بەرمیلەکە دەربڕی، منداڵێکی ئێسك سووك کە لە کۆشەی ئەم دیوو دەروازەی حەسارەکەوە دانیشتبوو، کتێبێکی بە دەستەوە بوو، بەرەو بارام هات و وتی:

- بەرمیلت دەوێ؟..

بارام لە بەرمیلەکەی خۆی هەندێ دوور کەوتەوە، نەبادا بەرمیلەکەی بە گرفتیکەوە تلا بێ یان وەك تەڵەیەك لەوێدا دانرابێ، وای لاپەسند بوو پەلەی لێ نەکاو لاشەی خەری نەکا! بەڕوێکی گەش و لە ئاستی منداڵەکەدا وەرامەکەی داڕشت و وتی:

- دەکڕم و ناکڕم..

چاوێکی سەرتاسەری بە هەموو بەرمیلەکان و شتەکانی ناو فرۆشگاکەدا گێراو رووێکی مامۆستا ئاسای دوور لە بازرگانی بۆ کوڕەکە گەشانەوەو وتی:

- بەرمیلی بە چەند دەفرۆشی؟..

- دوو سەد و بیست دینار..

بەرووێکی درۆشاوەو، پڕ بە سۆزی باوك ئاساوە وتی:

- دوو سەدو بیست دینار؟.. ئەو بیست دینارەی چییە؟!..

کوڕەکە بە دڵێکی پاکەوە وتی:

- بیستەکەی، بۆ مامەڵەیە..

- لە بەرمیلەکەی خۆی نزیك بووەوە نووکە شەقێکی لە بەرمیلەکەی خۆی دا..

- ئەمەش بەوەندەیە؟!..

بەو نووکە شەقە ویستی رێ گومکێی بە منداڵەکە بکات تاوا نەزانێ بە تەنها مامەڵەی ئەوەی کرد، دەنا لە دڵەوە وای دەزانی ئەو نووکە شەقەی لە منداڵی بزر بووی خۆی داوەو بێ ئەمەکی دەربارەی نواندووە!.. بۆ چوونەکەی پێچەوانەی مەبەستەکەی بوو، منداڵەکەش دیار بوو کتێبەکەی دەسی هۆشی خەریك کردبوو دەنا دەبوو دەرکی ئەوە بکات بۆ تەنها مامەڵەی لەسەر ئەو بەرمیلەیە، خۆ بەرمیلەکانی تر گەلێ لەو سەخت و رەختتر بوون..



- ئەوە, نا فرۆشین..

بە شێوەیەکی بێ بایەخانە..

- بۆ نایفرۆشن!؟..

- نازانم بۆ چی!.. باوکم دوێنێ شتێکی وت، لەبیرم نەماوە..

- دەی هەقمان نییە.. هەر بەرمیل زۆرە.. تۆ ئەگەر زۆر بکڕی خاترت دەگرین..

- یانی بەبێ خاترانە لەوەندە کەمتر نابێت..

- یەك پوول کەمتر نابێ..

- باشە ئەگەر رێکەوت بەو نرخە هەندێ دەکڕین..

منداڵەکە کە زانی بارام هەروا دەیەوێ تەماشای شتەکان بکات و نرخەکانییان بزانێ، کتێبەکەی ناو دەستی کردەوەو بەبێ ئەوەی سەرنجەکانی بە وشە و دێڕەکانەوە گیر بێن، تەماشەیەکی رواڵەتی دەکردن. بە دەم خوێندنەوەوە بەرەو کۆشەکە گەڕایەوە.. بارام بەلا چاوێك سەیری کوڕەکەی کرد, بۆی دەرکەوت فێری خوێندنەوەی راستەقینە نەکراوە..

کۆشەکە لە دیوی دەرەوە بە جەمەلۆن سەری گیرابوو، لە دیوی ناوەوە دارە رابوو بن دیوارەکەی بە فلین بەرگ کرابوو، دوو کەرەوێتی نیو داشتی کورت و مێزو سۆبەیەکی عەلائەدینی لێ بوو، بارام لەسەر خۆو ئاستەم بەدەم تەماشاکردنی شتەکانەوە لە کۆشەکە نزیك بووەو، بەزمانێکی پاراو و رەوان بەرووێکی گەشەوە، چووە ناو کۆشەکە و بەبێ ئەوەی رۆژباشی بکات بە متمانەو وتی:

- ئەی ئەوە باوکت لە کوێیە؟!.

منداڵەکە وای زانی، یەکێکە لە ناسیاوانی باوکی.. زوو هاتە دەم:

- لێرە نییە.. تۆ زێکی تر دێتەوە..

بارام لەسەر یەکێك لە کەرەوێتەکان دانیشت.. کوڕەکە کتێبەکەی قاپات کردوو بە خێرهاتنی لێ کرد..

- خەریکی خوێندن بە..

- قەی ناکا خوێندوومە..

- لە پۆلی چەندی؟

- چواری سەرەتایی..

- ئادەی بزانم چی دەخوێنی..

- بیرکاری- دانی ئێوارە تاقیکردنەوەمان هەیە..

بارام سەیرێکی بە پەلەی بابەتەکانی کتێبەکەی کرد، دوای پرسیار کردن لەو بابەتانە، بۆی دەرکەوت منداڵەکە باش لێیان حاڵی نەکراوە، بۆیە بە جوانی و بەبێ گرێ و گۆڵ بابەتەکانی لەسەر پارچە قاقەزێك شیتاڵ کردن و تێی گەیاند، دوای ئەوە داوای لی کرد نموونەکان شیتەڵ بکاتەوە.. بەوا بۆی دەرکەوت کە ئەگەر جوان بۆی راڤە بکرێ بە ئاسانی تێ دەگات، ویستی چەند نمونەیەکی تری بداتێ تا چاك حاڵی ببێ، لەو کاتەدا، لۆرییەکی ئەسکانیا لە دەروازەکەوە هاتە ژوورەوە، شوفێرەکەی پیاوێکی چوارشانەی سمێڵ پانی جامدانە بەسەر بوو، لە ناو گۆرەپانی حەسارەکەدا رایگرت و دابەزی، هەر لە دوورەوە چڕی:

- زریان؟! کوا بابت؟.

- تۆزێکی تر دێتەوە..

کابرا بە شێوەیەفەرمان و بەخودا نازین و بەبێ دەربەسی وتی:

- تا دێمەوە دوانزە بەرمیلم بۆ باربکە.. تێ گەیشتی چیم وت؟..

منداڵەکە پەشۆکاو ویستی کتێبەکەی لوول بداو بیخاتە ناو چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمییەوە، بارام لێی هاتە دەم:

- ها بۆ وا پەشۆکای؟.

- دەمەوێ بڕۆم یەکێك بێنم ئەو بەرمیلانەی بۆ بار بکات!..

بارام لەو جۆرە داواکارییەی ئەو پیاوە پەست بوو، بە تایبەتی کە ئەو لەلای دانیشتبوو وەك مامۆستایەك دەرسی بۆ راڤە دەکرد، کە زانی زریان خەریك بوو راپەڕێ و داواکاری کابرا جێبەجێ بکات پێی وت:

- پەلە مەکە.. جارێ لە دەرسەکە باش حاڵی بە ئەوجا ئاسانە.

- چاك حاڵی بووم بەس ئەو کابرایە!.

ئەو کابرایە بۆ منی بەجێ بێڵە.

زریان کە هەستی بەوە کرد بارام خۆی کرد بە پەنای هێور بووەوە..

بارام پێی وت.

- خەمت نەبێ.. خۆ ئێستا دەتوانی تاقیکردنەوەی تیابدەی؟..

- زۆر چاك..

- دەی بابڕۆین پێکەوە باری بکەین..



- نا دەچم حەماڵ دێنم..

- حەماڵی ناوێ، پێکەوە باری دەکەین.. من دەیانخەمە ناو لۆرییەکە و تۆش لە ناویدا رێکیان بخە..

زریان پێشنیارەکەی بارامی لاسەیربوو، ئەو پیاوە بەشان و شەوکەوتە، ئەو مامۆستا بیر رەوان و بەویقارە، لەبەرچی لۆری بار دەکات، وای لێ هات لێی بکەوێتە گومانەوە، بەڵام گومانی ئەوێکی سادەو منداڵ بەرامبەر بە راست گوێی ئەو بەیەکەوە نە دەنووسان.. لە ماوەی چاو ترکانێکدا بە ئاسانی چەند بەرمیلێکی خستنە ناو لۆرییەکەوە، بە کارێکی وەها زریان ناچار بوو بچێتە ناویەوەو ریزیان بکات، تا هەر دوانزە بەرمیلەکەیان بارکردن..

بارام ئەو بارکردنەو ئەو تێکەڵاو بوونەی لەگەڵ زریان دا بەسەر دەفتەری دۆزینەوەی کارێك دەزانی، جگە لەوەش لە کارەکە چێژێکی هێجگار خۆشی لێ وەرگرت، پێی وابوو گەڕاوەتەوە تۆفی هەرزەکاریی خۆی و سەر لەنوێ تەمەنی بۆ نووسراوەتەوە و ئەو کاتەی بۆ گەڕاوەتەوە کە لە پشووی نیوەی ساڵ و هاویندا لەتەك براکانیدا دەچوونە سەر کێڵگەکانیان و یارمەتی پاڵەو کەسوکارەکانیان دەداو لە دەیان کوێرە, رێ و ناو پووش پڵاشدا راوە چۆلەکەیان دەکردو بە ئارەزووی خۆیان گۆرانییان دەچڕی، ئەم هەستکردنەی بە ئازادییە هەر ئەو ئازادی و سەربەستییەی ئەو کاتەی بوو ریشەی لە ناخیدا داکوتابوو..

بوونی بەرمیلەکەی لێرەو زریان و ئەو بارکردنە دەسگیرێك بوون بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی بکاتەوەو لەو دەردی سەریەی کە تێی کەوتبوو رزگاری ببێ، لە گلاراوی ئەوەشدا بوو، باوکی زریان ئەو تێکەڵ بوونە بە شتێکی والێکی بداتەوە ئەنجامەکەی باش نەبێ، هەر جۆر بێ ئەمە جۆرە چانسێکەو هاتووە،، سادەیی و ئیسك سووکییەکەی دەموچاوی زریان ئەگەر بچێتەوە سەر باوکی نیشانەی نۆقڵانە بە خێرە..

لەو دڵە راوکەیەدا بوو، خاوەن لۆرییەکە هاتەوەو روی کردە زریان:

ئافەرین زریان.. کوا باوکت؟..

- ئێستا دێتەوە..

کابرا لە کاتی قسەکردندا پەیتا پەیتا ناوەکە کوولەکەو فستقی دەهاوییە ناو دەمی و دەیهاڕی..!

ویستی بڕوا.. بارام لێی چووە پێشەوە وتی:

- برا ئەو لۆرییەمن بارم کردووە، زەحمەت نەبێ پسوولەیەکم بدەرێ کە دوانزە بەرمیلت بردووە..
کابرا بە تەوسەوە..
- ها..! گوێم لێ نەبوو ئەو جارەش بیلێرەوە..
بیلێمەوە؟!.. چەند بەرمیلی تیایە؟!
بارام بەتەواوی ویقار و متمانەوە..
- بیلێمەوە؟!.. چەند بەرمیلی تیایە؟..
- هەر چەندی تیایە بەتۆ چی؟!..
- بەمن چی؟! من بارم کردووەو دوانزەیەو پسوولەم دەوێ، دەنا دایان دەگرمەوە..
کابرا بەتێزەوە دایە قاقای پێکەنین..
- تۆ کێی تا پسوولە لە من وەربگری..
- من ئەوەم کە دەمبینی.. ئەو لۆرییە بە داوای خۆت دوانزە بەرمیلی لێ بارکراوە، پسوولەیەکی بە دوانزە بەرمیل دەدەی باشە نادەی، دەبێ بەدەس خۆت بیانهێنیتەوە خوارەوە..
- وا؟!.
- بەڵێ وا؟!..
بەتێز و گاڵتەوە..
- هەر دەتەوێ؟
- بەڵێ واشەرعییە..
کابرا کە زانی بارام لە متمانەوە داوای پسوولەی لێ دەکات، هەندێ شل بوو..
- حەی حەی، حەی حەی.. شەریعەت خانەمان داناوە.. بە سووکییەوە رووی کردە زریان..
- زریان پسولەیەك بۆ ئەو حەماڵەتان بنووسە..
بارام پارچە قاقەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا و رووی کردە کابرا:
- ناوت چییە؟..
بەگاڵتەوە
- ناوم؟.. حەزدەکەی چ ناوێك دادەنێی دانێ..
- بەحەزی من نییە.. ناوت چییە؟.
- خالید حەسەن دۆغرمەچی..



بارام بەجوانی ناوەکەی و نمرەی لۆرییەکە و ژمارەی بەرمیلەکان و رۆژی بارکردن و پارەکەیان کە دووهەزار و چوار سەد دینارە نووسی و پێی وت:
- وەرە ئیمزای بکە!..
کابرا هەرچەندە پیاوێکی شان و باڵ قایم دیار بوو، بەڵام وەك شارۆخی بەتاڵ وابوو، لەپێشەوە گەمەی بەقسەکانی بارام دەکرد، بەڵام کەزانی بارام پیاوێکی وانییە تەشقەڵەی پێ بکرێ، لە روویدا خۆی هێور کردەوە، کە هاتە سەر ئەوەی پسوولەکە ئیمزا بکات، وا نەرم ببوو پێت بە پشت ملیدا بنایە نە دەجوولا.. رووی کردە زریان:
- زریان بۆی ئیمزا بکە!..
سولفی لێداو ویستی بڕوا.. بارام دەرگای لێ گرت وتی:
- نا هێشتا ماوتە..
- چیم ماوە؟..
خۆی تووڕە کرد..
- زریان ئەم بەڵایە چییە هێناوتە..
وەرام نەدانەوەی زریان هۆشی کابرای بەلای زۆرشتدا بزواند.. بارام بە ئاستەم پێی وت، ئەگەر نازانی ئیمزای خۆت بکەی، مۆری بکە..
کابرا وەك خەنجەرێکی ژەهراوی لێ بدەی لەبەر خۆیدا شکایەوەو وتی:
- بێنە..
کە پسوولەکەی وەرگرت بە خامەکەی بارام ئیمزایەکی رکاوی لەسەر کردو ویستی بڕوا.. بەڵام کە سەیری نێو چاوانی بارامی کرد سام و سەیبەتێکی نهێنی تیا بەدی کرد، لەبەر ئەوە لە ئاست خۆی راوەستاو چیتر قسەی پێ نەکرا.. نەی هێشت لە دەروازەکە بچێتە دەرەوە تا رۆیشتە لای ئەو دوکاندارەی کە بەرامبەر فرۆشگاکە لەبەر دوکانەکەی خۆیدا لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، پرسیاری لە بارەی ناسینی ئەو پیاوەوە لێ کرد.. کابرا بە پێکەنینێکی پڕ بە ماناوە وتی:
- ئۆ هۆ.. لە کێ دەپرسی.. ئەوە خالید حەسەن دۆغرمەچی ناوە..
بارام کە زانی ناوەکەی تەواوە ئەو دوکاندارانە دەیناسن وازی لێ هێناو رۆیشت، هێشتا لەدەم دەروازەکە تێنەپەڕی بوو، رووانییە دواوە و بە بارامی وت:
- وریا بە لەو چاڵەدا نەخنکێی!..

– کوڕی باش من لە ناوچاڵدا سەنگەر دەگرم، تۆ وریای خۆت بە نەخزێی..

کابرا قەت بزماری وای لێ نەدرابوو، بە وەرامەکەی بارام کەوتە ناو گێژاوی خەیاڵەوە.. لە دڵ خۆیدا دەیوت، ئەوە چ بەڵایەکە پەیدابووە، بەقسە هیچ پارێزەرێ دەرەقەتی نایە، وەکی تریش حەماڵەو لەبەردەست زریاندا کاردەکات..

بارامیش بەوکارەی کە ئەنجامی داو دڵی زریانی پێ خۆش کرد وای دەزانی دەرگای نگینی بۆ کراوەتەوە، هەر ماوە لە باوکی زریانەوە مۆڵەتی چوونە ناوەوە وەرگرێ، مادامەکێ بەرمیلەکەی لێرەیەو زریان پێویستی بە خوێندن هەیە، ئەوی تریش ئاسانە، خوا بکا باوکی زریان ئەو راستییە نەزانێ کە ئەو بەرمیلە هی منە.. ئاورێکی بۆ بەرمیلەکەی خۆی دایەوەو، وەك بیەوێ پێی بلێ، ئەوە لێرەم، نەچووم، لە دڵەوە دەی دواند..

– ئەی بەرمیلەکەم وەك رۆڵەیەکی لە دایك و باوکدا بڕوای ئەنفالکراو وەهای، ئەوەتانێ بە کزییەوە بۆم دەڕوانی و دەمناسییەوە، بە زمانی حاڵ پێم دەڵێی: ئاگات لێم بێ مەهێڵە بە کەساسی بڕۆم.. ئەی بەرمیلەکەم تۆ بەشوێن منداو من بە شوێن تۆدا پەروازەین، خەمت نەبێ سبەی دێمەوە لات.. پسوولەی وەرگرتنی بەرمیلەکانی دایە دەست زریان و تێی گەیاند کە بیداتەوە باوکی، خوا حافیزی لێ کردو پێی وت!

– سبەی دێمەوە، باش وەرامی تاقیکردنەوەکەت نەدەیتەوە لێت تووڕە دەبم، سبەیش دەرسەکانی ترت بۆ راڤە دەکەم. وای وت و بە ئاستەم لە دەروازەکەوە چووە دەرەوە، زریان تا دەمی دەرگا کە رەوانەی کردو پێی وت!

– سبەی وەرە، حەزدەکەم بابم بت بینێ..

– سەلامی لێ بکە.. بلێ! مامۆستا بارام سەلامت لێ دەکات..

تا بارام لە پێچی شەقامەکەدا بزر بوو، زریان بە دوایدا دەیڕوانی..

***



## (14)

بارام کە چووە ناو نوێن، نیازی را بوونی لە هەر ساتێکی شەودا بکردایە لەو سات، و کاتەدا بە ئاگا دەهات، خۆشی نەی دەزانی بۆ چی هەر کات بیویستایە تیا بە ئاگا بێ چییە، بە ئاگای دێنێ!. هێشتا زۆری مابوو بۆ مەلا بانگدان و نوێژی بەیانیا لە خەو هەستا، وەك جاران بۆ سەیر کردنی ئاسمان و بە سەرکردنەوەی ئەستێرەکان چووە سەر بان، بە تێکرایی لە کەش و هەواکە" حاڵی بوو، ئاسمانەکە ئەوەندە پاك بوو سەیرکردنی دەبووە هۆی پەڕانی دەغز و عیللەتی دەروون، بارانەکەی بەر لە نەورۆز، دار و درەخت و خانوو و بەرەو شەقام و رووی ئاسمانەکەی وا پاك کرد بووە و دنیای کردبوو بە پەڕە گوڵێکی پاك و بێ گەرد، کەژاوەی ئەستێرەکان دەوری ئەو ئەستێرەیان دابوو کە باوکی هەر لە منداڵیەوە پێی وتبوو ئەوە ئەستێرەی تۆیە، کەچی بەو ئەستێرەیە قایل نەدەبوو، گوایا ئەستێرەیەکی کزە، کە گەورە بوو بۆی دەرکەوت ئەوە ئەستێرەی (قوتب)ە،لەوەختی خۆیدا باوکی بۆی دەستنیشان کردبوو، پێی وتبوو حەوتەوانە بە دەوریا دەسووڕێنەوە، لەو شەوە بێ گەردەدا گشت ئەستێرەکان کەرنەڤاڵی خۆیان بە دەور ئەودا دەگێڕا...

لە دڵ خۆیدا دەیوت:

– کێ ناڵێ ئێمەش لە سەر ئەم زەوی یە وەك میزرۆح بە دەور ئەودا ناسووڕێنەوە!؟.. تا چاوی گەشاویەوە و دڵی کەیل بوو سەیری گەردوونی کرد... لەسەر زەویش سروشت لە ناو جوانی گەردووندا تاسا بوو، وەك کاهێنێکی لا هوتی لە ئاسانەی ئەو گەردوونەدا دەستە نەزەر بوو وەسە بە سروشتی هەڵهێنانی ئەو نهێنییە کەیل بووبێ کە هەڵی نەهێنابوو، ئەو خەوش و خارەی دوێنی کە هەندێ رووی ئەو دیووی پەردەی هۆش و دڵی بارامیان گەرد دار کرد بوو بەو سەیر کردن و رامانە هەمووی پاکژ بووەوە، وەك کەلە شێری بەر بەیان کە بەر لە خوێندن لە شەققەی باڵ دەدا، وا یەکدوو جار شان و باڵی خۆی راتەکان و هاتەوە ناو نوێنەکەی خۆی و

سەیری کاتژمێرەکەی سەر دیواری پشت سەری خۆی کرد کە بە تیشکی چرا کزەکەی سەر مێزەکەی بەرامبەر دا دیار بوو بە دەور خۆیدا دەسووڕایەوە و لە جوولە نەدەکەوت، زانی هێشتا یەك کاتژمێری تەواو ماوە بۆ مەلا بانگدان.. لە ناو نوێنەکەیدا خۆی مات دا، دنیا کش و مات بوو، چرکە چرکی کاتژمێرەکەی بان سەری و هاتوو چۆی هەناسە و لێدانی دڵی تێکەڵاو بەیەك دەبوون، تێبینی هۆشیان بۆ لای خۆیان رادەکێشا، کاتژمێرەکە میلەکانی لە ناو بازنەکەدا بە دەوری چەقی خۆیدا دەسوورێنێتەوە.. نازانێ بۆ، دڵیش خوێن دەبا و دێنێ نازانێ بۆ، سنگی هەناسە دەبا و نازانێ بۆ، گەردوونیش بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، دەنگی لێو نایە بۆ!، خوایە مەبەست لەم سووڕانەوە دا چییە؟!... لە دەریای ئەو ئەندێشەدا دەیویست بپەڕێتەوە، پەردەی خامۆشی هات و بەری هۆشی گرت و کەوتە ناو قوڵایی بێ ئاگاییەوە.. وەختێ کە بە ئاگا هاتەوە تازە رۆژ گزنگی دابوو، هەڵسا و لەسەر خۆ سەرو ریشی تاشی و ئەو کورتەك و شرواڵەی کە بۆ رۆژانی شایی و شیوەن دایناپوو لەبەری کرد و پشتێنەکەی بە دەور قەدیا پێچا و لە ماڵ چووە دەرەوە، شلێری کچی هەستی کرد بوو کە باوکی بە شتێکەوە خەریکە ئەو سەرەکەی دیار نییە، تا بە ئەنجامیشی نەگەێنی بە کەس ناڵێ و حەزیش ناکات کەس پرسیاری لێ بکات، دەشی زانی خەرجییەکی وای لە باخەڵدا نییە، بۆیە ئێوارە چووە لای ( ئیڤان)ی دەسە خوشکی داوای بڕە پارەیەکی لێ کرد و ئەویش چەندی ویست دابویە، کە سەر مانگ لە نۆبە پڕۆژەکەی وەری بگرێتەوە...

بارام هێشتا لە دەرگای حەوشەکە دەر نەچوو بوو شلێر بانگی کرد:

- بابە، بابە..

- بەلێ شلێر گیان.. چیت دەوێ...

شلێر بڕە پارەکەی لە مشتیا بوو، ئاخەنیە ناو گیرفانی باوکی:

- با ئەمەت لا بێ نەبادا پێویستیت پێی هەبێ..

- ئەوەت لە کوێ بوو؟!.

- بابە هی پڕۆژەکەمە، وەرم گرت...

هەندێکی لێ گل دایەوە ئەوەی تری دایەوە ووتی:

- بیکە بە خەرجی ماڵەوە...

ئەویشی ختسە باخەڵی و وتی:

هەیە، خەمی ئێمەت نەبێ...



منداڵەکان چاك لە سروشتی باوکیان حاڵی ببوون، لەوانە نەبوو کەم تەرخەمی لەوەی لە ئەستۆیدایە بنوێنی، دەیانزانی لە دڵەوە خەمی منداڵەکانی خونچەی پووریان بووەتە بە شێکی بەدی هێنانی مەبەستەکانی، نە ئەو حەزی دەکرد ئەوان لەو باراوە پرسیاری لێ بکەن، نە ئەوانیش هەواڵی دایکیان و منداڵەکانیان لێ دەپرسی...

لەبەر ئەوەی هێشتا زوو بوو، وای پێ پەسەند بوو چاوەڕوانی هاتنی پاس نەکات، وردە وردە بەرەو فرۆشگاکە و ناو بازاڕ رێ گرتە بەر، بە بەردەم پۆلیسخانەکەدا دەڕۆیشت، دی پۆلیسەکەی جاران بەرەو رووی دێ، دوای رۆژباشی، پارچە وەرقەیەکی دایە دەست، لێی نووسرابوو:

"کاك بارامی باول ئاغا.. رۆژباش..

حەزم نەکرد بە شێوەیەکی رەسمی پۆلیس بنێرم بە شوێنتا..

هەر ئەوەندەت پێ رادەگەیەنم، دەبێ لە کاتژمێری دەی پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆ لە دادگا ئامادە بی.. لەگەڵ رێزدا"

بەڕێوەبەری پۆلیسخانەی خانەقا.. ئەفسەر"عەلی خەلەف".

بارام نووسراوەکەی خوێندەوە و رووی کردە پۆلیسەکە و پێی وت:

- بلێ وا دەچم.. سوپاس

پۆلیسەکە بەرەو مەخفەر و ئەویش رەوتی خۆی تێك نەدا بەرەو بازاڕ شۆڕ بووەوە...

جگە لە بەرمیلەکە هۆشی بە لای هیچ شتێکی تردا نە دەچوو کە بوو بێ بە هۆی بانگ کردنی بۆ دادگا...

بارام لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- ئەگەر بەرمیلم دزراوە، یان بە شتێکی ترەوە گلاوە، دەبوو دادگا یان پۆلیس کە دەستی رایی کردنی کار و فەرمانەکانیەتی بۆمی بنێرتەوە، تێناگەم بۆ چی لەو فرۆشگایە دانراوە؟ لەبەر چی من رادەکێشنە پای دادگا؟.. ئەو ئەفسەرە کە لەو وەرقەدا ناوی خۆی بە عەلی خەلەف نووسیووە، دیارە بەرامبەر بە من نەزاکەتی نواندووە و دەیەوێ منەتباری لە سەر خۆی لابدا و بلێ ناتگرم و قوڵ بەستت ناکەم، وەك کاروانی مەلا جەوهەرت لێ ناکەم، تۆ دوێنێ چاکەت لەگەڵم دا کرد، وا ئەمڕۆ منیش ئەم چاکەیەت لەگەڵدا دەکەم... ئەوە بوو پاداشتی ئەوانەی کە قەڵای دوژمنیان رووخان، لە جیاتی پاداشت سزا دەردێن، ئەوانەش حەق وایە سزا بدرێن پاداش دەدرێنەوە!... یان هەر خۆیان لەژێرەوە بوونەتە بە خاوەن دەسەڵاتی سزادان و

پاداش دانەوە... هەر ئەوانە بوون توانییان وا بکەن شەڕی براکوژی بگەیەنن رادەی ئەو برینە قوڵەی کە درەنگ سارێژ دەبێتەوە.. خەڵکە راپەڕیووەکەیان بە گڤ یەکدا دان و خۆشیان لەسەر تەپۆڵکەی وشترەکە لە خۆشیدا شاییان دەکرد و حەلحەلەیان لێ دەدا.. بەڵام نەتەوەیەك هەزار و ئەوەندە ساڵە خۆی لە ناو لەپی دێودا راگرتبێ و نەمرد بێ تازە نامرێ و رۆژێکیش دێ لەو ئەسپێ و رشکەی ناو لەشی پاك بێتەوە...

بە دەم رۆیشتنەوە، شەقامەکەی دەبڕی و وردە هزرەکانی خۆی بەسەر دەکردنەوە و سەرنجی خۆی لەسەر دادەنان...

هێشتا نەچوو بووە، ناو حەوشی دادگا تووشی دوو زەلام هات لە دادگا دەهاتنە دەرەوە، بە دەم پێکەنینەوە و گاڵتەوە یەکێکیان بەوی تریانی دەوت:

- کەر بازاڕە.. کەس نییە بیان بەستێتەوە... ئەمڕۆش لەبەر دادگا کردنی بەرمیل دزەکان دەبێ چاوەڕوان بین...

ئەویتر یان بۆی سەندەوە:

- کوڕە، بەرمیلی چی و تەرەماشی چی، بە ناوی بەرمیل دزینەوە دەیانەوێ داپپۆشن... هەموویان دەستیان تێکەڵاوە...

بارام بە وتەی (هەموویان دەستیان تێکەڵاوە) بیری تووشی پرش و بڵاوی بوو.. دەیوت:

- لە چی دا تێکەڵاوە!... بیری لە گەلێ شت کردەوە و سەری لێی دەرنەدەچوو، ئەگەر قسەکان پەیوەندییان بە بەرمیلەوە نەبووایە، لەوانە بوو، وتەکەی ئەو دوو کابرایەی دەدایە ئۆباڵ تووڕە بوون و تۆمەت هەڵبەستن، خەڵکی ئێمە بە تایبەتی لەم بارودۆخەدا، کار و کاسبیان ببووە تۆمەت هەڵبەستن، بە یەکێکیان بڵێی: بڕۆ بەو لاوە، یان هەندێ سەبرت هەبێ، بە هەزار چەشنە تۆمەتت بۆ هەڵدەبەستێ... ناحەقیان ناگیرێ، لە زیندانی داگیرکەر دا هەر فێری ئەوە کراون، تا سەد ساڵی تریش هەر خەمەکانیان دەر بدەن پاکڤ نابنەوە...

بارام بە بێ ئەوەی خۆی بشێوێنی خۆی کرد بە تەلاری دادگا دا، وەرەقەکەی (عەلی خەڵەف) کە جۆرە تەبلیغێکی بە نەزاکەت بوو گەیاندییە شوێن خۆی و چووە ناو تەمموورەی ئەو خەڵکەوە کە لەبەر دەرگای دادوەردا راوەستا بوون، وەك ئەوان راوەستا و گوێی لە قسە و باسی خەڵکەکە راگرت، دوو ئافرەتی رەنگ پەڕیوی هەژار، یەکێکیان منداڵێکی سێ ساڵانەی لە باوەشدا بوو، لە دەم دەرگا و لە کەنارەوە راوەستابوون، ئەوەیان کە منداڵەکەی لە کۆشدا بوو، جاروبار لە سنگی خۆی دەدا و بە کۆڵ نزای دەکرد:



- خوایا، ئەگەر حەقی و راستی، حەقی ئێمەیان لێ بسێنی...

جەرگیان بەر گوللەی گەرم خەی، وەك جەرگی منیان سووتان، کوڕی من لە هیچ دا نەبوو، بە ناحەق تووشیان کرد... هەر ئەوەم مابوو بژیوییەك بۆ منداڵەکانم پەیدا بکات، باوکی رۆژی کۆرەوەکە چوو برازاکانی بدۆزێتەوە، ئەو چوونە چوو نەگەڕایەوە، دوای ساڵێك لە نزیك کارگەی قیرەکە هەر سێکیان دۆزرانەوە، کرابوون بە ژێر خۆڵەوە، ئەویش لەو کاتەوە بە عارەبانە راکێشان بژێوی حەوت سەر منداڵی پەیدا دەکرد. ئا بەو دەردە چوو. چوو بەرمیلی ماڵ کاولێك بباتەوە، نازانم چی بووە و چی نەبووە، وا بانگیان کردووم، بزانم ئەم دادگایە چیم بۆ دەکات... خوایا ماڵی خاوەن بەرمیل و بەرمیل دزەکان کاول کەی، خەیر لە خۆیان نەبینن...

کڕوزانەوەی ئافرەتەکە فرمێسکی گەرمی لە چاو ژنەکەی تردا دەهێنایە خوارەوە، منداڵە کۆرپەکەش وەك باڕە کەوی ترسێنراو پتر خۆی بە دایکیەوە دەنووسان و لە ژێرەوە، بە چاوێکی گەشی پڕ گومانەوە جار و بار سەیری ئاپوورەی خەڵکەکەی دەکرد...

ژنەکەی دووەم، وتی:

- ئۆە... برینەکانمت کولاندەوە، ئەوەی بە سەر ئێمەدا هاتووە ئەگەر بە سەر ئەو شاخانەدا بهاتایە دەتوانەوە... پووری کاروان و کارزان مرێ و هەردوو چاوانم کوێر بن، خۆزگا لەو رۆژەوە ئەوەی بەسەر ئەواندا هات وەك چاوەکانی خوشکم هەر دوو چاوم کوێر دەبوون، ئەم دنیا روناکەم دوای ئەوان نە دەدی... ئەو ساڵەی تەقەیان لە کابرای زەنگەنە کرد، خوشکم کاروان و کارزانی بۆ ماڵ ئێمە ناردبوو کە بێن لە ماڵ پووریان بن، هەردووکیان گیران و بە بەر چاوی ئەو خەڵکەوە لەگەڵ چەند منداڵێکی تردا بەر گوللەیان دان...

پاش ئەوانیش باوکیان ئیفلیج بوو، لە خەماندا توایەوە، دایکەش ئەوەندە بۆیان گریا هەردوو چاوانی لێڵاویان داهات، وا ئێستا لە ماڵەوە، بێ کەس و بێ دەر وەك کۆتری کوێر کەوتووە، هەر وڕێنە دەکات و دەڵێ: بەرم دەن، دەمەوێ بڕۆم بۆ ماڵی (پەری)ی خوشکم، کاروان و کارزان لەوێن... تۆ خوا خوشکێ ئەوەندە مەکڵۆزیرەوە، ئاگات لەو منداڵەت بێ بەڵکو مابێ و نەمردبێ...

خوا جەرگی خاوەن بەرمیلەکە لەت لەت کات... دەنا ئێمە لە کوێ و بەرمیل هێنان و بردن لە کوێ.. خوشکێ تۆ چووزانی من چ ئاگرێك بەر بووەتە جەرگم. لەبەر ئەم منداڵانە نەبووایە لە بەر دەرگای ئەم دادگایە خۆم دەسووتان... جارێکی تر (هاوار)ێکی تر پەیدا نابێتەوە...

- دان بە خۆتا بگرە... خوا کەریمە..

- بەخوا نالێم کەریمە.. تا(هاوار)م بۆ نەهێنێتەوە!..

بارام بە نزاو کلۆزانەوەی ئەو دوو ئافرەتە تاسا، حەزی دەکرد ئافرەتەکە پتر سکالای دڵی خۆی بۆ ئافرەتەکەی تر هەڵ ڕێژێ تا بۆی دەر بکەوێ کە ئایا ئەو کوڕە عارەبانچییە کە تووشی ئەو دەردی سەرییە بووە، ئەو کوڕەیە کە بەرمیلەکەی ئەوی هێنایە بەنزینخانەکە!. ئەگەر وایە ئایا کوژراوە یا گیراوە؟..

هۆی کوشتن و گیرانەکەی چی بووە؟... خۆ ئەگەر وا بێ بەهۆی بەرمیلەکەی ئەوەوە وای بەسەردا هاتبێ، ئەوا ئەو بەرانبەر بە ویژدانی ئەو دایکە و ئەو منداڵانە، بەر پرسیارە، دەبێ ئاگای لێیان بێ.. هەندێ لە دوو ئافرەتەکە چووە پێشەوە، ژنەکەی تر زانی بارام گوێی لە قسەکانیان ڕاگرتووە، بە ئاستەم نێقورچێکی لە لا ڕانی ژنەکەی تر گرت و ئاگاداری کردەوە کە چیتر قسە نەکات، ژنەکە لە مانای نیقورچ لێ گرتنەکە تێنەگەیشت، بۆیە وتی:

- ملی گەورە و گچکەیان شکا لە مردن و ماڵ کاول بوون و کۆس کەوتن بەولاوە چی ماوە... لێم گەڕێن با چی لە ناو ئەم سنگە ڕەقەمدایە هەمووی هەڵڕێژم... با بچمە بەردەم حاکم مەرج بێ ئەوەی نەشێ پێیان بکەم...

بارام لە دڵی خۆیدا دەیوت:

- چی بکەم، ئەگەر لێی دەچمە پێشەوە و پێی دەڵێم: کوڕەکەت، چۆن بوو، ڕەنگ و ڕووخساری؟... لە وانەیە لێم بکەوێتە گومانەوە و لێم بسڵەمێتەوە و کارەکەی منیش تەشەنە بکات، ئەوەی هەیە بە لایەکی تردا وەرچەرخێ... ئەو لەو خەیاڵاتە دا بوو،ئافرەتەکانیش هەر دوعا و نزایان دەکرد... گوێی لێ بوو بانگیان کرد:

- کێیە بارامی باوڵ ئاغا...

بارام لە سەرخۆ و بە ئاسیاییی بە ناو خەڵکەکەدا چووە ژوورەوە، لەبەر ئەوەی لە بارەی ئەو ڕووداوانەوە کە بەرمیلەکەی ئەویشی پێوە گلاوە شتێکی وای نە دەزانی ئەوەنەبێ، بەرمیلی لەوێ بە جێ هێشتووە، بۆ ئەوەی بەیانی ڕۆژی دوایی بڕواتەوە بەشە نەوتی خۆی وەربگرێ و بگەڕێتەوە، لەوە زیاتر هیچ نازانێ... وا ئێستا دەزانێ بەرمیلەکەی لە کوێیە، ئێتر پێویست بەوە ناکات کورد وتەنی: (سەرت نەیەشێ پرێسکە لێ ببەستی)... —لەبەر خۆیەوە بڕیاری دا لە جغزی ئەو سنوورەدا شاهیدی بدا، ئان ئیفادە بدا... ئیدی خۆی تووشی گێرە و کێشەی دادوەران و دادگا و پۆلیسەکانیان نەکات..



دادوەر لێی پرسی:

- تۆی بارامی باوڵ ئاغا؟..

- بەڵێ...

- سوێن دەخۆی چی ڕاستی بێ ئەوە بڵێی!...

- سوێنیش نە خۆم لە ڕاستی بەو لاوە نالێم...

- تۆ ڕۆژێ بەر لە شەوی بە سەر دادانی بەنزینخانەکەی ناو بازاڕ، بەرمیلت لەوێ دانا بوو؟...

- بەڵێ..

- بۆچی لەوێ دات نا...

- چووم بۆ بەشە نەوتەکەم، کە پێم وەرنەگیرا لەوێ دامنا تا بەیانی وەری بگرم...

- ڕەنگی چۆن بوو؟.

- قاوەیی کاڵ...

- چی لەسەر نووسراوە...

- ئەوەی ڕاستی بێ نازانم چی لەسەر نووسراوە... بەرمیلێك لە حەوشەدا بێ و حەوش منداڵی قوتابی تیا بێ لەوانەیە، دەیان نووکە قەڵەم و تەباشیری لێ کەوتبێ...

جگە لەوەش ساڵی جارێ لای بایع چەند ڕۆژێك ماوەتەوە و بەشە نەوتی خۆمانم پێ وەرگرتووە، بۆ ئەوەی نەگۆڕدرێ نیشانەمان لەسەر داناوە...

- وەك چی؟

- وەك ناوی خۆم یان منداڵێك لە منداڵەکانم...

- نازانی کێ بەرمیلەکەتی بردووە؟..

- گەورەم من هەر ئەو ئێوارەی ئەو ڕۆژە بەرمیلی خۆم بۆ هاتەوە...

- ئەی بۆ وتووتە بەرمیلی منیش لەوێ بووە و دزراوە!..

- بەڵێ وا بوو... بەڵام نەمزانیبوو ئەو ئێوارە کوڕەکەم بەرمیلەکەی هێنا بووەوە و پێمی نەوتبوو..

- یانی بەرمیلەکەی خۆت لای خۆتە؟...

- بەڵێ..

- فەرموو بڕۆ دەرەوە...

بەر لەوەی بارام بێتە دەرەوە، کۆ نووسەکەیان پێ ئیمزا کرد و ئەوجا هاتە دەرەوە...

وتەکەی دادوەر (یانی بەرمیلەکەی خۆت لای خۆتە...) هەندێ دڵە راوکێی لای بارام دروست کرد، بەڵام دڵە راوکێکەی بەوە رەواندەوە، کە دەمو چاوی دەهێنایە پێش دەیزانی ئەوەندە زیرەك نەبوو تا بتوانێ ناو دڵی بخوێنیتەوە، لەوانەشە ئەو وتەیەی هەروا بە گوترە لە دەم هاتبێتە دەرەوە، بارامیش جگە لەوەی کە وتی: (هەر ئەو ئێوارەی ئەو رۆژە بەرمیلی خۆم بۆ هاتەوە) لە راستی لای نەدابوو، ئەو درۆیەش بارتەقای یەك بە هەزاری دادگایی کردنی بەرمیلەکەیە کە دزەکەی تا ئەم ساتە دیار نییە و خاوەنەکەشی سەری لەو بەزمە کاس بووە!.

بارام خەمی ئەوەی بوو شتێکی ناراستی وای وتبێ سبەی رۆژ ئەنجامەکەی زەرەرمەند بێ.. لە هەمانکاتدا بە خۆی دەوت:

- دەی، دەی درۆی مەسلەحەت باجی لەسەر نییە، ئەوەی وتم لەو جۆرانەیە، چۆنت بوێ وایە، هەم راستە و هەم درۆ..

جا نازانم لە ترازووی داد و بەرژەوەندی دا چۆن لێك دەدرێتەوە، چی تیایە! با منیش درۆێکم خستبێ سەر ئەو درۆیانە کە دوێنی وا بوون، کەچی ئەمڕۆ بە راستی دەخوێنرێنەوە... درۆی ئەمڕۆ راستی سبەینێیە، کێ نالّی لە داوێن ئەم نیمچە درۆیەدا راستی یەکی گەورە لە دایك نابێ.. بەو درۆیە، خۆم و دادگا لە دەیان درۆی تر رزگار کرد، ئەو بوو کۆنووسەکەیان پێ ئیمزا کردم، واتە تەواو و بڕایەوە، ئەوەی پژا بوو خڕ کرایەوە رەحمەت لە گۆڕت بێ بەگۆك ئەفەنی، مامۆستای کۆمەڵایەتیمان بوو، دەیوت:" درۆ و راستی هەر دووکیان وتەن، بەری یەك تەرزن، بەڵام درۆ بەتام و سوود بەخشە"..

دیارە ئەویش شتێکی وەك ئەمەی منی بەسەردا هاتووە، بۆیە ئەوەی دەوت، دەنا درۆ و راستی دوو بەهان هەر یەك ئەویتریان دەدۆزێتەوە..

بارام کە بەرەو فرۆشگاکە هەنگاوی دەنا، هەستی دەکرد بەرمیلەکەی گوریسێکی دوور و درێژی خەم و دەردی سەری لە مل ئالاندووە.. ئەگەر ئیمزاکردنی کۆنووسەکە، مانای سەر نانەوەی بێ لە بێنەو بەردەی پۆلیس و دادگا، تووش بونی ئەو خێزانە لێ قەوماوە، بەم بۆنەوە لە مل ئالاندی بەر پرسیارییەکە، خۆ دوورخستنەوە لێی بێ ویژدانییەکە قبوڵ ناکرێ..

لەبەر ئەو بە خۆدا چوونەوە بە شێوەیەکی میکانزمی هەنگاوی بەرەو فرۆشگاکە دەنا، لەم بەر شەقامەوە بۆ ئەو بەر شەقامەکە بە ناو حەشەماتی بازاڕەکەدا تێدەپەڕێ و خەمی ئەو دوو



ئافرەتەی بەر دەرگای دادگا باری قورس کردبوو، گرتن و بزر بوونی کوڕی ئەو ئافرەتەش پرسیارێکی نارەحەتی لە هزردا بەرپا کردبوو..

لەبەر چی گیراوە؟ خودی بەرمیلەکە بووە بە هۆی گرتنی؟

یان چی؟..

نەبوونی هەموو شتێ بەسەر مرۆڤدا دێنێ، ئەگەر ئەوە نەبووایە بۆ خۆ لەو ئافرەتە لا دەدا کە بەهۆی بەرمیلەکەی منەوە کوڕەکەی سەر نگوم کراوە!. پێم وابوو ئەگەر خۆمی لێ ئاشکرا بکەم شتەکەم لێ ئاڵۆز دەبێ، نا.. وا نەبوو، مەسەلە نەبوونییە...

ئەگەر دەستم لە کارێك گیر بوو، دەرامەتێکی وام هەبوو مەرج بێ، کون بە کون و کۆڵان بە کۆڵان بە شوێنیاندا بگەڕێم و بیاندۆزمەوە.. کە ئەو شتانەی بە خەیاڵی خۆیدا دەهێنا و دەبرد، دەیوت:

- ئاخ بارام ئاواتی زۆرت لە دڵدان و دەست نایگاتێ...

سەری بۆ ئەو وردە خەیاڵاتە دانەواند بوو وەختێکی زانی لە دەروازەی فرۆشگاکە نزیك بووەتەوە، دی زریان لە دەرەوەی دەروازەکەدا، راوەستاوە، لەمە هەستی بە هاتنی کرد بەرەو شوێنەکەی خۆی کشایەوە، تا ئەو گەیشتە بەر دەروازەکە زریان دووبارە هاتەوەو پێشوازیەکی گەرمی لێ کرد و تێی گەیاند لەگەڵ باوکی دا دەمێکە چاوەڕوانی هاتنی دەکەن... لە پێشوازی و گەشی دەم و چاوی زریانەوە هەستی بە ئاسۆیەکی رووناك کرد...

زریان پێشی بارام کەوت و بە باوکی وت:

- ئەوەتا!...

- باوکی زریان خۆی گرت، لە ئاست مژدەدان و بە تاسەوە وتنی(ئەوەتا) کەی ئەودا گەرم نەبوو، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاسایی و سادە فەرموویەکی پڕ بە دەمی لێ کرد و زوو جگەرەیەکی بۆ دەرهێنا، کە زانی جگەرەکێش نییە، فرمانی بە زریان دا لە چایخانەکەی ئەو بەر جادە. چاییان بۆ داوا بکات... چاوێکی خێرایی هەڵسەنگێنەری پیا خشان و وتی:

- سوپاست دەکەم کە دوێنێ ئەو کارەت بۆمان کردبوو...

بارام بە هەمان شێوەی ئەو و هەمان ریتم و لەسەر خۆ وتی:

- کام کار!؟..

- ئەوەی دوانزدە بەرمیلەکە.. وێڕای ئەوەش زۆر سوپاست دەکەم کە دەرست بە زریانی کوڕم وتبوو،

ئەمشەو لە خۆشیدا خەوی پیا نەکەوتووە هەر باسی تۆ و خاس  وەرام دانەوەی لە تاقیکردنەوەکەیدا کردووە..

من زۆرم هەیە و بە توانام، بەڵام هەموو شتێ لایەك، زریان لە لایەك، نامەوێ جارێ بڕواتە ناو کۆڕی کڕین و فرۆشتنەوە و خوێندنەکەی لەبەر چاو بکەوێ، ناشمەوێ ببێ بە پارێزەر و دکتۆر، سوپاس بۆ خوا ئەوەندەم بۆ پەیدا کردووە تا ماوە پێویستی بەهیچ شتێك نەبێ، خوێندن ئەو سوودەی نەماوە مرۆڤ بژێنێ، هەر ئەوەندەم لێی دەوێ دەس و قەڵەمێکی هەبێ حیسابی خۆی رابگرێ...

مژێکی لە جگەرەکەی دا و هەندێ خۆی مات کرد بۆ ئەوەی بارام وتەیەك بەسەر قسەکانیدا بدات.. بەڵام بارام وای پێ پەسند بوو، جارێ گوێ بگرێ و دەم نەکاتەوە، چونکە دەیزانی ئەو جۆرە کەسانە زۆریان دیوە و زۆریشیان بیستووە و گەلێ بازیان بەسەر دا دراوە و بازی زۆریشیان داوە، کابراش ئەوەندە گرێی لە خۆی نەدابوو درەنگ بکرێتەوە، دەرو دیمەن و کەسایەتی بارامیش لەو چەشنانە بوو، مرۆڤ زوو هۆگری ببێ و دڵی خۆی بۆی بکاتەوە، لە بارەی خۆی و سامان و فرە ئیشییەوە ئەوەی دەیزانی بۆ بارامی هەڵڕشت، تا گەییە سەر زریان و وتی:

– لە دوێنێوە، هەر باسی تۆ دەکات، هەر دەیوت.. باوکە تۆ بڵێی ئەو پیاوە بێتەوە... دایە چەند پیاوێکی راست و مامۆستایەکی زانایە.. خوا دەزانێ ئەمڕۆ دەبوو بە دوای کارێکدا بڕۆم کە زۆر گرنگە پەکم دا و بە ئارەزووی زریانم کرد بۆ ئەوەی تۆ ببینم...

بارام زەردەخەنەیەکی پڕبە ویقاری خستە سەر هەردوو لێوانییەوە وتی:

– وا دیت، وایە وەك زریان دیبووی؟.

– زریان هەڵە ناکات...

– هەڵە ناکات، یان هەڵەی نەکردووە..

– هەردووکیان..

کابرا هووشەی زۆری کرد، وا خۆی پیشان دا کە خاوەن  سامانێکی زۆرەو خەڵك بەخیلی پێ دەبەن و چاویان لێی کردووەتەوە، گلەیی لەو خەڵکە دەکرد،کە نانی دەخۆن و خوانی دەدڕن، هەموو قسەکانی پاساو هێنانەوە بوون بۆ ئەو کاسبییەی کە دەستی داوەتێ. گوایە تا ئێستا چەندان کەسی راگرتوون و کە تێر بوون بە جێیان هێشتووە و بوون بە خاوەن سامانی خۆیان... بە زۆر وتنەکەیدا بارام بۆی دەرکەوت ئەوە تازە پێگەیشتووە و دوریشی بۆ مەڕۆ لە ئەنجامی



براکوژی و تاڵانکردندا دەوڵەمەند نەبووبێ... بەڵام بە پوختەی وتەکانیدا دەردەکەوت کە ئەو پیاوە جۆرە لێ قەوماوێکە. پێویستی بە یەکێکی دڵسۆز هەیە، یارمەتی بدات.. بارام وەك پزیشکێك کە گوێ بۆ دەردەدارێکی دەغزدار بگرێت هەموو هەستێکی خستبووە سەر وەرگرتنی وتەکانی، بە ئاستەم و زانایانە لێی پرسی:

– حەز دەکەم ناوی بەڕێزتان بزانم..

– ئەی زریان پێی نەوتووی؟..

بارام بە رووێکی گەشەوە، روانییە زریان و رووی کردەوە باوکی:

– زریان ژیرە، چۆن ناوی باوکی لە خۆوە بە خەڵك دەڵێ...

کابرا هەڵوەسەیەکی کرد و سییەکانی خۆی پڕ لە هەوا کرد و وتی:

– قوربان با پێت بلێم.. برای خۆت.. ناوی "سەرداری حاجی حەمە عەلیی گەرمە سێرە".. کەس نییە ناوی من نەزانێ...

– وا منیش زانیم.. دڵشادم بە ناسینتان..

بارام بە ناوەکەی و شێوەی قسەکانی دا بۆی دەرکەوت کە سەردار یەکێکە لەوانەی کە بە هەر نیازێك بووە جاران لە ناو بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد دا جێی خۆی کردووەتەوە...

بەڵام لە کاتی تەتڵەکردنی و چاکسازی دا، ئەو لادراوە و کەوتووەتە پشت کەنوانەوە، ئەویش وەك چەندان کەسی تر بەشێك لە تافی لاویەتی خۆی لەو بوارەدا داناوە، ئەو ئەزموونەی کە لەوێ بە دەستی هێناوە, بووە بە دەستەبەری خستنە سەر کار و، فێری کردووە ئەو سامانەی کە هەیەتی پێکیەوە بنێ.. یان ئەمە یەکێکە لەوانەی کە خۆیان تێکەڵی هەر بزافێك دەکەن، لایان گرنگ نییە لەسەر چ بنەمایەك هاتووە و بەرەو چ ئامانجێك دەڕوا گرنگ لایان ئەوەیە خۆیان پێی دەپارێزن و تەنها بەرژەوەندی خۆیان رەچاو دەکەن، کە گەیشتە رۆخی بڤە خۆیان لا دەدەن، لەوانەشە دڵسۆز بوو بێ و ئەوانەی وەك مار نەرم و گەرمن پێیانەوە دابێ و توورەیان کردبێ.. هەر جۆر بێ، هۆش و بیری بە مەسەلەی کوردایەتییەوە تێوە گلاوە و زۆر نا کەمێك لەو بارەوە هەست و بیری لە ساو دراون، بارام لە ناوەوە وای دابووە بەر خەیاڵ لە دەرەوەش گوێی بۆ وتەکانی گرتبوو..

سەردار پێی وت:

– حەز دەکەم ناوت بزانم..

– ناوم؟!

- بەڵێ..

- قوربان.. ناوم.. (بارامی باوڵ ئاغا) یە..

- ماموستایت؟..

- جاران زوو...

- ئەی ئیستا ؟,,,

- لە زووەوە لە ماموستایەتی نەماوەم، ئێستا فەرمانبەرم...

سەردار، دەیزانی زرووفی سەختی ئەو کاتە، فەرمانبەرانی بە گەورە و بچووکەوە خستبووە ژێر بارێکی قورسی وهاوە داری هەژاری بە دەستیانەوە دابوو، دەیزانی بارام بە شوێن کارێکدا دەگەڕێ لەو زرووفە نا هەموارە روزگاری بکات، بەڵام ویقار و سەلاری رێی ئەوەیان پێ نەدەدا بە سفت و سۆ بڵێ بە شوێن کارێکدا دەگەڕێم...

بارامیش بە قسەکانی سالار دا دەیزانی ئەو پیاوە، بە شوێن کەسێکدا دەگەڕێ چەلەنگ و لێزان و توووند و تۆڵ بێ، خۆ ئەگەر خەڵکی ئەم شارە بێ و لایەدە نەبێ گەلێ لای پەسند تر بوو لە دڵ خۆیدا دەیوت:" دەی بگرە، ئەوەی تۆ دەتەوێ منم"

سەرداریش لە دڵەوە دەیوت" ئەوەی من بۆی دەگەڕێم ئەمەی بەر دەستمە" بۆیە دووبارە سەری قسەی دامەزراندەوە ووتی:

- قسەیەك بکەم عاجز نابێ؟...

- بۆ عاجز دەبم.. ئەگەر بە دڵم نەبوو دەرگا کراوەتەوە...

- نا.. وانییە..

- فەرمووو...

- ئەو کاتەی کە مامۆستا بووی چەندت وەردەگرت؟..

بارام یەکسەر زانی مەبەستی لەو پرسیارە چییە، بۆیە هاتە دەم:

- ئەوەی ئەو کاتە وەرمان دەگرت سەنگین بوو، لەگەڵ هی ئەم کاتەدا بەراوردناکرێ.. ئەو کاتە و ئێستا ئاسمان و رێسمانە...

- باشە، ئێستا کە فەرمانبەری مانگی چەند وەردەگریت؟

- مەبەستت چییە؟..



- مەبەستم خراپ نییە.. هەر ئەوەندەیە: من هەر ئەم تاقە کوڕەم هەیە... حەز دەکەم رۆژانە بێیتە ئێرە دەرسەکانی بۆ شەرح بکەی بە قەد دووجاری ئەو مانگانەیە حەقی خۆتت دەدەمێ..

- خەندەیەکی مەخمەڵی لە هەر دوو لێوەیەوە گزنگی دا و پەردەیان لەسەر سپیدەی ددانەکانی لاداو سمێڵەکانی بزواند، خەریك بوو ئەو لۆچانەی کە نەبوونی ئەو کاتە بە ئاستەم لەسەر تەویڵی نەخشاندبوونی بڕەوێنێتەوە، بەڵام زوو فریا کەوت و نەیهێشت سەردار بەو گەشکەیە هەست بکات.. وتی:

- جا ئەگەر من شتێ بزانم و بە یەکێکی بڵێم چۆن بە پارە دەینرخێنم، بە تایبەتی دەرس وتنەوە بە یەکێکی وەك زریان..

- تێناگەم مەبەست چییە؟..

- مەبەستم دیارە..

- ئەی شتێکی تر بۆ نەکەین؟..

- فەرموو..

بۆ نایێی واز لە مووچە خۆری خۆت بێنی و بێیتە لای من... لەم شوێنەدا دانیشی و ئاگات لەم شوێنە بێ.. ئەوجا ئەگەر دەرسیش بە زریان بڵێی ئەوە( نوورون عەلا نوورە).

واش مەزانە کەسم دەس ناکەوێ.. هەر ئێستا یەك فیکە بکەم سەد کەس خڕ دەبنەوە و دەسی تۆش ماچ دەکەن.

- بەو جۆرە قەید ناکات..

سەردار گەشایەوە...

- کەواتە لە ئەمڕۆوە تۆ لای منی..

- چی دەڵێی با وابێ..

- حەزیش دەکەی تا سبەی راوێژی خۆت بکە و بڕیاری بدە...

- تا سبەی ناوێ، بڕیار بە دەست خۆمە..

- کەواتە رێکەوتین.

- بڕیارم دا رێکەوین..

- بە دڵی تۆ دەبێ..

- نا.. نابێ بە دڵی من بێ.. بە پێی رێکەوتن..

- گەلێ باشە.. جگە لە دەرس وتنەکەی زریان، دەتوانی لەگەڵمدا بی؟..

- زریان مەخە ناو کەوانە.. لەگەڵیشتا رێك نەکەوم، دەرس دانی ئەو لەسەر من...

- دەکرێ لەسەر ئەو شوێنە دانیشی، چی دێ وەری دەگری، چی دەڕوا تۆماری دەکەی، تا وردە وردە فێری ئیشەکە دەبی... ها چیت وت؟..

- چۆنت دەوێ بە دڵی تۆیە.. منیش حەز دەکەم لە فەرمانبەری رزگار بم، بەڵام چۆن دەزانی من پیاوێکی خراپ نیم...

- پیاوی خراپ خۆی دیارە... مادامەکی مامۆستایەتیت کردووە، ئێستاش دەبیتەوە مامۆستای زریان، خراپەش بکەی من بە خراپەی نازانم..

- خوا بکا من وابم.. ئەگەر واش نەبوم بە پێی رێکەوتنمان لە کات و ساتی خۆیدا بە رەزامەندی هەردووکمان، لە کوێوە هاتووین لەوێوە رێ نەگیراوە...

- گەلێ باشە.. کەواتە لەم ساتەوە، ئەمە شوێن و ئەوە ئەو فرۆشگایە، ئەوەش زریان ئەم مانگە دووجا مووچەکەی خۆتت دەدەمێ..

- ئەی پاش ئەم مانگە؟..

- حەز دەکەی ئەو کاتە لەسەری رێك دەکەوین...

- لەسەر چ بناغەیەك لەسەری رێك دەکەوین؟

لەسەر چەند جارەی مووچەکەت

- نا

- ئەی؟!..

- لەسەر ماندوو بوون و گرینگی کارەکە...

- باشە، با وابێ..

- نا.. با وا نەبێ..

- ئەی خۆت وا ناڵێی..

- ئەم مانگە تاقیم بکەرەوە، منیش ئەگەر کارەکەم بە دڵ بوو، تۆش ئەگەر منت پێ باش نەبوو و هەر کەس ماڵ خۆی..

- کاك بارام با شتێکت پێ بڵێم.. من کارم زۆرە یەك ئەم فرۆشگایە، دووەم هێنان و بردنی ئەو شتومەکانەی کە دێنە لام و دەڕۆنە دەرەوە، کامیان دەڵێی ئامادەم...

- بە تێکرایی



- بەتێکرایی؟.. منیش وام پێ پەسەندە

- من لە بەیانییەوە واز لە فەرمانبەری خۆم دێنم، دەبێ...

سەردار نەیهێشت تەواوی بکات، قسەکەی لە دەم وەرگرت..

- ناتەوێ کرێکەت چەند جای مووچەکەت بێ؟.. با وابێ..

- نا.. چەند جا بێ و چەند جا نەبێ دیار بێ.. کورد وتوویەتی:

"قڕەی شێف نەك هی خەرمان".

- ئومێدە قڕەی تێ نەکەوێ..

- ئەی بەڵکو من پەلپم لێ گرتی وتم: ئەو ماڵە هی منە.. یان شتێکی تر..

- باشە، لەسەر قسەکەی خۆت با ئەم مانگە مانگی تاقیکردنەوە بێ..

- نا.. واش نا..

سەردار تووڕە بوو، ئەوەندەی نەمابوو بڵێی: کەوا بوو هیچمان لە هیچ.. بە توندی:

- ئەی؟!

- من واز لە فەرمانبەری دێنم.. مانای وایە، رەنجی چەندان ساڵی خۆم بە بادا دەم..

لەوەزارەتێك دیمە دەرەوە، لای بەرێزتان کار دەکەم، ئەگەر دوای دوو مانگ وازت لێ هێنام؟.. ئەو کاتە چی بلێم بە ماڵ و منداڵم و بە چ رووێکەوە داوای گەڕانەوەی وەزیفە بکەم؟ چۆن رووم دێ لای برادەرە فەرمانبەرەکانم سەر بەرز بکەمەوە..

- تۆ خۆت وات وت..

- نا مەبەستی من، بەرژەوەندی هەر دوولامانە، من لای تۆ دادەمەزرێم، تاقیم دەکەیتەوە، لێم دلنیا بووی و شایستەی زۆر تر بووم، بۆم زیاد دەکەی، لێم دڵنیا نەبووی وەك خۆی رای دەگری، یان کەمی دەکەیتەوە.. من لای تۆ کار بکەم، تەمام لە سامانی تۆدا نییە، تەمام لە کاری خۆم و شایستەی خۆمدایە..

- قبوڵمە، چی دەڵێی با بەدڵی تۆ بێ..

- نا.. بە بەپێی بەرژەوەندی هەر دوولامان بێ..

سەردار دەستی خستە ناو دەستی بارام .. وتی:

- حەز دەکەی چی پەیدا دەکەین تۆ بەشی ئێمەی لێ بدە.. باشە

- نا.. من کرێ گرتەی تۆم، حەقم بەسەر دەسکەوتی تۆوە نییە..

سەردار رووی کردە زریان و وتی:

- باشە زریان لە ئەمڕۆ دواوە، ئەوە (روویکردە بارام) مامتە، چ لە خوێندن و چ لە کاردا ئەو چیت پێ دەڵێ وا دەکەی..

- کاری ئەو تەنها خوێندنە، خوێندنەکەی لەسەر من، بە مەرجێ بە گوێم بکات..

سەردار رووی کردەوە بارام و وتی:

- کاك بارام.. وا مەزانە کەس نییە ئیشم لەگەڵدا بکات.. زۆر- درێژەی بە دەنگی(ۆ)ی زۆردا- هەیە، زۆریشم بەرێ کردوون.. ئەوەی هاتووە تێر بووە و بەناپکی وازیان لێ هێناوم یان خۆم —لە رووتا نەڵێم- پوولێکی بێ قیمەتم پێوە ناون، بەڵام کە چاوم بە تۆ کەوت یەکسەر حەزم کرد لەگەڵ مندا کار بکەیت، چونکە دیارە خەڵکی ئەو شارەیت، چونکە مامۆستایەتیت کردووە و بە گفتوگۆدا دیارە پیاوێکی کارامەی.. جگە لەوەش، خۆم و دایکی زریان دەمانەوێ ئەم کوڕەمان پێبگەیەنین، هەر شتێ لە پێناویدا بکەین کەمە...

تۆزێ مات بوو ئەوجا رووی کردەوە بارام ووتی:

- حەز دەکەم ئەوەش بزانی من لەوانەم کە پێیان دەوترێ: (ئاوارە) تۆش کەیفی خۆتە هەرچی دەبی ببە...

بارام بە زەردەخەنەیەکی خەماوییەوە، وتی:

- ئەوە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە.. پەیوەندی من و تۆ لەسەر کارو فەرمانە.. حەز دەکەم تۆش ئەوە بزانی، لای من کەس لە وڵاتی خۆیدا ئاوارە نییە، ئەگەر هەبێ هەمموومان ئاوارەین، ئەوەی ئەو بەزمەی داهێنا بۆ دروست بوونی کینە و بەردەوام بوونی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی..

- چۆن؟..

ئەوانە ئەوەیان دروست کرد بۆ ئەوەی تا مارەکانی زاڵ و دەسەڵاتی سەر شانیان هەمیشە تەسەل بکەن.. با هاوین بێتەوە، رۆژ لێیان بدات ئەوجا دەزانن مارەکانیان لەسەر گوڤەك پەپکەیان دابوو، کە خۆیان دۆزییەوە، ئەوجا خۆیان دەتەکێنن و خۆیان دەبیننەوە..

سەردار باش لە وتەکانی بارام حاڵی نە بوو، هەر ئەوەندەی بۆ دەرکەوت، ئەو پیاوە لە بڵندایەکی زۆر بەرزەوە دەڕوانێتە خوارەوە.. لە کاتێکدا کە بارام خەریکی، دەربڕینی واتەی توێکڵدار و پڕ واتا بوو، سەردار لە گیرفانی کورتەکەیدا دوو سەفتە دە دیناری دەرهێناو.. سەفتەیەکی خستە سەر مێزەکەی بەردەمی و، ئەویتریانی بە بێ بایخانە خستەوە ناو گیرفانی و رووی کردە بارام و وتی:



- ئەمەت با لابێ، ئەوەك پارەت لێ بڕابێ..

دەرهێنانی ئەو پارەیە لەو کاتەدا کە بارام لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو، بەلای بارامەوە رەفتارێکی ناشیرین بوو، لە لایەن سەرداریشەوە، فریاکەوتنی لایەکی تری کار پاڵی پێوە نابوو پەلە بکات.. دەنا خۆ بارام لە گوێی گادا نەخەوتبوو، چاکی دەزانی" پارە لە بازاڕدا، کارە، دەستە، زمانە، گوێ گرتنە، چارەسەرە، دەردە دەرمانە، راست کەرەوەی چەوتییە، چەوتی کەری راستییەکانە، هەم دادوەرە هەم پارێزەر، خزمت بۆ دەکاتە بێگانە و بێگانە بە خزم.."

- نا.. وەری ناگرم... من چ کارێکم کردووە هەتا بافتی ئەوە بێ؟...

- دەبێ وەری بگری...

- لە بڕی چی وەری بگرم..؟

- نا کاکە من شتی وا قبوڵ ناکەم..

- تۆ قبوڵی نەکەی من قبولی دەکەم...

- ئەگەر بیخەیتەبەر راتبی پێشینەوە رەنگە قبولی بکەم...

بەڵام کێ دەڵێ سبەی دێمەوە...

- ئۆە... بێ قەزا بی واز لە مامەڵەی فەرمانبەریەتی بێنە، ئەگەر سبەیش نەهاتیتەوە گەردنت ئازاد بێ...

- باشە وەك مەعاشێ وەری دەگرم...

تۆ وەری بگرە بەر هەرچی دەخەی بیخە... وا من دەڕۆم، زریان و ئەم فرۆشگەیە دەخەمە ئەستۆی تۆ، خۆت ئاسایی بکە. هەموو زەبوونەکان، ناسیاوی خۆمانن، چی دەبەن و چی دادەنێن، دەینوسی... هەڵسا بڕوا... بارام رووی تێکرد و وتی:

- من وا ناکەم لە سبەینێوە، چی لەم فرۆشگایەدا هەیە هەمووی لەدەفتەرێکدا دەنووسم، چی دێ و چی دەڕوا، کێ دەیبا و کێ دەیهێنێ، چەند دەدەن و چەند نادەن دەینووسم، بەو جۆرە کار دەکەم...

سەردار بە قسەکانی گەشایەوە و وتی:

- داوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم، جاروبار سەرتان لێ دەدەم،

زریان بە تۆ رادەسپێرم... بە دەم خوا حافیزییەوە سواری پیکابە دەبڵ قەمەرەکەی بوو، رۆیشت...

بارام ئەو مەسەلەیەی زۆر دایە بەر هۆشی خۆی، بە تەواوەتی نەی دەزانی بۆ وا سەردار بەو ئاسانییە و بەو سەر پێیە ئەوی بە دڵدا چوو، ئایا دەیناسیٚ؟ ئایا پەکی لەسەر یەکێکی وەك ئەو کەوتبوو؟ یان زریان لەماڵەوە زۆری بە باڵادا خوێندەوە؟ یان لەبەر ئەوە بوو چونکە ئەو رۆژە نەی هێشتبوو ئەو کابرایە بە ئاسانی ئەو بەرمیلانە بار بکات و بڕوات... یان نهێنییەك هەبوو پەی پیٚ نە دەبرد؟..

سەفتە دە دیناریيەکە هەر لەسەر مێزەکە بوو، چاوەڕوانی دەستێکی تامەزرۆ بوو... زریان باکی بەو پارەیە نەبوو، بوونی لەسەر ئەو مێزە بەلای بارامەوە وەك کەوێکی کێوی بیٚ پەر و باڵ بوو لە قەفەز نانی باشتر بوو تا واز لیٚ هێنانی، بەڵام تا زریان وا تیٚ نەگات زۆر بە تاسەوەی ئەو پارەیە، ئەویش خۆی لیٚ بیٚ باك کرد، بەڵام جاروبار تیلایی چاوی تیٚ دەبڕی... بۆ ئەوەی لەو بارەوە زریان تاقی بکاتەوە و وتی:

- باشە ئەو پارەیەی بۆ بەجیٚ هێشت؟...

زریان زەردەخەنەیەکی منداڵانەی بیٚ گەردی خستە سەر هەر دوو لێوی و وتی:

- بۆ تۆی داناوە...

بارام خۆی لەگێلی دا و وتی:

- ئۆە.. لەبیرم چوو!...

بەبیٚ ئەوەی لێی ورد بێتەوە، بەبیٚ دەر بە سانە خستییە ناو گیرفانی شرواڵەکەیەوە، بەڵام بە دەست سەنگی کرد لە دڵەوە لێکی دایەوە چەندە و تا چ رادەیەکە، لەبەر ئەوەی پارەکان دەساو دەسیان زۆر پیٚ کرابوو، هەم ژاکاو بوون هەم چڵکی دەسیان گرتبوو لەبەر ئەوە بە تەواوی بۆی دەر نەکەوت چەندە.. بەڵام بە تێکریی دەیزانی خۆی لە سیٚ هەزار دینار دەدات..

ئەوکاتە کە بارام فەرمانبەر بوو لە یەکێك لە بانکەکاندا دەستی لە هەرسەفتە پارەیەك بدایە دەیزانی بڕەکەی چەندە... لە دڵ خۆیدا دەیوت:

پارەکانی ئەمڕۆ بە رەزا وەك کابرای کورخاچییان لیٚ هاتووە، هەم چڵکن، هەم پینە کراو...

ئەگەر بیزانیایە چەندە هەر لە ئێستاوە دەیزانی سەردار چەندی دەداتیٚ، بە قەبارەی سیٚ چوار ئەوەندەی ئەو مووچەیە دەبوو کە جاری وا هەبوو ئەوەندە دوا دەکەوت بە سەوزی دەخورا...

چاوەڕوانی دەرفەتێکی دەکرد زریان لاکەوێت و بێژمێری، یەکدوو جاروبار چووە دەرەوە بە ناو شتەکاندا دەگەڕا و هەستی بە قوورسایی پارەکەی ناو گیرفانی دەکرد، بەلای بەرمیلەکەی خۆیدا تێپەری، لە کاتی سەرنجدانیا دەستێکی خستە سەر سەفتە پارەکەی و لە دڵەوە دەیوت:



- ئای چ بەڵایەکی خۆش واریسی، بوونت سەنگینە، نەبوونت تەنگییە...

لەو کاتەدا دی ناوی یەکێك لە منداڵەکانی بە پیتی لاتینی لە تەمووی بەرمیلەکە نووسراوە، کە دی یەکسەر ئەو گفتوگۆیەی هاتەوە یادکە دادوەر لە دادگا لێی پرسی کە (ئایا بەرمیلەکەی ناوی کەسی لەسەر نووسراوە..)

وەك یەکێك لەسەر گۆڕی پیاو چاکێك دەستە نەزەر راوەستیٚ و راز و نیازی خۆی بۆی بدرکێنیٚ وەها رووی کردە بووە بەرمیلەکە و دەیوت:

- وا منیش لێرەم، چاوم لێتە... ئەگەر ئەمەی بۆم هاتووە تا سەر بیٚ مەرج بیٚ لە بیرت نەکەم... راوەستە و هەندیٚ خوایینت هەبیٚ تا دەرفەت وەردەگرم.. خۆزگە دەهاتیتە قسە و دەمزانی چۆن چۆنی گەیشتیتە ئێرە، رەنگە ئێستا تۆش بڵێی، ئەی تۆ چۆن بوو گەیشتیتە ئێرە!.. هەرجۆر بیٚ بە شوێن تۆدا لە دەرگای ئەو فرۆشگایەوە هاتووم، تا بتوانم لەسەر خۆمی پێوە نادەم....

## (15)

ئەو رۆژە بارام هەستی بە سەرکەوتنێکی پڕ مانا و پڕ گومان و سامناك دەکرد، جگە لە دەرس وتنەوەکەی زریان ئەو سەری ئەو کارانەی کە لە ئەستۆی نرابوون دیار نەبوو، لە هەمان کاتیشدا ئەوەی دەزانی رێگەی کار و کاسبی هەروا بە مافووری گوڵێن رانەخراوە، لەو رۆژەوە، لە دەرگای ئەو فرۆشگایەوە، دەبێ بارام بەخۆیدا بێتەوە و خۆی ئامادە بکات، لەگەڵ ئەو جیهانە نوێیەدا ئالوودە ببێ، وەك بازرگانێك، کڕین و فرۆشتن و هێنان و بردن و سوود و قازانج بکاتە رابەر و سەنگی مەحەکی، بۆ ئەوەی تێ نەکەوێ بزانێ لە تەڵە نانەوە و پاشقولەدانی ئەوانەی بازاڕیان زەوت کردووە چۆن خۆی دەرباز دەکا...

سەردار جگە لە فێرکردنی زریان چ زانیارییەکی تری ئەوتۆی لە بارەی کڕین و فرۆشتن، یان هێنان و بردنەوەی بە بارام نەدا بۆیە لەو کاتەدا نەیدەزانی ئایا گوێی خۆی پان بکاتەوە تا هەموو ورد و درشتێکیان پێ ببیسێ یان چاوی بکات بە دوو سەتەلایەتی بەرین تا گشت دوور و نزیکێکیان پێ ببینێ.. یان خۆی کەڕ و کوێر بکات، هەر ئەوەندەیان پێ هەست بکات کە کار چۆن دێ و چۆن دەڕوا و لە سنووری بەرژەوەندی خۆی و پاراستنی دەسپاکی دا بیانخاتە کار!...

ئەو بارامەی کە هەموو شتێکی دەدایە بەر تیشکی وردبوونەوە، دەبێ بارامی کارمەند و یەکلا بێ و خۆی بە وردە کارییەوە خەریك نەکات.. هەر چەند گومانی پژا بوو، گوێی بە ئەجیاکانی نەدەدا، خۆ هەستی سەرکەوتن چێژێکی وەها نەبوو گەمەی پێ بکرێ، ئەمەی دەستی ئەو کەوتووە لە رۆژێکی وەهادا مەگەر بە خەیاڵ وێنا بکرێ...



ئەوەی ئەو بۆی عەوداڵ بوو سەد قات هاتە دەستی، ساڵەها بوو پەری نەدەکێشا لە دەقی خۆی بێتە دەرەوە، ئارەزووی هاتنە دەرەوەی شتێکی لە رادەبەدەر بوو، وا ئێستا کەوتووەتە ناو کاسبکاران وردە لێکدانەوە نالەبارەکانی دەبوونە مووی ناو ئەو ماستەی کە بە ئاسانی خرابووە بەر دەستی، گەلێ جار لە دڵەوە پاساوی بۆ وردە ختوورەکانی خۆی دەهێنانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی متمانەی بە خۆی توند و بەتین بوو، وەك گەردیلەی بەر تیشکی هەتاو لەمە دەجووڵان دەیڕاندن...

بارام دڵی خۆی بەوە خۆش دەکردکە ئەو کەسەی لای دامەزرابوو، بە پیاوێکی دنیا دیدە و کارامە دەهاتە بەر چاو" رۆژگار و کار و فەرمان قاڵی کرد بوو، بە قسەکانی دا پیاوێکی بەئاوەز و فامیدە بوو. ئەمە بار سووکییەك بوو بۆی.. لە دڵ خۆیدا دەیوت: لەمە چاکتر هەر خۆیەتی، خۆ من بە شوێن کارێکدا دەگەڕام، هەر کارێك بێ کە گوزەران لە پەنایدا دەست بدات، گریمان لای ئاسنگەرێك کارم دەست کەوت، دەبوو هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە ئاسنی سارد بکوتمەوە و پیك بووەشێنم.. یان ببوومایە شاگرد لە گیپە خانەیەك، خۆ دەبوو هەر ناو گەدە و ریخۆڵەی گاو گولك پاك بکەمەوە.... یان وا دانێ لای فیتەرێك ببومایە بە شاگرد دەبوو بکەومە بەر دەستی یەکێك، کێ ناڵێ ئەو یەکە لۆتی نە دەبوو ئیدی لە بن پێمەوە تا بن گوێم لە گریزدا دەچەقام، ئایا دەمتوانی دە رۆژ لەگەڵیدا کار بکەم؟، بەر دەستی بکەم؟ ئەی رۆژانەم چەند دەبوو؟ خوا دەزانێ؟.. بە راستی ئەوەی بۆ من هاتووە بۆ ئەوانەش کە (هۆما) لەسەر شانیان نیشتووەتەوە نەهاتووە.. وەك لەدڵێیان نابێ من پێویستم بە پارەیە، بەبێ ژماردن، سەفتەیەك پارەی خستە بەر دەستم..

تۆ خوا بارام پێم بڵێ، تا ئێستا ئەم جۆرە دەرگایە لە سەر گازی پشت بۆ کەسێکی تر کراوەتەوە؟.. دەی تۆش درێغی مەکە و بە دڵسۆزانە کاری بۆ بکە، ئەم کوڕەی کە هەموو ئومێدی پاشە رۆژێکییەتی، پەروەردەی بکە و نانەکەی خۆت هەم حەڵاڵ و هەم بێ مینەت بکە...

تێناگەم بۆچی تا دوێنێ ئەوەندە تامەزرۆی دۆزینەوەی کارێك بووم دەستم کەوێ، هەر کارێ بوایە وا ئەمڕۆ کارەکە خۆی دەرگای بۆ کردوومەتەوە، کەچی ناخی دەروونمی پڕ لە گەردە لوول کردووە، چی تۆز و خاشاکێکی کۆن لەوێدا خڕ بووەتەوە هەمووی بە یەکدا داوە، تۆ بڵێی ئەمە هەڵتەکاندنی قاڵبە دەقگرتووەکەی جارانم نەبێ؟ دەیەوێ دەری نەداو رێ بۆ ئەزموونە

تازەکان چۆڵ نەکات؟... دیارە دەق شکاندن و نوێ کردنەوە، بارێکی وا ئاسان نییە، هەموو کەسێك بەرگەی بگرێ...

ئەو رۆژە بارام تا رادەیەك توانی ئالوودەی ئەو کارە ببێ کە زۆربەی چمکەکانی لێی دیار نەبوون، هەر خەریکی بە خۆدا چوونەوە و دڵدانەوەی خۆی بوو، ساڵانی رابردووی و ئێستای بەدانە و مسقاڵ بەراورد دەکردن، ئەوەی بە خەیاڵی خۆیدا دەهێنایەوە کە هیچ کاتێك، لە زۆربەی هەڵوێستدا توانای ئەوەی نەبوو لە کاتی لێ قەوماندا یارمەتی یەکێك بدات، دوێنێ بوو ئەگەر کتێبەکانی نەفرۆشتبایە نەی دەتوانی ئەو برە پارەیە بداتە پەریخانی ژنی بۆ ئەوەی بەشداری باربوو کردن لە پرسەی خوشکی دا بکات، خۆ ئەگەر شلێری کچی ئەمرۆ ئەو برە پارەیەی کە بەهۆی پرۆژەوە بۆ خۆی خڕ کرد بووەوە بۆ ئەوەی پێویستێکی خۆی پێی جێبەجێ بکات، ئەگەر ئەوە نەبووایە لەوانە بوو نەگاتە ئەم شوێنە...

هەر لەو رۆژەوە جێ پێی هەنگاو نانی خۆی روون کردەوە، ئەو ئەرکانەی کە مامۆستاکانی خستبوویانە سەر شانی زریان، لەسەر خۆی و بە ئارەزووی ئەو و بە شێوەیەکی سادە و رەوان بۆی راڤە دەکرد و جاروبار لە دەرەوەی سنووری بابەتەکاندا، بە مەبەستی هۆشیار کردنەوەی هەندێ پرسیاری لێ دەکرد و بەقەد خۆیان وەرامەکانی پێی دەوت، بەوە خۆی دڵنیا کرد کە جگە لە راستە بابەتەکانی ئەرکەکان شتی تریشی فێر دەکرد. جاروباریش لەبارەی باوکی و ژیان و گەشت گوزار کردنیانەوە وردە پرسیاری سادە و سانای لێ دەکرد، بەوا بۆی دەرکەوت کە باوکی تێکەڵاوی لەگەڵ گەلێ لایەن و شوێنی جیا جیاوە هەیە و گەلێ دەولەمەند بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی تاکە دەسە و یەکێکی دڵسۆزی نییە، بۆیە کەوتووتە ژێر بارێکی گرانەوە.. ئەو خزمانەشی کە هەیبوون نەمابوون بەس دایان دەتەکان و لێیان بەردەدایەوە و دەسباریان نە دەکرد، ئەویش بڕوای پێیان نە مابوو، هەر بۆیەش حەزی وا بوو بێگانە کارمەندی بێ نەك خۆیش...

ئێوارە کە گەڕایەوە ماڵەوە، پەریخانی خێزانی لە دەرەوە بەدی کرد، لە دڵەوە لە خۆی پرسیاری دەکرد و دەیوت:" پەریخان بۆچی هاتووەتەوە، ئەی ئەو منداڵە هەتیوانەی بە دیار کێوە بە جێی هێشتوون؟"

بارام وەك جاران بە رووی گەشەوە پێشوازی نەکرا، پەریخان بایەخی نەدایە، ئەو رەوشەی والێك دایەوە، ئافرەتی خوشك تازە مردە بۆ ئەوەی رێز لە خۆی و مردووەکەی بنێ وا دەربخات کە کۆسێکی گەورەی کەوتووە دەبێ لای نزیکترین کەسیش خۆی بە مات و مەلوول پیشان



بدا.. تاقە کەس کە لە بنەماڵەی باوکی پەریخان مابوون تەنها خونچە بوو وەك دایکێك هەموو راز و نیازێکی دڵی لای ئەو بوو، ئەویش رۆیشت و کۆشی منداڵی بێ نەوای لە پاش بە جێ ما، جا ئیتر چۆن داماو و مەلوول نەبێ؟!

بارام رەوشەکەی وا دی و وای لێکدایەوە واشی پێی پەسند بوو کە ئەو مژدەیە هێنا بوویەوە، پەلە لە دەربڕینیا نەکات، وای بڕیاردا تا هەموو پێکەوە دانەنیشن و سەرجەم منداڵەکانی ئاگادار نەبن، لە بارەی خۆیەوە شت نەدرکێنی، بۆ ئەوەی هەموویان پێکەوە ئەو بارە نوێیە وەربگرن و بیکەنە پەڕەیەکی نوێی باری گوزەران و شێوەی تازەی ژیانیان..

لە دڵەوە گەشاوە بوو، چونکە دەستی لە کارێ گیر بووە بژێوی خۆی و منداڵەکانی خونچەی پێ دابینکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا پەردەیەکی ئاستەمی ماتەمینی بە سەر رووی خۆیدا کێشا...

حەزی لە شتی ناکاو و لە پڕ نە دەکرد، نەیویست ئەو رەوشە سارد و سڕەی ماڵەوە لە پڕ بگۆڕێ بۆ رەوشێکی تر، دیارە رووناکی و چرای ناو ماڵ کەیبانووی ماڵە، ئەوەتانی کەیبانوو دەڵێی بە دیار ماڵی کاول و بەتاڵان براوەوە دانیشتووە و رەش پۆشە، بارام پیاوی ماڵەوەیە، پیاوی سایە و مایەی خانەوادەی خۆیەتی، بە بێ دەنگی چووە ژوورەوە و چاوی بە هۆدەکاندا دەگێڕا و لە پەناشەوە هەستی بۆ هەڵسوکەوتی پەریخان و منداڵەکانی راگرتبوو...

پەریخان بە تووڕەییەوە پێڵاوەکانی تووڕ دایە ناو چەکمەجەکەوە و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- (هەڵی تەکێنە، کۆڵت سەنگینە)

"هەژاری نانی هاری بە دەمەوەیە" پەریخان دەیزانی بارام بەو دەستکورتەیەی گەلێ پەست و نارەحەتە، بەڵام وەك ئەو دەری نابڕێ، دەیویست بەو حاڵەی سەرزەنشتی بکات، لە دڵیشەوە بەزەیی پیا دەهاتەوە، خۆ هەر تەنها ئەو گیرۆدەی ئەو بارە نەبووبوو، هەموو مووچە خۆرێك کە پشتی بە مووچە بەستبێ لەو رۆژەدا لەوان چاکتر نەبوو، ئەو دەیویست پرسێك هەیە پێی بکات و بڕواتەوە لای منداڵەکانی خونچە، بەڵام ماڵێك ژەمە خواردنێك، یان پیاڵە چایەکی گەرمی تیا دەست نەکەوێت لەسەر چی کۆ ببنەوە و راو تەگبیرێ، یان پرس و رایەك بکەن، هەوار سارد و سڕ و خاڵی بێ کەسی تیا دانانیشێ، یارای ئەوەشی نەبوو پێی بڵێ وەرە دانیشە کارێکم پێتە... پشتی بە کۆڵەکەی هەیوانەکەوە داو دانیشت و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

– خوایا ئەوەندە نزامان کرد کە لاوەمان وشك بوو، لە مە زیاتر تووشی بەڵامان مەکە... ڕێیەکیش بخەرە بەر بارام با واز لەو وشك و ڕەق و تەقییەی بێنێ.. هەی هاوار چیمان سەوز کرد.. ئەمە کەی حاڵە، پەنا بۆ لای کێ بەرین..

بارام کە دی منداڵەکانی هەر یەك لە سووچێکدا ماتن و غەم سەری تێکردوون شلێری کچی بانگ کردوو پێی وت:

– حەز دەکەم خڕ ببنەوە و قسەیەك هەیە پێتانی بڵێم..

شلێر بە جۆری دەربڕینی داخوازییەکەی باوکیدا زانی، قسەیەکی دڵخۆشکەرەی لایە، بۆیە لە خۆ پەرمینەوە ئەو داخوازییەی کرد، لە هەمان کاتیشدا ئەو پەردەی غەمەی کە لەبەر خاتری پەریخان بەسەر دەم و چاوی خۆیدا هێنا بووی لای دایەوە..

شلێر بە ئاستەم بە دایکی وت:

– لەوە زیاتر غەممان مەدەرێ، تۆ دەزانی ئێمە لە چ حاڵێك داین، وا مەزانە هەر تۆ دڵ تەنگی، باوکم لە هەموومان پەڕۆشترە، چەند ڕۆژە دنیای لێ تاریك بووە، ئەوەندە خۆت مڕو مۆچ مەکە... وەرە بزانە چی دەوێ...

وای وتو گەڕایەوە لای باوکی..

بارام بە ڕووێکی گەشترەوە وتی:

– ئەوە بۆ نەهات؟..

– هەر ئێستا دێ.. تکایە باوکە، خۆت دەزانی ئەوەی قەوماوە هەر لە دایکم قەوماوە، کارێکی وا بکە دڵی بدەرەوە...

– خەمت نەبێ، نەك دڵی دەدەمەوە دڵی خۆش دەکەم...

یەکە یەکە منداڵەکانی گاز کرد کە لە دەوری خڕ ببنەوە...

ڕووی کردە هەمووان وتی:

– بەڕاستی مردنی خوالێخۆش بوو، ڕووداوێکی گرنگ بوو، هەموومانی خستە ناو تای تەرازووی تاقیکردنەوەیەکی نوێوە.. ڕاستە مردن برا گەورەیە و هەموو کەس دەمرێ و ئەو ڕێیەی لەبەرە، ئەوەی دەبێ لەگەڵ خۆیدا مردن دێنێ و هەندێکە لە بوونی, گرنگ ئەوەیەمرۆڤ لە مردنی نەسڵەمێنێتەوە و خۆشی بە دەستیەوە نەدا، مردنی خونچە نابێ ببێ بە هۆی مردنی منداڵەکانی، لەسەر هەموومانە، یارمەتییان بدەین..



لەو کاتەدا کە بارام ئەو قسانەی دەکرد پەریخان، بە ئاستەم هاتە لایان، وردە فرمێسکەکانی بە گۆشەی لەچکەکەی سەری دەسڕینەوە، دیار بوو لە ماوەی پرسەکەدا ئەوەندە گریا بوو ئاو لە لاشەیدا نەمابوو، ڕوومەتی زەرد هەڵگڕا بوو چاوەکانی فڕمێسك سووتاند بوونی و پڕ لە خوێن ببوون.. مردنی تاکە خوشك و غەمی هەتیووی چوار منداڵ هێزی لە لەشیدا نەهێشتبوو.. بارام کە چاوی بە پەریخان کەوت، ڕەوتی قسەکانی خۆی کە مەبەستی بوون بیانکات گۆڕی و ئەم پرسیارەی بایەخدار کردوو، بە پەریخانی وت:

– بۆ ئەو منداڵانەی خونچەت بەجێ هێشتووە؟ ئەی بۆ لەگەڵ خۆتا نەت هێنان..

پەریخان بەتەوەسەوە وتی:

– لەگەڵ خۆم...

– بەڵێ لەگەڵ خۆت!.. لەم ڕۆژەوە ڕازی نابم ئەو منداڵانە هەست بکەن، بێ دایك و باوکن...

– دایك و باوك؟!...

– بەڵێ.. ئەی من و تۆ بۆ چی باشین...

پەریخان سەری قسەی بردە لای خۆی و ڕووی کردە بارام...

– لێم دەپرسی، ئەو منداڵانەت بۆ بە جێ هێشتوون، با پێت بڵێم بۆ بە جێم هێشتوون.. هاتووم یەك پرست پێ بکەم بزانم چی دەڵێ، نەك سبەی ڕۆژ بڵێی بۆ پێمت نەوت...

– ئادەی بزانم..

– تۆ چی دەڵێی ئەو منداڵانە لە ماڵاندا دابەش بکرێن..

– یانی چی دابەش بکرێن؟...

– هەر خەیرە و مەندێمنداڵێك دەباتەوە لای خۆی بە خێوی دەکات...

– بۆ؟..

– دەزانی بۆ؟.. ئەمە حاڵمانە، ئەوانیش جگە لە من کەسێکی تریان نییە، خەڵکی گەڕەکەکە و خەیرە مەند لە دوێنێوە تەگبیریان وا کردووە، هەر یەك منداڵێك بباتەوە لای خۆی، بەخێوی بکات... تۆ چی دەڵێی؟.. بۆ ئەم پرسە هاتوومەتەوە...

بارام زەردەخەنەیەکی، ڕووناکی پڕ بە حەسرەتی خستە سەر هەر دوو لێوانییەوە و وتی:

– دەی با منیش پێتان بڵێم: من لە دوێنێوە وازم لە فەرمانبەری هێناوە..

شلێر وەك لەسەر تاشە بەردێ بەر بێتەوە، وا ڕاچڵەکا و وتی:-

- بابە یانی چی وازت لە فەرمانبەری هێناوە!؟..

- یانی چی؟ یانی لەمەو دوا مووچە خۆری ناکەم...

- ئەی ئەو تەقە قەقەش نەمێنێ چی دەکەین!...

پەریخان زوو هاتە دەم..

- بۆ ئەم بەزمە ئێمەت دەوێ، گوێ بۆ ئەم خەبەرە خۆشانەت رابگرین...

بارام بە رووێکی گەشەوە، وەرامی دایەوە:

- نا.. خەبەری خۆشتر ماوە... پەریخان هەر کات بارام مرد و ناوی کۆر بووەوە، ئەو کاتە دەرۆی ئەو مندالانە بەسەر مالاندا دابەش دەکەی... تێدەگەن چیم وت؟ رووی کردە هەموویان:

- تێگەیشتن بارام چی وت؟...

پەریخان قەت لەو باوەرەدا نەبوو، ئەو برینانەی ئەمرۆ کە لە ناو هەناویدا هەویان کردووە، بەوتە رەهەندەکانی بارام سارێژ بن، بۆیە بە شێوەیەکی نا ئومێدانەوە وتی:

- پێمان بلێ کامەیە خەبەرە خۆشەکەت؟..

- ئەوەیە: تۆ پەیمان دەدەی ئەو مندالانە وەك دایکیان بە خێو بکەی؟...

- کام مندال؟..

- ئەوانەی کە دەربارەی دابەشکردنیان پرسم پێدەکەی؟...

- یەکێك ناچار نەبێ مندالی دابەش دەکات!..

بارام لە ئاماژەی ناوەوەی وتەکەی پەریخان حالی بوو، بۆیە وتی:

- لەو رووەوە ناچاری نەما...

دوای هەندێ بێ دەنگی:" پەریخان لەم ساتەوە بریار بدە، کامیانت لا خۆشە: لای ئەو مندالانەی خونچە دادەنیشی و بەرێك و پێکی وەك دایکیان بە خێویان دەکەی یان دەیان هێنیتە لای خۆمان وەك مندالی خۆت گەورەیان دەکەی؟...

- تێناگەم...

- پەریخان؟ من لەسەر کارێك دمەزراوم، لەوانەیە بژێوی چەندان مالی وەك خۆمان دابین بکات و هێشتا لێی زیاد بێ..

پەریخان گوشاد بوو، بەتایبەتی بەوەی کە مەسەلەی مندالەکانی خوشکی پێش هەموو مەبەستێکی تر خست، لە ناو ئەو هەموو تاریکی غەمەدا گەشایەوە و وتی:

- خوا بکا هەر قسە نەبێ!...



- هەر قسە نییە و راستییە..

شلێر کچی گەورەی بارام بوو، پاش دایکی بە دەمراستی مالەوە دادەنرا، باوکی لە زۆر کاردا پرسی پێ دەکرد و رای وەردەگرت، پتر لە هەموویان حەزی دەکرد باوکی لەوە زیاتر دەستکورت نەبێ و کاسبییەك بدۆزێتەوە، بۆیە خۆی پێ نەگیرا و وتی:

- بابە پێمان بلێ چۆن چۆنی بوو؟..

- مەسەلەی دامەزراندنەکەم دوور و درێژە، کورتیەکەی ئەمەیە: لای پیاوێك، لە تەمەنی خۆمدایە، ئاوارەیە، کاسبکارە، پێویستی بە یەکێك هەبووە، دەست پاك و کارامە و زمان زان بێ و خەلکی ئەم شارە بێ، رێکەوت وا بوو منی دەسکەوت و لای دامەزرام، تاکە کورێکی هەیە ئەویش مندالە...

شلێر لە زووەوە خەمی بۆ ئەو دەست کورتیەی خۆیان دەخوارد، بەلام دەری نە دەبری، چونکە دەیزانی هەر ئەوان نین، هەموو مووچە خۆر گیرۆدەی ئەو بارە نالەبارە بووبوون، زۆر خەمی باوکی بوو کە لە ژێر ئەو بارە قورسەدا بچەمێتەوە و ناچاری بکات پەنا بەرێتە بەر پیاوی نامەرد و پارەدار، کە باوکی بە کورتی مەسەلەی دامەزراندنەکەی گێرایەوە. وەك ئاو بکەیتە بن چلە رێحانەیەکی سیس بووی بێ ئاو لەگەل هەلمژینی ئاوەکە وردە وردە بگەشێتەوە، ئاوا لەگەل وتەکانی باوکیدا دەگەشایەوە و گەلێ شتی تریشی بە دل خۆیدا دەهێنا، بەلام کە وتی:"تاکە کورێکی هەیە ئەویش مندالە" خۆشی بە خەیال روو چوونەکەی لێ تێکدا... هەندێ مات بوو، بەلام زوو فریای هەلوێستەکەی کەوتەوە و وتی:

- بابە تۆ بلێی بۆ دلخۆشی ئێمە ئەو قسانە نەکەیت؟...

- بابی خۆت دەناسی کەی درۆی لەگەل خۆیدا کردووە..

دەستی بە گیرفانی شروالەکەیدا کرد و سەفتە دە دیناریيەکەی دەرهێناو وتی:

- ئەگەر بڕواش ناکەن، ئەمە بەلگە.. ئەگەر دەشپرسن ئەمە لە بری چی؟.. دەلێم، ئەمە پێشینەیەکە لە مانگانەکەم...

لەو کاتەدا شلێر کە خەریکی ژماردنی پارەکان بوو، بارام بەم جۆرەی خوارەوە ئاخاوتنی لەگەل پەریخاندا دەکرد:

- ئای.. چەند جار بە رووی منتا داوە و وتووتە:" هەموو کەس هێلکەی نایەوە و هەلی هێنان، کەچی هێلکەی ئێمە هەر لەبن سەبەتەدا مانەوە". ئەوا هەلی هێنان..

هەر دەتوت:" دەبێ بەرەو خواروی خۆمان بڕوانین، ئەوەندەمان رووانی ملمان خواربوو.." ئەوا سەرکەوتین، لەمەو دواش هەر بۆ خوارەوە دەڕوانین، بەو نیازەی چاومان لە خەڵك بێ و لە خۆ بایی نەبین..

هەر دەتوت:" تا ماوین لەو کراسەی کە بە بەر خۆماندا بڕیووە نایەیینە دەرەوە" وا هاتینە دەرەوە و رێگەیەکی ترمان لەبەر دەم پاشەڕۆژماندا گرتە بەر...

هەر دەتوت:"ئۆف تاکەی ئەم حاڵە" ئەگەر لەبەر زاخاوی ئەو برینەی خونچە نەبووایە دەمووت: لە مەودا بڵێ: ئۆخەی.. بەڵام لەگەڵ" ئەوەشدا دەبێ هەر بڵێین:"ئۆخەی" کارێکی وام دەستکەوتووە شایەنی خۆمە و لە خۆم دەوەشێتەوە هەمدیسان ئۆخەی کە لە رۆژێکی وەهادا هات، هەم ئێمەی لەو حاڵەی تیایدا بووین بە دەرکرد، هەم بوو بە هۆی پەروازە نەبوونی ئەو منداڵانە..

پاش ژماردنی پارەکان، بارام هەزار دیناری دایە پەریخان بۆ ئەوەی بیدا بە پێویستی منداڵەکانی خونچە، هەزاری دایە شلێر بۆ خەرجییەکانی ماڵەوە، هەزارەکەی تری کرد بە دوو بەشەوە بۆ وردە خەرجییەکان، بەشی لای خۆی گل دایەوە و ئەویتری دایە شلێر کە پێویستییە کاتییەکانی منداڵەکانی پێ جێبەجێ بکات..

دیار بوو پەریخان لە دڵەوە لۆمەی چانسی خۆی دەکرد، کە ئەو دەرگایەیان کاتێ لێ کراوەیە ئەو لە لایەکی ترەوە دووچاری ئەو نەهامەتییە ببوو، تا ئەمڕۆ ماڵی خۆی لە نێوان بوون و نەبوونی بەم رۆژە گەیان، ئەمڕۆش وا خوشکی مردوو کۆشی منداڵی بێ کەسی بۆ ئەو بەجێ هێشت، لە دڵیشەوە دەیوت بڕیا خونچە چاوی لێ دەبوو، دەیدیت کە چۆن بارام پارووی خۆی دەخاتە ناو دەمی منداڵەکانی ئەوەوە، بەڵام لەناخی دەروونی دا، خۆشی و ناخۆشی و رووناکی و تاریکی تێکەڵاو بەیەك دەبوون، بۆ دامەزراندنی بارام، ناخۆشی لە مەترسی و گومان لەو دامەزراندنە، لە رۆژێکی ئاوادا و بەو مانگانەیە کە ئەوە پێشینەیەتی.. رووناکی بە دڵشادی و گوشادی منداڵەکانی و فریاکەوتنی ئەو هەتیوانە، تاریکی لە دانانی ئەو لە ناو چەقی ئەو دوو رێیانەدا، کام لا هەڵدەبژێرێ، منداڵەکان بێنە ئێرە؟ یان لایان دەبێ و وەك داکیان بەخێویان دەکات؟..

خوایا کێ بەرگەی ئەو هەڵبژاردنە دەگرێ؟ هەردوو رێگە کە تاریکن و ئەو سەریان دیار نییە، ئەوەیان لە ماڵ و منداڵی خۆم دوورم دەخاتەوە، منیش منداڵم وردە و کچم عازەبە و مێردم بێ کەیبانوو دەمێنێتەوە، ئەمیانە، کولانەکەی خۆیان کۆر دەبێتەوە و ئەو هەموو



منداڵەش لە ماڵێك سەدان گرفت دروست دەکەن.. دابەشکردنیشیان بە سەر خەڵك دا کەمایەتییە بۆ ئێمە، منیش قبوڵ بکەم، بارام نایکات...

پەریخان لە دڵ خۆیدا وا لێکی دەدایەوە، خۆزگەشی دەخواست لە پێش خونچەدا بمردایە، ئەو دامەزراندنەی بارامە بۆ ئەو لەو هەڵویستەدا بە باش نەهات، حەزێکی کرماوی لە کەنارێکی دەروونیدا ژەهری گومانی دەپژان و دەیویست بەری ئەو رووناکییە بگرێ کە تازە بە سەر ماڵەکەیدا گزنگی دابوو.. ناحەقیشی نەبوو، کار دۆزینەوە لەو رۆژەدا بەو جۆرە و بەو هەموو پارەیە، چەندان گومانی راست و چەوتی لێ دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی پتر هۆشی پەریخانی بەرەو لارە سەنگ بوونی راستی دەبرد، بارام خۆی بوو بارامێکی، راستگۆ و خاوەن بیروباوەڕی چەسپاو و نەگۆر لەوانە نەبوو بە ئاسانی بکەوێتە ناو گێژاوێکەوە ئەنجامەکەی دیار نەبێ..

پەریخان کەوتبووە ناو سارای خەیاڵاتەوە نەی دەزانی بە چ لایەکدا پەل بهاوێ و رێ دەرکات، ئاگاشی لەوە نەمابوو بارام چاوەڕوانی بڕیاری ئەوە، هەر ئەوەندەی زانی، پێی وت:

- ها چیت وت؟...

پەریخان وەك لە بیرێکی قووڵدا هاتبێتە دەرەوە وتی:

- لە بارەی چییەوە؟!..

- لە بارەی ئەوەوە کەوتم.. لێرە، یان لەوێ؟..

پەریخان زمان لە ناو دەمیدا وشك بوو، ویستی بە تەڕایی ناو گەرووی رێگە بۆ دەربڕینی رایەك خۆش بکات، بەڵام چی هەوڵی دا وشەیەك بڵێ بۆی نەهات و ئارەزووی نەبوونی هەر دوو لا هەموو گۆیەکی ناو زاریان بۆ ناو گەنجینەی هزری کشانەوە و دەرگای لەسەر رەپیش کردن... بەرامبەر بە رادەبڕین دەسەپاچە بوو، هەر ئەوندەی تیا مابوو بە شێوەیەکی نا هەستی هەردوو لەپی دەستی پان کردوەوەو بە یەکیدا دان و پانی کردنەوە، وەك بە زمانی حاڵ بیەوێ بڵێ: ناتوانم بڕیار بدەم، هەر لایەکیان دەڵێم هەر وەی تیایە..

شلێر کە زانی، زاری هات بە یەکدا و ناتوانێ منتق بکا، وەك بیەوێ یارمەتی بدا پێی وت:

- دایە باوکم لەگەڵ تۆیەتی؟!..

- ئێوە چی دادەنێن وا دەکەم...

بارام هاتە دەم...

- نا.. تۆ خۆت سەر پشکی، بۆ ئەوەی سبەی رۆژ باری خۆت لە گەردەنی خۆتدا بێ... وتەی باری خۆت لە گەردەنی خۆتدا بێی بارام رێگەی بڕیار دانەکەی پڕ لە دڕك و پێکوڵی کرد، گومانەکانی خەست کردنەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ چارەیەکی نەما دەبێ رێگەیەك لەم سێیانە هەڵبژێرێ، یان بچێتە لایان، یان بیانهێنێتە ئێرە، یان وازیان لێ بێنێ هەر یەکێکیان خەیرە و مەندێ بیباتە لای خۆی، هەر کامیان بکات بارام ئامادەیە وەك مندالّی خۆی گوزەرانیان بۆ دابین بکات ئەوە نییە، پارەکانی کردە سێ بەشەوە، یەکەم بەش بۆ ئەوانی دانا..

بارام کە زانی پەریخان رووبەڕووی راستییەکی چەند لایەنەی وا بووەتەوە، لە هەر روێکەوە بەری پێ دەگرێ، دەترسێ سبەی رۆژ دەستی بە زاخدا بچێ و گیرۆدەی ببێ، بۆیە بڕیاردان لە گەرویدا پەنگی خواردووە..بۆیە بارام پێی وت:

- پەریخان.. ئەوە من و ئەوە تۆ و ئەو مندالآنە، هەر لایەك بڕیار دەدەی من ئامادەم، بەلاّم ئامادەنیم پەڕاگەندە بن، تۆش کەیفی خۆتە.. ئێستا من بڕیارم لە تۆ دەوێ...

شلێر کەوتە بەینەوە و هەڵوێستەکەی خستە سەر بارێکی تر و وتی:

- چی دەڵێن... با بۆ ماوەێك بچێتە لایان، دوای ئەو ماوە چی پەسەند بوو ئەوە دەکەین..

بارام پێشنیارەکەی شلێری پێ خراپ نەبوو... دەست بەجێ لە شوێن خۆی هەڵساو وتی:

- پێشنیارێکی بە جێیە...

هەڵسانەوە و پەسەند کردنی پێشنیارەکە، سەر نانەوە و کۆتایی هێنان بوو بەو بابەتە، دەنا بیرکردنەوە لە مەسەلەیەکی وەها، سەدان لق و پۆپی لێ دەبووەوە، بۆیە بە چاکی زانی لەوێوە دەستی پێ بکرێ و ئەو کون و کە لەبەرانەی کە لێی دروست دەبن، بۆ کاتی خۆیان لێیان گەڕێن، هەر شتێ بە کاتی خۆیەتی.. بارامیش لە کاتی بڕیاردان لەسەر ئەو مەسەلە و پەسەند کردنی پێشنیارەکەی شلێردا چەندان ختوورە بە دڵیدا دەهاتن و دەچوون، بەلاّم ختوورەکانی ئەو وەك هینەکانی پەریخان نەبوون، وەك رەشکەو پێشکەی بەر چاو وەها بوون، مەترسییان دروست نەدەکرد، کەچی ئەوەکانی پەریخان تەلی مەترسیەکانی دەلەراندەوە و لە رادەبەدەر گومانیان بۆ دروست دەکرد، خۆ ئەویش دەیزانی دابەشبوونی خێزانێك بەو جۆرە، تەنها بەخێو کردن نییە، بەڵکو شتی تری بەدوا دەهات.. ئەو لە بەیانی ئەو شەوەوە دەبێ خۆی بۆ ئەو کارەی تەرخان بکات کە تازە لەسەری دامەزراوە، پەریخانیش دەچێتە لای مندالّەکانی خوشکی و لە جیاتی هەموو کەسیان نگابانیان دەکات، دەمێنێتەوە، شلێر و مندالّەکانی خۆی، کە جگە لە شلێر ئەوانی تر لە نێوان قۆناغی یەکەم و دووەمی خوێندا بوون، شلێریش کاتی بالّفربوونی هاتووە و



لەمە دەرگای بەختی کرایەوە بەرێی خۆیدا دەچێ.. مەترسییەکانی بارام بابەتی بوون، ئەوەکانی پەریخان خودی بوون، هەردووکیشیان ئەگەر بوون و لە راستییەوە دوورنەبوون.

راو تەگبیر لەسەر پێڕەو کردنی ئەو پێشنیارە کە بۆ پەریخان بڕیار درا زۆری مابوو، ئەو دەیویست هەندێ ئەو مەسەلەیە لە ناو خۆیاندا بجولێنی بۆ ئەوەی هەندێ چەمکی هەبوون بۆی روون ببنەوە و لەوەش دلّنیا بێ کە ئایا دەتوانێ مالّ و مندالّەکانی لاشەخەر نەکات و ئەو هەتیوانەش دوور لە مالّی خۆی نگابانی بکات، جگە لەوەش تا ئەو ساتە لە دامەزراندنەکەی بارام و واز هێنانی لە فەرمانبەری بۆ روون نەبووەوە، لە دلّەوە دەیوت:

دەکرێ بۆنی دایکیەتی خۆم بە مندالّی خەلّکەوە بنێم و هی خۆمی لێی بێ بەش بکەم.. کێ ئەمەی کردووە؟!

بارامیش دەیویست لەو رووەو پتر کارەکەی خۆی و واز هێنانی لە کاری مووچە خۆری بۆیان روون بکاتەوە، شلێریش لە چاوڕوانی ئەمرۆ و بەیانی چارەنووسی خۆیدا بوو، کەچی وا نەکردە و نەخواردە، بە پێشنیارەکەی بەرێوەبردنی مالّێکی بە شاندا درا، کەوتە ژێر بارێکەوە کە رەنگە لە کاروانی دوا بخات، ئەگەر ئەو وتەی باوکی نەبووایە کە وتی:"هەر شتێ بە کاتی خۆیەتی" لەوانە بوو لە پێشنیارەکەی خۆی پەشیمان دەبووەوە، ئەم لای دەگرت کە مندالّە هەتیوەکان بێنە ئێرە نەك دیکیان بڕواتە لایان و ئێرە بخاتە سەر ئەستۆی ئەو..

لە گەرمەی ئەو وردە بیروبۆچوونانەدا بوون، بارام راچلّەکاو راسپاردەکەی کاروانی مەلا جەوهەری هاتەوە یاد وەك یەکێك لە ناو خەونێکی نارەحەتدا راپەڕی وا بە کامەرانی کوڕی وت:

- کامەران.. هەر ئێستا دەچیتە مالّی مەلا جەوهەر و پێی دەلێی وەرە مالّ خۆمان، باوکم هەوالّی کامەرانی پێیە...

کامەران زوو غاری داو رۆیشت، لە دەم دەرگای دەرەوە هەڵوەسەیەکی کرد و بە توندی بەرەو دوا گەڕایەوە وتی:

- بابە!.. مارف ئەفەندی هاتووە بە شوێنتا دەڵێ:

حاجی سلیم ئەمری خوای کردووە!..

بارام زوو هاتە دەم و وتی!؟..

- حاجی سەلیم!؟.. کام حاجی سلیم!؟..

- حاجی سەلیمی دوکاندار..

- حاجی سەلیم!.. مێردی جوان خان؟..

پەریخان و شلێر بە بیستنی هەواڵەکەی کامەران گەشانەوە و پەردەیەکی خۆشحاڵی لە بیر بردنەوەی گیروگرفتەکانی خۆیان دای پۆشین، بەڵام بەو هەواڵە ناخۆشەکەی مارف ئەفەندی یەکسەر رەویەوە...

پەریخان رووی کردە کاروان و وتی:

- کێ دەڵێ حاجی سەلیم مردووە؟..

منداڵەکە شڵەژا و وتی:

- مارف ئەفەندی وای وت، ئەوەتا لە دەرگا راوەستاوە باوکمی دەوێ..

بارام بە سەر کارواندا نەڕاندی وتی: نەمووت بڕۆ بۆ ماڵی مەلا جەوهەر؟!..

منداڵەکە بە غاردان، بە بێ لاکردنەوە بەرەو ماڵی مەلا جەوهەر رۆیشت...

بارامیش بەرەو دەرگای دەرەوە چوو، پەریخان ویستی بە دوایدا بچێ و بە گوێی خۆی ببیسێ کە ئایا مردنی حاجی سەلیم راستە یان نا... زوو شلێری کچی گلی دایەوە و پێی وت:

- دایە.. خۆت سەخڵەت مەکە، تۆش تازییە باری، خۆشت دەرمەخە، کەس گلەیی لە تۆ ناکات، تا یەك دوو رۆژێکی پێ بچێ، ئەوجا وەرەوە پێکەوە دەچین لای جوان، بەڵکو واش نەبێ.. دیار بوو هەواڵی مردنەکەی حاجی لە لای پەریخان کاریگەرتر بوو، تا هەواڵەکەی کاروان لە لای شلێر..

بارام لە مارف ئەفەندییەوە زانی، حاجی سەلیم، لە بەغدا بە سەکتەی دڵ مردووە و تازە تەرمەکەیان هێناوەتەوە، بەڵام بارام دڵنیا نەبوو کە بەو جۆرە مردبێ.. یەکێك ئەوەندە گەرۆك و خانە بێزار و شاران گەڕ بێ، خۆی بداتە دەست ئەو و ئەم و حەزی لە سمساری بێ و ببێتە بنێشتە شینەی بەر ددانی خەڵك، جگە لەوەش، چاوی بەڕایی بە حوکمڕانی کوردان نەیێ، بەو رۆژە دەگات کە کەس بە مردنەکەشی نەزانێ..

ئەگەر لەبەر جوان خان نەبووایە، لەوانە بوو بایەخێکی ئەو تۆی بە مردنەکەی نەدایە...

لەو کاتەدا کە بارام لەبەر دەرگادا چۆنیەتی مردنەکەی حاجی لە مارف ئەفەندی دەپرسی، دی مەلا جەوهەر و ژنەکەی بە هەڵەداوان بە دوی کامەرانی کوڕی کەوتوون و بەرەو ماڵی ئەوان دێن، بە بە هانەی ئەوەوە کە هەندێ قسەی لەگەڵ مەلا جەوهەر دا هەیە، مارفی رەوانە کرد و خۆی دوا خست بەر لەوەی مەلا جەوهەر و خێزانەکەی بگەنە لای، ئەو بیری لە جوان



خان دەکردەوە، وای بۆ دەچوو کە ئێستا جوان بە مردنی حاجی خەیاڵی بەرەو دوا دەگەڕێتەوە و سەر لە نوێ بناغە بۆ ژیانی دادەنێتەوە..

ژنەکەی مەلا جەوهەر یەکسەر هاتە ناو حەوشە، کە چاوی بە بارام کەوت، هاواری کرد وتی:

- بە قوربانت بم کاك بارام، ئەوەی کامەران وتی راستە؟..

- بەڵێ راستە و من خۆم دیوم و، وتی:"بە ماڵی خۆمان بڵێ خەم نەخۆن من ماوم".

بارام کە وای وت، ژنە پەلاماری دا دەستەکانی ماچ بکات، بەڵام بارام نەیهێشت و وتی:

- منیش وەك تۆ: بە دیتنی کاروان گەشکەم کرد..

ژنەکە لە خۆشیدا باوەشی بە شلێردا کرد و بەبێ هەستانە دەیوت:"شلێر گیان کاروان ماوە.. هەروەها هەردوو لای پەریخانی ماچ کرد و وتی:

- بە قوربانی هەمووتانم، کاروان نۆکەری ئێوەیە.. هەر مابێ رۆژێك دەبێ بێتەوە، ئەو کات دەیکەم بە نۆکەری ئەم ماڵە..

مەلا جەوهەر لەبەر پەرۆشی ژنەکەی و هەناو سووتاوی بە کاوە خۆ لە بارامی پرسی:

- کاك بارام لە کوێ دیت؟

- لە پۆلیسخانەکەی خانەقا.. هەر ئێستا بڕۆن..

هێشتا وتەکەی لە دەمیدا بە تەواوی نەترازا بوو، مەلا ژن هاواری کرد:

- مەلا با بڕۆین..

بارام لە سەر زاری بوو بڵێ: کە چوون بچنە لای "عەلی خەڵەف" ئەفسەری لێ پرسراوی پۆلیسخانەکە، بەڵام باشی کرد نەی وت.. چونکە ناو هێنانی ئەو کابرایە سبەی رۆژ لە لای مەلا جەوهەر نیشانەی پرسیارێکی تەڵخی بۆ دروست دەکرد.. حەزیشی نەبوو لە پاش ئەوان تەلەفوونی بۆ بکات، نەوەك پێیان بڵێ..

لە هەمان کاتیشدا، لەوە خۆی دەپاراست نەبادا لەگەڵیدا پەیوەندی و ناسیاوی لە نێوانیان دا دروست ببێ و وا بداتە قەڵەم کە ئەو مامەڵەی رۆژگاری لەتەکدا دەکات "ئەمڕۆ تۆیت و سبەی منم" چونکە بارام هەموو کاتێکی بە رۆژی خۆی دەزانی، گوێی لەوە نەبوو، ئەمڕۆ لە پاش کەنوان خراوە... ئەو لەو باوەڕەدا بوو، گیانی راستی و کوردایەتی هەرگیز نامرن و هەر لە سەرکەوتنندان..

مەلا جەوهەر و ژنەکەی، بەبێ پرس لە دەرگای پۆلیسخانەکە چوونە ژوورەوە...

پۆلیسێکی بوودەڵەی تەمەن رابردوو لە دەرەوەی پۆلیسخانەکە خەریکی دەستنوێژ گرتن بوو کە زانی ئەو دووانە چوونە ژوورەوە، دەستی لە دەستنوێژەکەی لە نیوەدا هەڵگرت و سدارەکەی لەو لاوە دانابوو، لە بیری چوو لە سەری بکات، بە هەڵە داوان بە دوایاندا چوو، هاواری لیٚ کردن:

– کەس لەویٚ نییە.. چوونە ژوورەوە قەدەغەیە...

مەلا ژن لە ناو حەوشەی پۆلیسخانەکەدا، بە سۆزێکی دایکانەوە دەیوت:

– کوا کاروان؟ لە کام هۆدەیە؟

کابرای پۆلیس، دەیویست هەم خۆی بەشتیٚ بزانیٚ و هەم دەیویست بەشداری خەمیان بکات.. بۆیە دەیوت:

– کەس لێرە نییە، ئەی من لەبەر دەرگا نەبووم، چۆن وا خەڵك بە گۆترە دێتە ژوورەوە... فەرموو تەماشا کەن لە دوێنێوە جگە لە من کەس لێرە نەماوە... حەزیش دەکەن تەماشای ژووری حەپسکردنەکە بکەن..

مەلا ژن لە بەین شیشە ئاسنینەکانی ژوورەکەوە دەیڕوانییە تاریکاییەکەی و بە سۆز، بانگی دەکرد دەیوت:

– هۆ کاروان!.. من دایکتم.. هاتووم بۆ لات...

ژووری حەپسخانەکە لە تاریکی و رەش داگەڕاویدا دەنگ و بانگ کردنەکەی مەلا ژنی وەك ئەشکەوت دەدایەوە...

مەلا جەوهەر، چەند بۆ کاروانی کوڕی کە بیٚ سەر و شوێن دیار نەبوو چۆکی شکا بوو ئەوەندەش بۆ ئەو دایکە جگەر بڕاوەی خەم وشکی کردبووە و دەمارەکانی لەشی شین هەڵگەڕابوون... بە قوڕگی پڕ بە گریانەوە رووی کردە پۆلیسەکە و وتی:

– هەر ئەمڕۆ وتیان لێرە حەپسە...

ئەوەی وتی ئەمڕۆ راست ناکات.. چونکە من لە بەیانییەوە لێرە ئێشکم گرتووە، کەسم نەدیووە لێرە بیٚ، بۆ ئەوەی بە درۆدا نەچم بەیانی زوو ئۆتۆمبێلێکی حەپس هەڵگر، هات و ئەوەی هەبوو خستیانە ناوی، نەمزانی حەپس بوون یان نا..

گوێم لە غەڵبە غەڵبی دەبوو... لەو کاتەدا من خەریکی نوێژی بەیانیان بووم دەنا دەمزانی!..



مەلا جەوهەر لە دڵەوە دەیوت:" خوا لێت قبول نەکات بۆ نوێژیٚ کردت، ئەگەر بتزانیایە ئەوانە کیٚ بوون، ئێستا ناوی کوڕەکەی منت بزانیایە من نوێژی یەك مانگی خۆم پێشکەش دەکردی... دەك راست نەبیتەوە بۆ خۆت و بۆ نوێژت... تۆ خوا ئێستا مژدەی دیتنی کاروانت بە من بدایە لەلای خوا لەو قوون قۆل کردنەوەت چاکتر نەبوو!...

کابرای پۆلیس ئاگای لە دڵی مەلا جەوهەر نەبوو، بەڵام بەهاوارکردنی ژنەکەی گەلی غەمبار بوو، ژنەکەی خۆی دەهاتەوە یادی کە ئەوە دە ساڵ دەبیٚ کوڕە گەورەکەی لە شەڕی عێراق و ئێراندا بیٚ سەر و شوێنە و پێنج فەرزە بۆی دەگری و هەموو شەویٚ خەونی پێوە دەبینیٚ.. وەك کەسانێك لە تاوەی ئەو جۆرە ئەزموونانەدا توابێتەوە، دڵیانی دەدایەوە و خاتر جەمی دەکردن کە کوڕیان ماوە و هیچی بە سەر نەهاتووە و دەیوت:

– هیچ خۆتان سەخڵەت مەکەن ئەگەر دوێنیٚ لێرە بووبن ئەوە بۆ بەندیخانەی مەحەتە یان شوێنێکی تر رەوانە کراون..

خەم مەخۆن ماوە، هیچی بە سەر نەهاتووە.. هەر ئێستا رامەوەستن سەری بەندیخانەی مەحەتە بدەن...

مەلا جەوهەر و ژنەکەی بە درێژایی ریٚ بڕینیان بەرەو گرتووخانەی مەحەتە، چەند جار دەیانوت و دەیانووتەوە: بارام لە دوێنێوە زانیویەتی کە کاروان لەویٚ حەپسە ئەی زوو بۆ ئەو هەواڵەی پیٚ رانەگەیاندین!؟.. هەی نامەردت نەکەن بارام، چۆن زوو ئەو هەواڵەت نەگەیاند؟!...

***

## (16)

بارام سەری ببوو بە ئاش و بەری ببوو بە پلاش، بەراستی کارزان بوو وا شارەزای کارەکەی بوو بەر لەوەی دەستی بۆ ببات دەیزانی چەندی زەرەرە و چەندی قازانجە وەك جاران ئەو کاتە فراوانەی بۆ نەما بووەوە تا بە ئاسپایی و لەسەرخۆ دانیشێ و وانەکان بە زریان بلێتەوە، هەر چەند سەر قالییەکەی حەزاو بەدەر بوو لەگەڵ ئەوەشدا پەکی دەرسەکانی ئەوی نە دابوو، لە یەکەم رۆژدا چۆن بە دڵسۆزییەوە وانەکانی بۆ راڤە دەکرد هەر وا مابووەوە، لەو کاتەدا هەموو سەر قالییەکانی خۆی وەلا دەدان، وەك مەلای گوندێکی کات فراوان کە لەگەڵیدا دادەنیشت نەیهێشت هەست بەو سەر قالیەی بکات، چونکە بارام ئەوەی لەبەر چاو بوو بە هۆی زریان و بزر بوونی بەرمیلەکەیەوە ئەو دەرەی بۆ کرایەوە.. هەر رۆژێ بۆ دەرەوەی شار بە دوای کاردا بچوایە تا بەرێك و پێکی لەوە دڵنیا نەبووایە کە زریان لە دەرسەکانی حاڵی بووە نەدەرۆیشت، زریانیش منداڵێکی گوێ رایەڵ و قوتابیەکی زیرەك بوو، بە قەد باوکی بارامی مامۆستای خۆش دەویست، ئەو پەیوەندییە پیرۆزەی کە دەبوو لە نێوان مامۆستا و قوتابی دا هەبێ رۆژ دوای رۆژ لە نێوان ئەو دووانەدا پتەو تر دەبوو، بارام لەسەر ئەو بڕوایە بوو وەختێ فێرکردن کارێگەر دەبێ کە مامۆستا و قوتابی جێ گۆڕکێ بە شوێن خۆیان نەکەن، پەردە لە نێوانیان دا نەدرێ...

بارام تاکە شت کە لەسەری نەترازابێ ئەو پەیوەندییە بو کە لەیەکەم رۆژەوە لەگەڵ زریاندا دایمەزراند بوو، دەنا کار و کاسبی ئەو بارامەی جاران کە رۆژی چەند جار بە خۆیدا دەچووەوە و ورد و درشتێکی کۆمەڵی دەچۆراندەوە ناو بارە قورسەکانی سەر شانی ئەو بارامە نەمابوو گومان بخاتە سەر هەموو شتە نەنگە ورد و درشتەکانی ناو کۆمەڵ بە ختووکە دان گەورە و زەوار بکات، لەبەر ماندووبوونی پاش کار کردن لەمە چووە ناو نوێنی خەو یەکسەر خەو دەیبیاتەوە...



جاران بە کوت زنجیرەکانی ناو کۆمەڵ دەمار گیر دەبوو، وا ئێستا هێور بووەتەوە و ئارەزووە تینووەکانی رووخاندنی دیواری بەندو باوەکانی ناو کۆمەڵی وەك جاران نای هروژێنن، ئارەزووی هروژاندنیشیان ناکات!، بەڵام جاروبار لە خۆی دەپرسی کە ئایا ئێستای راست رەوییە یان ئەو سای؟ بە گوتەیەکی تر ئایا جارانی راست بوو یان ئێستای؟ دیارە راستییەکان بە پێی حاڵی مرۆڤن؟..

خۆی دەیزانی ئەو وردە پرسیارانە چەواشە کردنی راستییەکان بوون لە زەمینەی تێر بوون و دەست رۆیشتندا چەکەرە دەکێشن...

هەوڵیشی دەدا ئەو جۆرە ختوورانە لە مێشکی دا مێروولە نەکەن نەك لە ناخەوە کرمۆڵی بکەن...

ئەو بیرانەی جاران لە پای راستی دا گەشەی پێ دەدان و لەبەر تیشکی هۆشیدا سفت و سۆی پێ دەکردن وا ئێستا لە کاتی خۆ شوشتن و دەست بە ئاو گەیاندن دا نەبووایە بە خەیاڵیدا نەدەهاتن.. بە دڵسۆزانە ئەو کارانە کە پێی رادەسپێردران ئەنجامی دەدان و دەیکردنە پارە و لە مشتی سەرداری خانە خوێی دەنان، بە رێك و پێکی و بێ پێچ و پەنا بە ژمارە و نوسین ئەوەی هاوردە و دەرکردە بوو، ئەوەی مایە و سەرمایە و قازانج هەبوو دەینووسین و دیپژاندنە ناو قاسەی سەردارەوە...

بەر لەوەی تێکەڵاو بە کاروبارەکانی سەردار ببێ بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ و هەست پێ نەکراو لە رێگەی زریانەوە هەندێ بارەی ژیان و بیر و بۆ چوون و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانییەوە شتێکی زانیبوو، نەك بە پرسین بەڵکو هەروەها بە گۆترە و رێکەوت، ئەو شتانەی کە دەیزانی بەلایەوە گرنگ نەبوون، مەبەستیش نەبوو بیانزانێ، ئەو بە شوێن کارێکدا دەگەڕا لە پەنایدا نانێکی بێ منەت بخوا وا هاتووتە دەستی، بەڵام مرۆڤ بە سروشت حەزی لە پەردە لادانەوەی شتی نەزانراوە، هەمیشە مەگێزە تینووەکانی ناو دەروون بە هەڵ هێنانی شتی شاراوەدا تەسەل دەبن.

بارام چەند کارەکانی بە پۆختی و راستی ئەنجام دەدان، سەرداریش بە بێ ئەژمار پارەی بە سەردا دەباران، مانگ دوای مانگ کرێکەی بۆ زیاد دەکرد، ئەو پارەیە دەهاتە دەستی دەجار لە خەرجی منداڵەکانی خۆی و منداڵەکانی خونچە زیاتر بوو، هەر دوو خێزانەکە، رزق و رۆزیان وەك باران بە سەردا دەباری، پەریخانی ژنی زیاتر ئافرەتێکی کارامە و کەیبانوویەکی راستەقینە بوو ترازووی نگابانی هەر دوو خێزانەکەی وەك یەك راگرتبوو، لە رۆژی هەینی و

بۆنە تایبەتییەکاندا بەیەکەوە نانیان دەخوارد و بەیەکەوە سەیرانیان دەکرد، لەبەر ئەوە بارام هەستی بە بەختیاری دەکرد و خەمی نەمابوو، ئەوەی کە ببووە تاکە خەمی ناو ئەو خۆشییەی نەخۆشییەکەی پەریخان بوو، تووشی دەڵبی و نەخۆشی(سوان) ببوو... بارام پیشانی گەلێ پزیشکی پسپۆڕی دابوو، بەبێ رادە پارەی لە پێناو چاك بوونەوەیدا خەرج دەکرد، حەزی دەکرد ئەو پەریخانەی کە لەگەڵیدا رۆژگارێکی زۆری ژیانی نەبوونی بەسەر برد بوو، بچێتەوە تیلمەی جاران و تۆفی جاحێلی، بۆ ئەوەی چێژ لەو هەبوونییەی وەربگرێ..

پەریخانیش لەبەرخۆیەوە دەترسا و خەمی ئەوەی لێ نیشتبوو بارام پتر دەوڵەمەند ببێ و ژنی بەسەردا بێنێ، هەستیشی بەوە کردبوو کە جوانی حاجی سەلیم کڕەی بۆ دەکات و بارامیش مەیلی بۆی هەبوو، هەمیشە لەدڵەوە گلەیی لە بەختی خۆی و مردنی خونچەی خوشکی دەکرد و دەیوت:

– مردنی خونچە منی تووشی خەمی واکرد کەوام لێ بێ، خوا عەفووی کات ئەو ژیانی منیشی لەگەڵ خۆیدا بردە ژێر گڵ... پەریخان لەو هەست کردنەیدا بە هەڵە نەچوو بوو، چونکە دوور کەوتنەوەی ژن لە مێردەکەی دەرفەت دانە بە دەربازبوونی پیاو، کە هەرگیز نایانەوێ لە ناو یەك دەفری قەتیس ماودا بمێننەوە... پەریخان سەری دەفرەکە بوو وا ئەمڕۆ واز بووە، بارامیش پیاوێکی هەڵپەرست و هەڵپەکار نەبوو، دەنا ئەو هەلە بۆ ئەو هاتبوو بۆ هەر کەسێکی تر بهاتایە، ماوەیەك بوو خۆی لە کەوڵە کۆنەکەی هێنابووە دەرێ...

لەو رۆژەوە بارام لای سەردار دامەزرا گیروگرفتەکانی سەردار کپ دەبوونەوە، سامانەکەی بەرە و گەشە و سەقامگیر بوون دەچوو، جاران سەرە داوەکانی لێ ئاڵۆز دەبوون کەچی بە هاتنی ئەو هەموویان رکێف گیری ناو دەستی بوون، وامتمانەی بە بارام کردبوو کە دەچووە دەرەوەی وڵات هەموو کاروبارێکی بەو رادەسپارد..

لە ماڵی سەردار گەلێ جار باسی سەلاری و پیاوەتی بارام دەهاتە پێشەوە، دایکی زریان و پووری لەعلی، دوو بە دوو دیبویان، بەڵام بە وان چی کە نایەوێت وەك ئەوانەی کە کاری بۆیان دەکرد تێکەڵاو ببێ، دایکی زریان حەزی لەو جۆرە پیاوانە نەدەکرد وا راستگۆ و نە چەماوە و منەکی بن، حەزی لە یەکێك دەکرد کە بە ئارەزووی خۆی هەڵێ سووڕینێ لەسەر یەك خوان خواردنیان لەگەڵدا بخوات و ئێواران بە ئۆتۆمبێل بیانگەڕێنێ و دەستە مۆیان بێ و خۆی بە مەحرەم بزانێ...



خەمی ئەوەی بوو ببێ بە دیوارێك بازدان بە سەریدا ستەم بێ، لەبەر زریانی کوڕی نەبووایە لە زووەوە بە دەرکردنی دابوو، خەمی لێ نیشتبوو نەی دەزانی چۆنی بمووچێنێ و بیخاتە ژێر رکێفییەوە... وای بە باش زانی لە رۆژێکدا کە سەردار بە سەفەر بۆ دەرەوە دەچوو لەعەلی و شوفێرەکەیان بە هەنجەتی دۆزینەوەی ماڵە خزمێکی ئاوەرەیان بیهێننە ماڵەوە و هەڵی سەنگێنن...

بارام لە کۆشەکەدا خەریکی دەرس وتنەوەی زریان بوو پیکابێکی دوو قەمەرەی نوێ هاتە ژوورەوە و هۆڕینی بۆ زریان و بارام لێ دا، زریان دوای روخسەت خواستن بە دەمیەوە چوو، بارامیش لەسەر خۆ چووە دەرەوە، دی ئەو ئافرەتەی کە ماوەیەکە لە دڵەوە بۆی دەگری و کردوویەتی بە نموونەی خەیاڵاوی هەموو ئافرەتێکی جوان، لە تەنیشت شوفێرەکە سوار بووە و، سەرنجی ئاراستەی دەرگای کۆشەکە کردووە، لەمە چاوی بە بارام کەوت مۆچرکێك لە بن پێیەوە کسپەی داو ئاگری بەر دایە ناو سنگی و لە ناو نیگایدا شەوقی دایەوە... نەی دەزانی کێیە! بەڵام وێنای دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیوت:

– خوایا من ئەم پیاوەم دیووە! بەڵام نازانم لە کوێ!؟...

بارام لەمە دی و ناسییەوە، بەڵام سەری سووڕما بوو لەوەی کە ئایا چ پێوەندییەکی لەگەڵ ماڵی باوکی زریاندا هەیە...

بارام لەو رۆژەوە برمیلەکەی بۆ بەنزینخانە کە برد بوو، لەو رۆژەوە لە ناو پاسەکەدا پێوەی نووسا بوو دڵی وەك بەندۆڵی سەعات بۆی لێدەدا و شل و نەرمی ئەو بەژنە نەرمەی چێژێکی ئاسمانی بە هەموو گیانی بەخشی بوو، ئەو گەرمییەی بە لەشی ئەوی دابوو پێی وابوو تا ماوە سارد نابێتەوە، هەموو جار بە خەیاڵ خۆی دەبردەوە ناو پاسەکە و لە ناو ترسە لەرزۆکەکەدا لەبەردەم خۆیدا رای دەگرت و لەلای بەنزینخانەکەشدا کە دوا چاو پێکەوتنی بوو تارمییەکەی بە هەزار رەنگە دەرازاندەوە، ئاواتی ئەوە بوو رۆژێك لە رۆژان لە دوورەوە چاوی پێ بکەوێتەوە، کەچی ئەوەتا ئەو بووکی رازاوەی خەیاڵەی هاتووەتە بەرامبەری و وەك مانگی تابان لە ناو ئەو پیکابەدا خەرمانەی داوە، لەمە دی حەپەساو چی خوێن لە لەشیدا هەبوو دڵی رەوانەی دیمەنی دەرەوەی کرد، نەیزانی چی بڵێ و چۆن لە بەردەمیدا راوەستێ...

بەڵێ ئەوەتانێ هاتووە کە لەگەڵیدا بڕوا ماڵی ناسیاوێکیان لە تەنیشت مزگەوتی پیرەژن لە گەڕەکی ئەفسەران پیشانیان بدات، پیاو لەو جۆرە هەڵوێستانەدا تووشی جۆرە دەبەنگییەك دەبێ، بارام زوو قەڵەم و پارچە قاقەزێکی لە بەرکی دەرهێنا و نەخشەی شەقام و شوێنی

مزگەوتەکەی لەسەر کرد و دایە شوفێرەکە، ئافرەتەکەش وەك کەڕولاڵێکی تاساوی لێ هاتبوو داوای لێ نەکرد لەگەڵیدا بڕوات... ڕەنگە پاڵنەرێکی ناوەکیش دەستی لەو داوا نەکردنەدا هەبوو بێ، ئەویش ئەوە بوو، بارام بۆ خۆ گلدانەوە بوو، نەك خستنە ناو داوای دایکی زریانەوە، بۆیە لەسەر خۆ بە شوفێرکەی وت:

- با بڕۆین...

ئەوان ڕۆیشتن و بارام چەموولەی پەشیمانی ئەو هەڵوێستەی ئاراستەی نەزانی خۆی دەکرد... وەك داری وشك لە شوێن خۆیدا ڕەپ ڕاوەستا.. ئافرەتەکەش بە خۆی و شوفێرەوە وەك جەنگاوەرێکی شکاوی ناو گۆرەپانی شەڕ بەرەو یاگەکەی خۆی تێی تەقان، دایکی زریانی وا تێگەیان کە ئەو پیاوە یەکسەر پەی بە نیازەکەی بردووە و پیلانەکەیان لێ بەتاڵ کردووەتەوە، ئەو وەك ئەم تامەزرۆی پیاو نەبوو بۆیە وای تێگەیاند کە: لەوێ نەبوو...

ئەویش بە تووڕەیی وتی:

- لەوێ نەبوو؟!.. باشە با لەوێ نەبێ..

ئیتر بیری لەوە نەکردووە، ئەو بە هۆی زریانی کوڕییەوە ڕۆژانە لە هەڵسوکەوتەکانی ئاگادارە...

بارام بە هۆی زریانەوە زانی ئەو ئافرەتە ناوی (لەعلی)یە و خوشکی باوکییەتی، واتە پووریەتی، بێوەژنە و ژنی کادیرێکی شۆڕشگێڕ بووە، لە سەرەتای بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردا بەشداری کردووە، لە پەنای خەبات کردندا دەسکەوتی هەبووە و توانیویەتی ئەو دەسکەوتە بخاتە کار و دەوڵەمەندی بکات، بەشدار بوونی لە پەلامارێکی پاڵەوانانەی پێشمەرگەدا شەهید کراوە.

سامانەکەی بۆ لەعلی بەجێ ماوە و ئەویش داویەتە دەست سەرداری برای ئەویش بە هۆی ئەو سامانەوە دەستی لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا تێکەڵاو کردووە و ئێستا وای لێ هاتووە، سامانەکەی نایەتە ئەژمار... بەڵام سامانەکەی پانتایی هەموو هۆش و بیری زەوت کرد بوو، بۆ کۆڕ خۆش کردن و موجامەلە نەبووایە، باسی کوردایەتی نەدەکرد، چونکە لەوەختی خۆیدا لەو بوارەدا وا ڕاهاتبوو کە باسی کوردایەتی بە مجامەلە و دوور لە مەترسی دەکرد گەرماییەکی وای بە وتەکانی دەدا لە ڕاستییەوە نزیکی دەکردنەوە.

***



دوای مردنی حاجی سەلیم دەرگای سەربەستی لەبەردەم جواندا بە تەواوی واز بوو، براو خوشکەکانی حاجی مێردی دەیانویست گەلە کۆمەی لێ بکەن، ئەو سامانەی کە حاجی لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو لە بن دەستی دەری بێنن، بەڵام چونکە نیازیان پاك نەبوو، هەر کەس لەبەر خۆیەوە بەڕەکەی ڕادەکێشا، پێك نەهاتن، ئەوەشیان دەزانی جوان لەو ئافرەتانە نییە بە سەریا گوزەر بکرێ، ئەویش لە زووەوە دەستی خۆی وەشاند بوو، بەرەڵلایەکەی حاجی باجەکەی ئەوە بوو کە ئەوەی هەیبوو لە خانووبەرە و سامانی سووك و گران هەمووی لەسەر جوان و دوو منداڵەکەی تاپۆ کرد بوو... ئەوان لە گوێی گادا خەوتبوون لەو سەین و بەینەدا ئاگادار نەبوون...

برا گەورەکەی حاجی کە ناوی سەلام بوو ماڵ و منداڵێکی زۆر و ژنێکی تا بڵێی دەم هەراش و ناچیزە و بێ فەڕی هەبوو، لە خێزانێکی ناودار و دەست ڕۆیشتەی جارانی شار بوو، لەبەر ئەوەی نەیدەوێرا داوای جوان بکات، لەو ڕۆژەوە حاجی برای مرد بوو دڵی وەك تووتڵە سەك بۆی دەی قوڕان، ئەگەر وێرای داوا کردنی جوانی ببووایە و شوی پێ بکردایە، دەچووە سەر گەرمە سێرەی حاجی برای، جوانیش لەو ڕۆژەوە شووی بە حاجی کرد بوو هامشوی ماڵیانی نەدەکرد، یەکجار نەبێ، ئەوە بوو کوڕە گەورەکەی لە شەڕی قادسیەی عێراقدا لەبەرەی جەنگ تۆپی بەرکەوتبوو، پارچەکانیان لە سندوقێکدا بۆ هێنابووەوە، ئەویش لەبەرتانەی خەڵك بۆ پرسە چووبووە ماڵیان...

سەلیم چی دەیدایە بەر خەیاڵ یارای ئەوەی تیا نەبوو، دەرێکی وای نەدەدۆزییەوە بتوانێ پەڕکێشی تیا بکات و نیازەکەی خۆی لای جوان بدرکێنێ...

سەختی گرفتەکەی لەوا بوو: ئەگەر لە ماڵەوە بەو نیازەی بزانن خۆی بە گورگان خواردوو دەدا و لەوانەش بوو ئیبای لێ بکەن، هەر چەندی هێنا و بردی نەیتوانی خۆی بخاتە سەر ئەو دارە شکاوە لەبەر ئەوە وای بە باش زانی فێڵ لە خۆی نەکات، کڵاوی خۆی بەدەم باوە نەدا... ئەوەشی دەزانی کە دەیان کەسی گەنج و جەحێل لە تەمەنی کوڕی ئەودا خۆڵی ژێر پێڵاوەکانی جوان دەلێسنەوە کە شوویان پێ بکات، خەڵك چی دەوێ؟ سامان، ژنی جوان و سەلار، تەلار، ئەو شتانە هەموویان لە ئاسانەی جوان دا هەبوون... وەختی خۆیشی بۆیە شووی بە حاجی سەلیم کرد بوو، دەستکورتی و نەبوونی باوکی و زۆرە ملی ئەویان بەو دەردە برد بوو وا ئێستا لەو تەوقە ڕزگار بووە، هیچ بە عەقڵدا نەدەچوو، جوان جارێکی تر خۆی بخاتەوە ناو ئەو زەلکاوە...

سەلام لەترسی ژنەکەی بە دەگمەن هامشووی حاجی برای دەکرد پاش مردنی بە ناوی سەردانی منداڵەکانی برایەوە، بە دزی ژنەکەیەوە جاروبار سەری ماڵی جوانی دەدا... قسەی بە توێکڵی ئامادە دەکردن و لە پەنای چاوپێکەتنەکانیدا دەیوەشاندن پێی وا بوو جوان درەنگ پەی بە مەبەستەکانی دەبا!... لەبەر گێلی خۆی نەیدەزانی جوان نەك پەی بەوتە تفتەکانی دەباو دەزانی لەبن زمانیا چی هەیە، بەڵکو پەی بەوتە بێدەنگەکانی ناو داڵغەکانی مێشکیشی دەبا... ئەو لەبەر خۆیەوە وای دەزانی چوونەکانی بۆ ماڵی جوان بەوە دەدرێنە قەڵەم کە ئەو باوانی منداڵەکانە و حەز ناکات لانەواز بن، یان وای دەزانی جوان ئەو بە پشت و پەنای خۆی دەزانێ و لە پەنای ئەودا دەتوانێ ئەو سامانەی کە هەیەتی کەس چاوی لێ نابێ و ناچێتە ناو گیرفانی غەوارەوە!..

– خەڵك نابێ دەرگای خۆی بە حەوشەی خەڵکەوە بنێ... پاروێك تا دەکەوێتە بەر پێت بکەوێتە کۆشت...

ئەو جۆرە وتانەی بە ترسەوە دەدرکان...

جوان خان لەو سەری مەبەستەکانیەوە دەهاتەوە، بەڵام خۆی لێیان گێل دەکرد، وای پیشان دەدا، ئارەزووی ئەوەی نییە، لەو مەبەستە دزێوانەی ناو پلارەکانی بگات! دای نابوو جارێ دەنگ نەکات و لەغاوی بۆ شل بکات، بۆ ئەوەی بە راشکاوی مەبەستەکانی بدرکێنێ، تا بزانێ لە کوێدا و تا چ رادەیەك نیازە گلاوەکانی پەنگ دەخۆنەوە لەوێدا نەقیزەیەك بەو دەبدەبە بە فووکراوەیدا بکات و بە یەکجاری پووچەڵی بکاتەوە...

سەلام هەستی کرد بوو کە جوان گەلێ لە سەرەوە تەماشای دەکات، خۆ ئەگەر مامی منداڵەکانی نەبووایە وەك مشکی تۆپیو گسکی دەدا و تۆوڕی دەدایە ناو زبڵدانەکەی گەڕەکەوە... هەر ئەو دەمەش تەلەفوون بۆ ژنە دەم هارەکەی دەکات و لەوێش دیکەنە پەڕۆ... بۆیە فیکری هاتە سەر ئەوە هەوڵ بدا بۆ (سوارە قەمبوور)ی برای داخوازی بکات، زەرەر لە نیوەیدا بگەڕێتەوە، هەم سامانەکە بۆ خۆیان دەمێنێتەوە، هەم جوانیان لێ دوور ناکەوێتەوە.

– تۆ خوا حەیف نییە ئافرەتی وای سەلار لە جیاتی برای خۆمان یەکێکی تری لاوەکی بێتە سەری!...

سوارە قەمبوور، سەرەڕای ئەوەش کە قەمبوور بوو، دیمەنی پڕبوو لە شوێنەواری ئاوەڵە و قەپۆزێکی کەرانە و لچ و لێوێکی مەیموونانەی هەبوو، چەند بڵێی چەتوون و خۆ بەزل زان و قسە ترن بوو، بەڵام ئەوەی زۆر تێکەڵاوی بووایە بۆی دەردەکەوت لە ناخەوە وا نەبوو کە خەڵك



وایان دەزانی دەرەوەی نموونەی ناویەتی.. لە شاردا کەس ژنی نەدەدایە، ئەویش وای دانا بوو ئەگەر قۆندەرەشی ماچ نەکەن ژن لە کەس نەخوازێ...

تا بڵێی پینەچییەکی کارامە بوو، ئەوەی پەیدای دەکرد لە قومار کردن و بێ رەفتاری و دوو دەکی دا خەرجی دەکرد، خەڵکی بۆ قسەی خۆش و رابواردن دەچوونە دوکانەکەی و سەریان لە سەری دەنا، پرسیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و خورافیان لێ دەکرد، ئەویش بەبێ فیکر کردنەوە وەرامی وەهای دەدانەوە کە سەر بە قوڕی دەهێنانە پێکەنین و هەلەکە سەما.

سەلام، سوارەی برای دڵنیا کرد بوو لەوەی ئەگەر داخوازی (جوان)ی بۆ بکات رازی دەبێ و بەو جۆرەش ئەو دەچێتە سەر ماڵ و سامانی حازر و دەبێتە مامی راستەقینەی منداڵەکانی کاکی و دەچێتە کۆشی جوان خانەوە و دەبێ بە هاوسەری...

سوارە تۆزێ خۆی بە ویقار کرد بوو، دەستی جلی جوانی لەبەر دەکرد و دەچوو دوکان و دەستی بە سمێڵی خۆیدا دەهێنا و لاقی لەسەر لاق دادەنا و ئیشی نەدەکرد، خەیاڵی کەوتبووە سەر ژن هێنان و چوونە سەر سامان...

بەڵام کە بیری لە خۆی و جوانی براژنی و کاکی دەکردەوە بێزی لە خۆی و ئەو کارە دەبووەوە...

– براژنم وەك دایکم وا بووە، زۆر جار کە دەچوومە ماڵی کاکم بە رووێکی خۆش و دڵێکی فراوانەوە پێشوازییەکی وای دەکردم دایك وا پێشوازی رۆڵەی خۆی ناکات..

رۆژێك نەم دی رووی لێم گرژبکات... ئێستا وای لێ بێ لە جیاتی کاکی و لەسەر نوێنی ئەو لە گەلیدا بخەوم! ئەی کە منداڵەکانی گەورەبوون و هزریان کرایەوە. تۆ بڵێی بە چ چاوێ تەماشام بکەن؟

وەك مامێك کە جگە لە پەیوەندی پاك و پاکیزە شتێکی تر لە نێواندا نییە؟ یان بەو نێرە زەلامە تەماشام دەکەن کە ناموسی باوکیان دەشێلێ و لەسەر ئاخوڕی گەرمیان وەك ولاغێکی دابەستە دەخواو و دەکا؟!..

ئەو بیرانە و چەندانی تری دەکردنە واقیع و دەیهێنانە بەر چاوی خۆی... لە پڕ راپەڕی و هاواری کرد...

– نا..نا.. شتی وا قبوڵ ناکەم

سەلام تەنیا پرسە خەسوانەیەکی بە سوارە کرد بوو، ئەویش سەرەتا بیری لەو کارە نەکردبووەوە، بۆیە هیچ کاردانەوەیەکی وەهای نەنواند بوو... کەچی سەلام لە بارەی خۆیەوە

بڕیاری دابوو بۆ ئەو مەبەستە بچێتە لای جوان... هەندێ دیاری لەگەڵ خۆیدا بردوو، ئایەتەلکورسییەکی بە دەور خۆیدا خویند و رووی کردە ماڵیان...

پاش لەوچە لەوچێکی بێ سەر و بن شێرێ لەوێ و ڕێوییە لێرە، مەبەستەکەی بۆ جوان درکاند و وتی:

- جوان خان؟.. حەز ناکەم ئەم منداڵانە بێ ناز بن!....

ئێ!... مەبەستت چییە؟!..

- مەبەستم ئەوەیە.. ماڵی بێ پیاویان نەوتووە.. خوا نەیبڕێ تۆش هێشتا لە تافی لاویدای... منداڵەکانیش وردن...

حەز ناکەم هەروا بە دیاریانەوە بەو جۆرە قەتیس رابمێنی!...

- ئێ!!.. جا... مەبەستت چییە؟..

هیچ شتێکی وا نییە.. من بۆ تۆمە!...

- مەبەستت ئەوەیە.. شو بکەم؟!...

- ؟..

- سوپاست دەکەم... لەکەیەوە وا دڵسۆزی... هەر کات ویستم شوو بکەم، هەڵبەتە پرسێکت پێ دەکەم!..

- بەڵام حەز دەکەم...

پێی نەوترا تف لە دەمیا وشك بوو...

جوان ویستی مەبەستەکەی لە گەروی وشکی دا دەربێنێ و زوو وتەکەی لەگەڵ وتە تاساوەکەی ناو قوڕگیدا بەیەکەوە بەست و وتی:

- حەز دەکەی چی؟!..

- لە خۆمان جیا نەبێتەوە...

جوان گەشایەوە بۆ ئەوەی هەڵی بنێ قسەکەی تەواو بکات:

- ئەی ئەوە نییە دوو منداڵم لێتان هەیە... ئیتر چۆن لە ئێوە جیا دەبمەوە...

- جوان!.. حەز دەکەم سوارەی برام بکەی بە مامی راستەقینەی منداڵەکان...

جوان سوور هەڵگەڕا و نەخشی چاوە کەژاڵەکانی تێك ئالان...

- سوارە!؟...

سەلام وەك گوناحبارێکی تۆمەتبار و پێ لێنەر و ترس لێ نیشتووی بەردەم دادگا وتی:



- بەڵێ سوارە!...

جوان ئەوەندە خۆی نەشێواند لەسەر خۆ هەڵسا و ئەو شتانەی کە بە دیاری هێنا بوونی، لەبەر دەرگا لە تەنیشت پێڵاوەکانیەوە کە لەوێ دایکەناند بوون دانیان و رووی کردە سەلام:

- سەلام..! بە قەدری خۆتەوە چەندە، لە کوێوە هاتووی بە خۆت و دەستە قورسەکانتەوە، لەوێوە دەچیتە دەرەوە، تا دەگەیتە ماڵەوە لانەکەیتەوە، دەنا حەیای خۆت و ئەوە دەبەم کە بێزم نایە ناوی بەرم... نەخەڵەتابی جارێکی تر روو بەم ناوەدا بکەی...

سەلام زۆر شپرزە بوو لەوە دەترسا جوان دەست بداتە تەلەفوون و قسە لەگەڵ (مەنیج)ی ژنیدا بکات، بە پەلە پێڵاوەکانی خستنە سەر پێی.. هەر ئەوەندەی بە دەما هات و وتی:

- باشت نەکرد وا وەدەرت نام..

جوان کە دی شتەکانی بەجێ هێشتووە هەڵی گرتن... سەلام هێشتا لەبەر دەرگا تێنەپەڕی بوو، جوان بانگی کرد و..

- سەلام! وەرە..

شتەکانی فرێ دایە بەردەمی و گەڕایەوە، ئەویش چۆن هێنا بوونی وەها بە دەستیەوە گرتن و بە لۆژە لۆژ، بەبێ ئەوەی منتق بکات تا لە چاو گوم بوو نەیوێرا ئاوڕ بداتەوە...

جوان چەند ساڵ بوو لە ناو خەمی حاجی سەلیم دا ساچاند بووی، ئێستا بەو ئاسانییە، سەر لە نوێ خۆی بخاتەوە ناو داوی ئەوانەوە!... لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- جا وەرە لە داخدا قوڕی هەموو دنیا بە سەریخۆتدا مەکە...

کێ دەکات بە هاوسەرم!؟ سوارە قەمبوور...!

خوا گەردەنی باوکەکەم ئازاد نەکات کە منی بە مانە ناساند دەنا من لە کوێ و ئەو رەگەزە داوەشاوە لە کوێ...

جوان لەبەر پەرچدانەوەی رەفتارە ئابڕو بەرەکانی حاجی مێردی وا بێ دڵی خۆی نەکرد بوو، خۆیشی بە ئافرەتێکی خراپ نەدەزانی، بەڵام بۆ سزادانی ئەو کە لە پشتەوە ناموسی لەکەدار کرد بوو، ئەویش لە پێشەوە رقی خۆی پێ هەڵڕشتبوو، بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە بەولاوە چی تر نەبوو، لەو رۆژەوە ئەو مرد بوو پەیمانی دابوو بگەڕێتەوە سەر ئەو ڕێیەی کە بەر لە ناسینی حاجی لەسەری بوو، خۆ ئەگەر بیزانیایە بەو زوویە حاجی لە کۆڵ دەبێتەوە خۆی وەك بۆخچەیەکی پاك و خاوێن بۆ بارام دەهێشتەوە...

ئەو دڵەی کە جاران بۆ بارام لێی دەدا نەمردووە و وا ئێستا گەڕاوەتەوە سەر لێدانی جارانی، دڵی بەوە خۆش دەکرد، ژنەکەی بارام تووشی دەڵبی و نەخۆشی (سووان) بووە و ماڵی داری پێ ناکرێ، بارامیش وەك ئەو دەڵێی هێشتا ژنی نەهێناوە، وای بۆ دەچوو کە لەگەڵ بارامدا لە نیوەی رێدا یەك دەگرنەوە، ئەو وەك جاران نەماوە و دەستی لە کار و کاسبی گیر بووە و لەهیچی کەم نییە، بووە بە خاوەن ئۆتۆمبیل و خانووی جوان و بەرەو دەوڵەمەندی هەڵدەکشێ، بۆیە چەندان جار بە بەهانەی دیدەنی و لێپرسینەوە دەچووە ماڵیان و خۆی پیشانی دەدا...

بارام ئاگای لەوە نەبوو کە لە هەر چوار لاوە دەورە دراوە، جوان خان دەیویست برینەکانی دڵی بەو سارێژ بکاتەوە، لەعلی خان نیازی وابوو لەمەودا خۆی دامەزرێنێتەوە و ئەو بەشە سامانەی کە تێکەڵاو بە سامانە لە ئەژمار نەهاتووەکەی سەرداری برای ببوو بەو ساغی بکاتەوە و بیکاتە برا بەشی ئەو... دایکی زریانیش دەیویست بیکاتە نۆکەری ئالۆشە چلێسەکانی خۆی و لە زەوی خۆیدا گێرەی پێ بکات.. لەم لاشەوە پەریخانی ژنی تووشی ئەو نەخۆشییە بووە و پەکی لە رۆیشتن خستووە، رۆژ دوای رۆژ قەڵەویەکەی دەیدا بە زەویدا.

تاکە خەمی ئەوەیە، وەك جاران ناتوانێ مافی هاوسەری بۆ بارام دابین بکات، بارامیش بە ئاشکرا بەرەو دەوڵەمەندی دەکشا، ئەوەی پێویستی ژیان هەبوو لەبەر دەستیا ئامادە بوو، هەر چەند بارام بۆ ماڵ و منداڵی خۆی پیاوێکی کەم وێنە بوو، بەڵام دەوڵەمەندی و یارای بەدەنی ئامانیان نییە و حەق بە پیاو دەدەن خۆی تازە بکاتەوە، پەریخان ژنی بارام ئەو خەمەی کرد بووە سەرباری هەموو خەمێکی، تارامایی ئەم وتەیە کە دەڵێ:(پیاو ئامانیان بۆ نییە) بە تایبەتی لەو بارەی ئەودا، هەموو شیرینییەکی ژیانی لا تاڵ کرد بوو.. لەوەش دڵنیا بوو ئەگەر کاری وا بکات کەس گلەیی لێ ناکات...

***

بە بەهانەی ئەوەوە کە زریان پێی ناکرێ بڕواتە دوکان دەرسەکانی قورسن. دایکی زریان پلانەکەی وا دانا کە بارام بۆ شرۆڤەکاری دەرسەکانی بچێتە ماڵەوە، مەبەستی لەو پلانەدا دوو شت بوو، بەلای خۆیدا رای دەکێشا و لە نیازی دشەکەی (لەعلی) دووری دەخستەوە... ئەو رۆژەی کە دایکی زریانی دی وەك مانگی تابان شەوقی دەدایەوە، جوانییەکەی وەك جوانییەکەی (لەعلی) مات و مەند نەبوو، وەك جوانییەکەی (جوان)یش پڕ بە حیکمەت و بێ پایان نەبوو. جۆرێکی تر بوو بزووزو تیرەنداز و کوشندە بوو.



بارام لەوانە نەبوو بریقە و ورشەی ناو نیگا و خۆ نواندن کاری تێ بکات، کەچی ئەو وەك نێچیرڤانێك کە پەلە لە ئاگاوتنی شکارەکەی بکات وا خۆی بۆی دەنواند... بارام لەمە چاوی پێکەوت:

- خوایا من ئەم ئافرەتەم دیووە؟.. لە کوێ نازانم؟!..

ئەو ئافرەتانەی دڵی وێنەیانی لە ناو ئەلبۆمی یادەکانیدا هەڵی گرتبوون، وەك ئەفسەرێك چۆن سەربازەکانی بە سەر دەکاتەوە وەها هەمووی لەبیر خۆیدا ریز دەکردن و لەگەڵ دیمەنی دایکی زریاندا بەراوردی دەکردن، لە دیمەنی ئەو ئافرەتەوە نزیك بوو کە لە قەیسەریەکەدا یەخەی گرت و پێی وت( شوێنت هەیە دێم، شوێن نییە وەرە..)

- تۆ بڵێی ئەمە ئەو بێ!؟..

لەوەختی خۆیدا دەستکورتی وا سواری کۆڵی ببوو نەی هێشتبوو بە تەواوی تەماشای نێو نیگای بکات، تا ئێستا یەکسەر بیناسێتەوە، پێی سەیر بوو هەر لەو رۆژەدا بوو زریانی ناسی و بەهۆی ئەوەوە کەوتە ناو دنیای بارزگانی و رووناکی کە بە دەوریدا دەسووڕێنەوە:

- تۆ بڵێی ئەمە راست بێ؟!...

با بگەڕێینەوە لای جوان خان بزانین خەریکی چییە؟.. رای هاتبووە سەر ئەوە: ئەگەر زوو دەستی خۆی پێش نەخا و نیازەکانی لای بارام نەدرکێنی، لەوانە بوو روو لە لایەکی تر بکات و لە دەستی بچێ، خۆ ئەگەر وا بکات توانی دەرگای لێ چوونە پێشەوەی خەڵکی تری لەسەر کلۆم بکات.

ئەو دەیزانی بارام کەوتووەتە ناو تەنگەبەری قاچاخچیانەوە و پارەی وەك هەوری بەهار ئاسمانی هەموو بیر و هۆشێکی تەنیوە لەوانەشە بکەوێتە ناو داوی ئەو ئافرەتانەوە کە دەبنە دەمەی کوانوی ئارەزووە چلێسەکانی قاچاخچیەکان...

دەرفەتی بۆ نە دەرەخسا تا بیدوێنێ و ئەو هەستانەی دەربارەی هەیەتی بۆی دەربڕێ. رای هاتە سەر ئەوە نامەیەکی بۆ بنووسێ، چی دەبێ با ببێ.. بەم جۆرە نامەیەکی بۆ نووسی:

بارام لەوەتەی خۆم ناسیوە، تۆم لەگەڵ خەیاڵی شەو و رۆژمدا تێکەڵاو کردووە بەر لە شوو کردنم بە تەمای ئەو رۆژە بووم، یەکەم خونچەی گەنجیەتیم لە کۆشی تۆدا بگەشێتەوە، بەڵام ئاخ ئافرەتی بێ دەسەڵات دەبێ چی پێ بکرێ!. چۆن دەتوانێ باز بەسەر دیواری ئەو بەندیخانەدا بدات کە لە ناویدا زەنجیر کراوە...

هەر لەو ڕۆژەوە تۆم ناسی دڵم لە ناو قەفەزی سنگمدا وەك سازندەیەكی دێوانە باڵە كوتەیەتی و بۆ تۆ لێ دەدات، ئەو دڵە ساوایەم تا ئێستا هەر ماوە و بە تۆ نەبێ بە كەس ساتۆر نابێ، ئاخ ئەگەر دەتزانی ئەو زایڵە و سەمتوورەی بۆ كێیە!، شەیدای كێ بووە! ئەگەر دەتزانی! وا نەدەبووی.. بۆ تۆ شین و زاری دەكرد، تۆش لەو دەرا نەبووی تا بزانی، یان دەتزانی و دەتویست من هەر بەو ئاگرەوە بتلێمەوە.. خۆزگە ڕۆژێك لێم نزیك دەبوویتەوە ئەو كاتە دەتزانی چی دەڵێم كە ناتوانم بێڵێم..

ئەو سامانەی حاجی لە پاشی جێماوە هی خۆم و منداڵەكانمە، پێویستیم بە یەكێكی وەك تۆ هەیە لە پەنایدا، لە ئاسانەیدا خۆم بیپارێزم،

دل و دەروونی ڕەنجاوی خۆمی بۆ بخەمە بەر دەست، لە تۆ بەو لاوە كەسم بە شایستەی ئەوە نەزانی ببێتە هاوسەرم، لە ماوەی شووكرنمدا گەلێ تاڵی ژیانم چێژتووە، كاری نە بەدڵ دۆزەخێكی ناوەكییە خەڵكانی بێ ویژدان بۆ بێ دەسەڵاتان سازی دەدەن و زاخاوەكەشی دەرخواردی دەدەنەوە، ئێستا لەو دۆزەخەدا نەمام، بەڵام زاخاوەكەی ماوە، جگە لە تۆ كەس ناتوانێ لەو زوخاوە پاكم بكاتەوە.. هەر تۆیت و تۆ.. دەنا دەیان كەس لەبەر نووكی پێڵاوەكانمدا خۆیان دەنووشتێننەوە بۆ ئەوەی گفتێكیان بدەمێ.. ئەوانەش كە چاویان لە تۆیە وریا بە هەڵت نەخلیسكێنن، یەكێكیان تاوسی ڕەنگاڵەیە بە پەڕو باڵی چەواشە مەبە سەیری بەرو دامێنێ نا تەواوی بكە..

ئەویتریان هەڵە پاچێكە دەتوانێ ڕاوە ماسی لە وشكانیدا بكات و دەنكە شقارتە لە دەریادا بدۆزێتەوە، چەندان نۆكەری زرتە زەلامی داتەكاندون وەك كلاشێكی دڕاو دوای داوەشاندن فڕیی داون، ئەو چەند بەرەڵڵایە مێردە تازە پێگەیشتووەكەی لغاوی بۆ شل كردووە.. لە پەنای دەوڵەمەندییەكەیاندا بازاڕێكی تریان بۆ خۆیان ساز داوە.. تۆ تازە دەكەوێتە ناو دنیای بازرگانان و قاچاخچیانەوە، دڵنیام قەڵایەكی وەك تۆ لە بەردەم ئەوانەدا هەر قەڵایەو ناروخێ.. ئەمە قسەیەك بوو خۆشەویستی تۆ وای لێ كردم بیكەم.. چی بكەم هەر ئەو خۆشەویستییە بوو وای لێ كردم پەردەی بێ دەنگی خۆم بەم نامەیە دەربڕم...) (جوان)

جوان پێی وابوو بارام بە خوێندنەوی نامەكەی ئاگری تێبەر دەبێ و بە هەڵە داوان هەڵدێ و فریای ئەو دڵە سووتاوە و ئەو خۆشەویستییە یەكلایەنە دەكەوێ، یان هیچ نەبێ زوو وەرامی نامەكەی دەداتەوە..



بارام نامەكەی جوانی وەك نووسراوێكی پیرۆز هەڵگرت، هەر كات حەزی لە ئەندێشە بازی و پەخش كردنی خەیاڵ لەوەڕاندن بوایە دەری دەهێنا و دەیخوێندەوە، هەر جارێ كە دەوری دەكردەوە جۆرە تام و مانایەكی تری پێ دەبەخشی و كونجێكی تری دەروونی پێ ڕووناك دەبووەوە... چێژی نامەكە وا كەیلی كرد داخوازییە بە پەلەكەی سڕ كرد بوو...

جوان زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی وەرامەكەی بوو.. گڕی چاوەڕوانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەتین تر دەبوو، نەبوونی وەرامەكە ناو بیر و هۆشی كرمۆڵ دەكرد، جنجرۆكی گومان خۆشەویستییەكەی دەڕووشان، دیارە نەبوونی وەرام و دەرنەكەوتنی بارام، جوان بە سووكایەتێكی دەزانی كە لە خۆیەوە دەستی پێ كرد بوو.. وا گومانی دەكرد بەرگی ئاوەدان ئەو بارامەی جارانی لە گێژەنە ترازاندووە!..

***

زریان لە تاقیكردنەوەی پۆلی شەشەمی وەزاریدا بە پلەیەكی باش سەركەوتنی بە دەست هێنا، بەو بۆنەوە باوكی ئاهەنگێكی بۆ برادەران و ناسیاوەكانی ساز دا... ئاهەنگەكە لە پاش نوێژی شێوانەوە تا كاتژمێری دووی شەوی بۆ دانرا بوو، هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەكی بۆ ئامادە كرا بوو، ناسراوترین تیپی مۆسیقا و گۆرانی بێژانی شاری بۆ بەكرێ گیرا بوون، ئاهەنگەكە شاهانە بوو.. لەبەر ئەوەی بە بۆنەی سەركەوتنی زریانەوە ساز درابوو، ئەستێرە گەشەی ئاهەنگ زریان و بارامی مامۆستای بوون، ئەوانەی بەشداری ئاهەنگ بوون بە خێزانەوە بانگ كرابوون، پەریخانی ژنی لەبەر نەخۆشییەكەی توانای بەشداری بوونی نەبوو.، لە جیاتی ئەو شلێری كچی دەوری كابانی ماڵی بارامی پێ ڕاسپێدرا، لەگەڵ باوكی و برا و خوشكەكانیدا ئامادە بوون، شلێر وەك ئافرەت و بەشدار بووەكانی تر تیف تیفەی خۆی نەدابوو كەچی لە ناو هەموویاندا دیار بوو، گوڵی نەپشكوتووی ئاهەنگەكە بوو... كە ساز و ئاواز و گۆرانی وتن گەرم بوون، خوانی خواردن و خواردنەوە ڕازایەوە، لە چینی هەڵپەڕیندا دەستی نێرومێ تێكەڵاو بوون...

ئەوانەی لەگەڵ سەرداردا هاوبەشی كار بوون لەگەڵ بارام دا ناسیاوییان پەیدا كرد، تاكە كەس لە ناو زەمزەمەی هەڵپەڕكێ و شاییدا خۆی نەتواندبێتەوە بارام بوو، بە وردی سەرنجی ڕەفتار و هەڵسوكەوتی هەموویانی دەدا، ئاهەنگ لە سەرەتای گەرم بووندا بوو، مێزی خواردنەوە گاڵتە و گەپ و قسەی بێ مانا و جلفانەی ناوەوە ڕێژرانە سەر مێز، وەك گۆرەوییێ

ڕێبوارێك بەرواژی بکرێتەوە هەمموو ژوورەوەی خۆیان هەڵدایەوە، وتەی بێ مانا و رزاو و ژاوە ژاوی کەلاوەی دڕا و بیر و بۆچوونی گەندەڵ بوون بە باژەلی سەر مێز و لەگەڵ مەزە و مەیی و جۆرەها خۆشاوی بەهاردا تێکەڵاو بوون...

لەعلی و دایکی زریان بەو ناوە خانەخۆی بوون، خۆیان لە ناز و فیز نابوو کەچی لە چاو بارام دا وەك پشتە ماڵی حەمام دەهاتنە پێش چاو.. لە تەنیشت مێردەکانیانەوە دادەنیشتن بەڵکو چۆکیان بە چۆکی ئەوانی ترەوە گیر دەکرد و پاروویان دەخستە ناو دەمیانەوە، پەردەی قسەکردن لە نێوانیاندا نەبوو، سەردار بە بێ پەردە لەگەڵ ژنەکانی مێوانەکانیا قسەی دەکرد بە تایبەتی ژنەکەی خالید دۆغرمەچی کە لە هەمموویان ناسك و مەند و ناز فرۆش تر بوو دایکی زریان ئافرەتێکی شۆخ و دەمەوەر بوو لەگەڵ بەشدار بووانی ئاهەنگەکە دا بە سێ زمان قسەی دەکرد، کوردییەکی رەوان، تورکییەکی بێ گرێ، عەرەبییەکی جلڤانەی ژنانەی ساف، دیار بوو سەراو دەراوی زۆری کرد بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەتێکی دڵ رەفێن و روو خۆش بوو. هەوڵی دەدا شلێری کچی بارام راکێشێتە ناو ئەو بەزمەوە، دووجار بە زۆری بردیە ناو ریزی هەڵپەرکێوەوە و دەیویست فێری دەستبازی بکات.. تاکە کەس خێزانی خۆی نەهێنا بوو پیاوێکی چوار شانەی کەم دوو بوو، کە هات هەمموو پێشوازیان لێ کرد و لە سەرووی خۆیانەوە دایان نا، بارامیان پێ ناسان، بەڵام ناویان نەهێنا بارامیش نەی پرسی کێیەو چ کارییە؟!.

لەکاتی خواردنەوەدا دایکی زریان لە لای راستی و ژنەکەی دۆغرمەچی لەلای چەپی دانیشتن..

بارام لە دڵەوە بێزی لەو جۆرە ئاهەنگانە دەبووەوە، بەڵام دەری نەدەبڕی، هەستی کرد جاروبار دایکی زریان و ژنەکەی دۆغرمەچی بە ناوی دەست شۆشتن و کاروبارەوە دەچوونە ژوورەوە، پیاوەکانیش دزەیان بۆ دەکرد و دەکەوتنە شوێنیان، بارام وەك یەکێك لە سەنگەر دا بێ لە پەنای بەشداری کردنی ئاهەنگەکە دا بە وردی ئاگاداری هەڵس و کەوتەکانیانی دەکرد، سەری بۆ ئەم بەزمە دەلەقان...

- ئەمانە قاچاچچین، قاچاچیش بەسەر هەمموو سنوورێکدا باز دەدەن و گوێ نادەنێ...

ژنەکەی دۆغرەمەچی و پیاوە نەناسراوەکە وەك دوو دڵدار قسەیان بۆ یەکتری دەکرد.. لەعلی خان بێ بەخت بوو، لەو ئاهەنگەدا خۆی دابووە بارام، نە دەزانرا ئەو خواردنەی بە پێی نەخشەیەك بوو، یان دەیویست بیکاتە دەستکەوتێك و بۆ خۆی گلی بداتەوە، زۆر بە دەور خۆی و مندالەکانیدا سووڕایەوە، بارامیش دەتگوت بەردی بن گۆمە و خۆی لێ مات کرد بوو.



ئەو بەو خەیاڵەی کە وەك ئامێری (کالیدوسکوپ) ئەو ئافرەتەی لەمەو بەری بە خەیاڵ رازاندبووەوە. لە جیهانی ئەندێشە دا ببووە نموونەی راستەقینەی هەمموو جوانێك، کەچی ئەوەتانێ ئێستا بە هەمموو گۆشت و گیانی و هەبوونییەکەوە لەبەر دەستیا دێت و دەڕوا، وەك ئەوە نەبوو کە گەرمایی دەروون ئەفڕاند بووی و لەبەر ئاوێنەی باڵانمای خەیاڵیدا رازاندبوویەوە..

بەشداربووانی ئاهەنگەکە بێ پەروا لە دەرگای بەرەڵڵاییەوە دەچوونە دەرەوە و بێ دڵی ئارەزووەکانی خۆیان نە دەکرد،

بارامیش بیرە کۆنەکانی خۆی دابوونە بەر تەقەڵی ئەو مەکینەوە و دەیدوورینەوە و دەیوت..

- سەیری ئەمانەکە: دەماری کەسێتییان چەند خاو و خلیچکە!

لە ناوەوە وەك منداڵی ساوا وەهانە، دەڵێی هیچ بەند و بارێك رووی تێ نەکردوون...

بارامێك لەو شوێنەدا وا بە ناخی خۆیدا بچێتەوە خوارەوە و چی کۆنە دەفتەر و نووسراوی پەرپووت هەن دەوریان بکاتەوە! ئیتر چۆن ئاوڕ لەو ئافرەتە بداتەوە کە جاران هەمموو هۆش و دڵ و دەروونی بە سەریەکدا رماند بوو، وا ئێستا وەك پەروانە بە دەوریا ماخۆڵانییەتی، هەر ئەو بارامە بوو جاران وای دەزانی ئەو ئافرەتەی ناو خەیاڵی سەرچاوەی هەمموو جوانییەکی بێ گەردی ئاسمانییە، کەچی ئەوەتانێ ئافرەتێکی راستەقینەیە، بەڵام ساویلکە و کەم نموودە و دیتنی رێی لە چاوی خەیاڵ گرتبوو...

یەکێك ئاوا خەیاڵی بێ و وا ورد و درشت لێك بداتەوە ئیتر چۆن لە ناو ئەو جۆرە ئاهەنگانەدا دەحەوێتەوە...

لە گەرمەی راوانانی ئەو شتانەدا کە هەست و نەستیان وەك سەری شارە مێرووڵە تەنیبوو، ئەوەی کەوتەوە یاد بە پێی ئەو گوفتەی کە بە یەکێك لە برادەرکانی دابوو سەبارەت بە کڕینی خانووەکە دەبوو بارام لە کاتی کاتژمێری یازدەی شەو دا خەبەری بداتەوە، لەبەر ئەوەی تەلەفوونی قاتی خوارەوەی کۆشکەکەی سەردار راوەستا بوو، دەبوو بچێتە قاتی سەرەوە، تەلەفوونەکەی سەردار بە کار بێنێ... لەگەڵ زریاندا چوو، خۆزگە نە چووبایە و نەی دیبایە!..

لە درزی هۆدەکەی ئەو دیودا ژنەکەی دۆغرمەچی و سەردار لە یەك ئالا بوون، لە هۆدەکەی تریشدا دۆغرمەچی و دایکی زریان چەڵەمە پرچێیان دەکرد و دەقلانەوە، بارام لەگەڵ ئەو

تێکەولێکەدا نەگونجا، کە چاوی بەو حاڵە کەوت ئەوەندەی تر دڵی لەو بەزم و ڕەزمە تۆرا و بەبێ ئەوەی تەلەفوونەکە بکات دڵگیربوو بە نیگەرانی هاتە خوارەوە...

ساز و سەمتوور و گۆرانی و هەڵپەرکی لەو پەڕی گەرم بووندا ئەو تێکەولێکەیە بە لای بارامەوە شتێکی دوکمە و عاجباتی نەبوو لەوانە بوو لەبەر منداڵەکانی نەبووایە تێکەڵاو دەبوو هەناسە تاساوەکانی لەبەر دەمی لەعلی دا والآ دەکردن، بەڵام بۆ ئەوەی باجەکەی لە شلێری کچیدا نەدا توانی خۆی بگرێ، چونکە ئەوەی بەرهەم بچێنێ دەبێ باجیش بدا، وای بەپەسەند زانی لە بەر هەیوانەکەدا کە بەرامبەر ئەو باخچە گەورە بوو شایی تیا دەکرا دانیشێ. هەر لەوێش تەلەفیزیۆنێك دانرابوو، لە ئێوارەوە بەبێ ئەوەی کەس سەیری بکات ئیشی دەکرد... بڕگەیەکی نامەکەی جوان خانی هاتەوە یاد کە دەیووت:(وریا بە هەڵت نەخلیسکێنن..)

لەگەڵ، ئەوەی دی و ئەوەی دەیبیستێ، لەگومان بە هێز تریان خستە دڵیەوە هاتوو چوون و فرك هۆڕی منداڵە بێ ئارامەکانی ناو گۆڤەندەکە و گەلێ شتی تر، ناو هۆشیان کرد بوو قاڕی بازاڕەکەی ناو شار، لەبەر خۆیەوە دەیوت: داخۆ ئەو هەڵخلیسکانە چۆن بێ!!، لە پڕ نەیزانی چۆن بوو بابەتێکی ناو تەلەفیزیونەکە بیری بە لایخۆیدا راکێشا، ئەوەتانێ دوو لایەنە گەورەکەی حوکمڕایانی کوردستان یەخسیرەکانیان دەگۆڕنەوە.. بە نیازی خۆیان دڵسۆزی پیشان دەدەن، دەیانەوێ متمانە رووخاوەکەی جەماوەر کە لە دەستیا چوو بنیاتی بنێنەوە و هەر یەك بەلای خۆیدا رای کێشێ، ئەوەتان یەك بە یەك و سەر بە سەر یەخسیرەکانیان دەگۆڕنەوە!...

بارام سەرنجی لێ دەدان کە چۆن وەك ئاغا و بەگەکانی جاران بۆ سەرانە سەندن، سەر ژمێری مەڕو ماڵآتیان دەکرد، ئاوا یەکێك لەوان دەدرا بە یەکێکی هاوشان و هاوسەنگی ئەمان، بارام دی یەکێك لەوانە کە سەر بە سەری پێ کرا لەو کوڕە عارەبانچییە دەچوو کە بە هۆی بەرمیلەکەی ئەوەوە گیرا و بێ سەر و شوێن کرا، کە زانی ئەوە... هەر لەو کاتەدا بڕیاری دا خۆی بگەینێ ئەو شوێنە و وەك وەفادارییەك بیباتەوە بۆ دایکە کلۆڵەکەی، ئەو ئەرکەی کە دەربارەی ئەو هەستی پێ دەکرد لەسەر شانیەتی بیداتەوە و یارمەتی ئەو خێزانە لێ قەوماوە بدات...

هەر ئەو دەمە مەولەتی لە سەردار و گشت بەشدار بووانی ئاهەنگکە خواست بە بەهانەی ماندوو بوون ماڵ چۆڵ بوونەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە..بە هۆی تەلەفۆن کردنەوە بۆی دەرکەوت یەخسیرەکانی هەر دوو لا بە پێی ڕێکەوتنی هەر دووکیان بە کەس و کاریان دەدرێنەوە...



بەجێ هێشتنی ئاهەنگەکە بۆ بارام کارێکی پەسەند نەبوو، لە پاشە ملەدا قسەی زۆری هێنایە سەر خۆی، جگە لەوەی ئەو (لەعلی)یە کە جاران ببووە بە دینەمۆیەکی گیانی و گەرمی بە جەستەی دەدا مانای ژیانی بۆ بە تین دەکرد، تا رادەیك ئەو گیانەی لێ هەرتە بوو، جگە لەوە ئەوانەی کە ناحەزی بوون و چاویان پێی بەڕایی نە دەهات ئەو بەجێ هێشتنەیان قۆزتەوە و تۆمەتی (سێخور)یان بە ناحەق دادایە پاڵی!.. بەڵگەیان بەوە دەهێنایەوە کە:

ئەوە بوو چەن مانگێك لە مەو بەر، نامەیەکیان لە لایەن ئەوانەوە کە کڕین و فرۆشتیان لەگەڵیاندا هەبوو، سەر بە رژێم بوون، نامەیەکیان بۆ ناردن، کە تیایدا داوای چاوپێکەوتنی چەند کەسانێکی تیا کرا بوو، یەکێك لەوانە سەردار باوکی زریان بوو، ئەوە بوو بارام نەیهێشت سەردار بڕوات، ئەوانی تر کە رۆیشتن، هەر بە گەیشتنیان بەو شوێنە دیاریکراوە قوڵ بەست کران و تا ئێستاش چارەنووسیان دیار نییە... ناحەزانی بارام ئەو رووداوەیان کرد بووە هەنجەت، کە گوایا بارام ئەگەر شتێ نەزانێ و لەبنەوە دەستی لەگەڵ پیاوەکانی رژێمدا تێکەڵاو نەبوو بێ چۆن نەیهێشت سەردار لەگەڵ ئەوانەی کە گوم بوون بڕوات!!؟..

بەڵام سەردار گوێی پێی نەدەدان و رۆژ بە رۆژ متمانەی بە بارام پتەو تر دەبوو، بۆ سەردار چی لەوە گەورە تر بوو کە ئەو بوو بە هۆی نەڕۆیشتنی و سەرنگوم نەبوونی... بەجێ هێشتنی ئاهەنگەکەش بەلای سەردارەوە بەشێك بوو لەو هۆیانەی کە پتر متمانەی پێ بکات، ئەگەر بارام پیاوێکی کارامە و دامەزرا و نەبووایە، بە شوێن تەماح و رابواردندا بگەڕایە هەڵبەتەلە نیوەدا ئاهەنگەکەی بەجێ نە دەهێشت، ئەوە پتر سەرنجی سەرداری راکێشا ئەوە بوو، بارام لەوانەی کە نەناسراو بوون لەلای لێیانی نەپرسی ئەوانە کێن و چ کارەن.. ناو و نازناوێکی داتاشراویان بۆ سەرکردەکەیان- ئەو پیاوەی کە هەموو رێزیان لێ وەردەگرت و بە کاکە، ناویان دەبرد- دانا بوو، کە ئەگەر بارام، یان یەکێکی تر بپرسێ پێی بڵێن... کەچی بارام ناوی نەپرسی، ئەوەندەش بایەخی نەدایە...

بارام هەر چەند تا بن گوێی لە ناو بەزمی کڕین و فرۆشتن دا نقووم ببوو لەگەڵ ئەوەشدا ناخی دەروونی خۆی لێی گوم نەکردبوو، بەڵام ئایا دەتوانێ هەروەها سپ و ساغ بمێنێتەوە و دەوڵەمەندی نەی قوپێنێ!؟...

***

## (17)

بەیانی بوو هێشتا بە تەواوەتی دۆست و دوژمن لە یەك جیا نە دەكرانەوە، بارام بە پەلە خۆی لەبەر كرد و سواری پیكابە تازەكەی بوو بەرەو گوندە تۆراوە بریندارەكەی دێگەڵەی مۆری نەفرەتی هەردوو لای برا كوژی كەوتە رێ.. بەپەلە رێی دەبڕی، بۆ ئەوەی كوڕە عارەبانچییەكەی وەك مژدەیەك بۆ دایكە كلۆڵەكەی سوار بكات و بیباتەوە ماڵ خۆیان، تازە لە قەراغی شار تێپەڕی بوو، لە دوورەوە دی ئۆتۆمبێلێك لە قەراغ جادەكە راوەستاوە و یەكێك لە نزیكیدا دەبەیەكی بە دەستەوەیە، ئاماژەی یارمەتی و بانزین وەرگرتن دەدات، گەیشتە لای، دی ئەوە فەتاح ئەفەندییە بوو كە بەرپرسی خۆیەتی وەزارەتە.. دابەزی و بەگەرمی رۆژ باشی لێ كرد، فەتاح كە پێیان دەوت فەتەلە پێ سەیر بوو بارام بەو جۆرە رێزی لێ ناو پڕ بە دەبەكەی دەسی بەنزینی كردە ناو ئۆتۆمبیلە مۆسكۆ فیچەكەیەوە و یارمەتی وەرگەڕ خستنی دا...

– كاك بارام ئۆتۆمبێلەكەم هەم بەنزینی نەماوە، هەم پەكی كەوتووە...

– كاك فەتاح خەمت نەبێ... بۆ بەنزین ئاسانە بۆ شتی كەش ئامادەم...

كە زانی ئۆتۆمبێلەكە لەوانە بوو بە بەنزین بكەوێتە ئیش زوو پەتێكی تێخست و تا لای بەنزینخانەكەی لای بازگەكە رای كێشا...

– كاك بارام ماڵت ئاوا بێ... گەردنمان ئازاد بكە ئەزیەتمان دای...

وشەی گەردن ئازادییەكەی بۆ ئەوە نەبوو كە بارام بەروویەكی گەشەوە یارمەتی دا، بەڵكو بۆ ساتۆر كردنی ئەو ویژدانەی بوو كە لەو هەڵوێستە مەردانەی بارام دا، دڕكی پەشیمانی بە هەناویدا چەقان و ئەوەی دەهێنایەوە یاد كە راپۆرتی پڕ بە تۆمەتی لەسەری نووسیبوو، تا بەو تۆمەتانە لەسەر كار لایان دا... بارامیش لە دڵەوە منەتباری ئەو و بەڕێوەبەری گشتی وەزارەت بوو كە ئەو خراپە چاكەیان دەربارەی كرد...

ئەگەر وانەبووایە، دەبوو تا ئێستا وەك چاوی لە چەند پوولێكی دەرماڵەی ساڵانەی مووچە خۆری بووایە.. بۆیە بەرامبەر بەو" گەردنمان ئازاد بكە"ی فەتاح ئەفەندییە لە دڵەوە دەیوت:" گەردنتان خۆش و ئازاد بێ، ئەگەر ئێوە ئەو خراپەتان دەرحەق بە من نەكردایە كەی من ئێستا وەها بووم كە هەم...".



دوای هەواڵ پرسینی سەرجەم فەرمانبەرەكان بە تایبەتی بەڕێوەبەری گشتی وتی:

– سڵاوم پێی بگەیەنە.. نیازم هەیە رۆژێك بێمە لای... بارام بە پەلە بوو، دەنا دیتنی فەتەلە لەو شوێنەدا دەرفەتێك بوو بۆی، حەزی دەكرد لە جیاتی ئەو خراپانەی كە كرد بوونی چاكەیەكی باشیی بداتەوە، تا تێبگات و چاو بكاتەوە، كە نابێ مرۆڤ لە دیدی رۆژێكی تارەوە تەماشای ژیان بكات، چی تیایە با بزانێ: چاكە و خراپە لە خودی خۆیاندا یەكن و لە چاوی ئێمەدا جیا دەبنەوە، هەر دووكیان پاڵدەری هێزی ژیانن، هزری مرۆڤ ناویان لێ دەنێ و لە یەك جیایان دەكاتەوە... ئەوە سروشتی كوردە، خراپەی خەڵك دەباتەوە سەر چاكە، كەواتە بارام حەقی نەما گلەیی سیاسەتمەدارەكان بكات كە لە جیاتی سزادانی خراپەكاران، پاداشتیان دەدەنەوە... ئایا ئەو تاوانبارانە بەو چاكەی بڕی خراپییە تەمێ دەبن؟ یان بە تەختە كەمییەكی ناو جەستەی ئەم كۆمەڵەی دەزانن، با لە راستیدا رەگێكی تایبەت بێ و ئەژیارێكی دێرین رەخساندبێنی... ئومێدە وابێ...

لەوێ كە تێپەڕی لە سەر سەد هاژوشتی، هەر لە دوورەوە دوو ئۆتۆمبێلی كۆستەری لە بەردەم رێكخراوی دێگەڵە دا بینی، دەور و بەریان ئاوەدانی بوو هەندێ كەس سوار ببوون هەندێكی تر خەریكی سواربوون بوون، بارام لە بەردەمیان راوەستا، دی یەخسیرە ئازاد كراوەكانی هەر دوولا، ئەوانەی كە ماڵیان لەم شارە دا بوو پێكەوەن، لەمە لە پیكابەكەی هاتە خوارەوە گوێ لە دەنگێك بوو دەیوت:

– مامۆستا بارام؟..

بارام ئاوەڕی لێ دایەوە و یەكسەر گەشایەوە دی كاروانی مەلا جەوهەرە؟!...

– كاروان!؟..

باوەشیان بە یەكدا كرد و یەكتریان ماچ كرد..

هەلێكی لە بار بوو بۆ بارام رەخسا بوو،. هەل لەوە باشتر هەبوو، بارام، كامەران بكاتە مژدەیەكی كتوپڕی و دڵی دایك و باوكی پێ شاد بكات لەو كەمتەرخەمییەی كە بە ئەنقەست نەبوو خۆی پاك بكاتەوە، ئەوە بوو لەوەختی خۆیدا هەواڵی پیا نارد كە بە ماڵیان بڵێ لە پۆلیسخانەكەی خانەقا دا بەندە و ماوە، كەچی بارام لەبەر شپرزەیی و سەر قاڵی خۆی لەبیری نەما هەواڵەكە بگەیەنێ، كە كەوتەوە یادی ئەو لەوێ گوێزرا بووەوە بۆ لایەكی تر...

لە ناو كۆستەرەكەی تردا كوڕە عارەبانچییەكەی دی و رووی تێ كرد:

– كاكی برا چۆنی؟..

كوڕە عارەبانچییەكە، نەی زانی لەگەڵ ئەویەتی، نەی دەناسی.. كاروان كە زانی رووی لە كێیە دەنگی هەڵبڕی و بانگی كرد:

– هاوار!.. لەگەڵ تۆیەتی...

بارام کە زانی ناوی هاوارە.. بانگی کرد... هاوار!!.

هاوار دوای کەمێ بارامی ناسییەوە کە خاوەنی ئەو بەرمیلەیە کە ئەوی لە پێناو دا گیراوە... دوای خۆ ناساندنی بارام بە لێپرسراوانی رێکخراو و پەیمانی دان کە هەر دووکیانم بە ئەمان و بەزەمان بباتەوە ماڵ خۆیان.. هەرسێکیان سوار بوون و لە رێگەدا کەوتنە گفتوگۆ، بارام رووی کردە کاروان:

- ئەوە چۆن بوو گیرای؟...

- مامۆستا، کەس من نەناسێ تۆ چاك من دەناسی، ئەوانەی کە گیانیان خیانەت بارییە، هەر ئەوانە ئاگری برا کوژییان نایەوە و لە جیاتی ئەوەی روویان رەش بکرێ، دەستی خۆیان وەشاند و وەك مۆرانە لەبنەوە کاری خۆیان کرد و حەقی راپەڕینیان لێ سەندینەوە...

- راپەڕین رووبارێکە لە خوێنی شەهیدان.. ئەو جۆرە خاشاك و دڕك و داڵانە لەبەریا خۆ ناگرن.. جڕو جانەوەری بەر پێی راپەڕین لە دوا هەناسەیاندا ئەو حاڵەتانە بەرپا دەکەن... گوێ مەدەنێ، ئاسۆی شۆڕش رووناکە.. ئەرێ ئەو رۆژە یەکترمان دی دوایی چیت لێ هات؟!...

بارام ئەو پرسیارەی بۆیە ئاراستەی کاروان کرد، تا بابەتەکە بەلایەکی تردا بشکێتەوە، نەك ئەو قسانەی کە ئەوەندە درا بوونە بەر کوتکی جوینەوە تامیان نامابوو...

- هەر ئەو ئێوارەی ئەو رۆژە نەقڵی بەندیخانەی مەحەتە کراین و لەوێشەوە گوازراینەوە بۆ لایەکی تر...

- ئەی تۆ کاك هاوار؟.

چیرۆکی رووداونی من زۆرە.. دیارە خوا وای بۆ ئێمە بڕیوەتەوە لە ناو کەوڵەکەی خۆشماندا نەحەوێینەوە...

بارام لە مەبەستەکەی هاوار تێگەیشت، خوێنی گلەیی و بێ چارەیی لێ دەتکا.. بۆیە بە پوختی پێی وت:

- نا.. وا مەڵێ.. ئێمە لە سەرەتای رەوتماندا تەکی خەڵك کەوتین... ترازاین... تا دێینەوە ڕێ، زۆری دەوێ... ئەرێ کاك هاوار تۆ من دەناسیتەوە؟!..

- بەڵێ وێنات دەکەم، ئەگەر ئەو بی...

بارام زوو قسەکەی بڕی:

- بەڵێ ئەوم.. خاوەن بەرمیلەکەم.. ئەو بەرمیلەی کە لە بەنزینخانەکە دامان ناو نەمان بردەوە...

- بەڵێ دەزانم...

- ئەی دەزانی من لەسەر چی گیرام و چ تاوانێکیان بۆم هەڵبەست!...

- ؟..



- ئەو شەوە دزە گەورەکان ویستیان قافڵەیەکی قاچاخ تێپەڕێنن وایان بە باش زانی بوو لە چەند شوێنێکی شاردا دەست بە تەقە و تاڵان بکەن، تا دەسەڵاتدارانی حکوومەتی کوردستان بپەشۆکێنن و قافڵەکە بە ئاسانی دەرباز ببێ... من کە بەیانی بۆ سەردانی بەرمیلەکە چوومەوە ئەوێ، منیان گرتوو، تاوانیان بۆ تاشیم کە یەکێکم لەوان، هەنجەتیان پێگرتم و وتیان ئەوە نییە بەرمیلەکەت بە خەتی سەوز نووسراوە...

بارام تا ئەو کاتە سەرنجی بەرمیلەکەی خۆی بەوردی نەدابوو کە ئایا وایە... لە دڵیشەوە دەیوت:"ئەو کاتەی منداڵەکانی من کە نووسینی خۆیان لەسەر ئەو بەرمیلە تاقی کردووتەوە، ئەو کاتە رەنگ هەر رەنگ بوون و مانایەکی تریان نەبوو" هەر پاش وتەکەی هاوار، قسەکەی دادوەری دادگای هاتەوە بیر کە پێی وت:"چ نیشانەیەکی پێوەیە؟" تفو.. لەو حاڵە، خەڵك بە پۆساڵی ئاسنییەوە ورگمان دەکوتێتەوە، کورخانی تواندنەوەمان بۆ گەرم دەکات، کەچی ئێمە خەریکی سۆراخ کردنی پەڕۆی بەر بانەگای ئافرەتە سۆزانییەکانین! بۆ رەنگیان دەگەڕێین؟..

هاوار کە قسەی دەکرد دوکەڵی حەسرەت لە دەمی لوول دەبوو...

- جا تۆخوا ئێمە بۆ ئەو حاڵە ساڵەهای ساڵە هەوڵ دەدەین!... ئەی خوای کوردان... خۆزگە لە کونێکی ئاسانەکەتەوە چاوت لەم بارە دەبوو... دەی یاگەی خۆت هەڵ تەکێنە و وەرە ببێنە...

بارام زوو لێ هاتە دەم:

- هەوڵی ئێمە بە فیڕۆ ناچێ، هەر بە ئاواتی خۆمان دەگەین...

کاروان هاتە دەم:

- کەی؟..

بارام بە متمانەوە وتی:

- کاتێ کە هەست بکەین ئێمە کێین...

کاروان:

- هێشتا نازانین ئێمە کێین؟.

- بارام بەو جۆرە نا... بەوەی کە بتوانین خۆمان، مێژوومان رابردوومان لە دوژمن جیا بکەینەوە.... لە کاسەی خۆماندا ئاو بخۆینەوە، گۆرانی بۆ خۆمان بڵێین زوڕنای دەمی خەڵك نەبین، کاسە سەرمان نەکەین بە تەپڵی کوتان بۆ شایی و شەپۆری ئەو و ئەم...

ئەوەش وەختێ دەبێ کە شۆڕشێکی وا بەرپا بکەین بتوانێ لە قاڵبی خۆماندا و بۆ خۆمان دامان بڕێژێتەوە.....

کاروان هاتە دەم:

- ئۆهۆ.. زۆری دەوێ...

- با زۆری بوێ.. بەڵام ئاسان و سانایە، ئەگەر بمانەوێ...

رووی بە لای هاوار دا وەرچەرخان:

- وانییە؟.. کاك هاوار!؟..

- بڵێم چی! ئەگەر بڵێم قسەی تێریەتی لە قسەی برسێیەتی جیایە...

هاوار هەر ئەوەندەی وت و بێ دەنگ بوو...

بارام وتەکەی بردەوە لای کاروان و وتی:

- ئەی تۆ دەڵێ چی؟!..

- راستی تێر و برسی بۆ نییە..

کاروان دەیزانی بارام ئەفەندی لە بارەی هەبوون دایە، وەك جاران دەستکورت نییە و رووی بەرەو بارەی هەبوونی ناوە، هەر چەند، ئەو هەبوونییە لەسەر هێڵەکەی جارانی نەیترازاند بوو و هەر هەمان بارام بوو، چ بە قسە و چ بە کردەوە، بەڵام وەك جاران وتەکانی بریندار و زاخاو رێژ نەبوون... بۆیە بە شەرم و زەردەخەنەیەکی ناسکەوە وتی:

- بێ قەزا بی چۆن راستی تێر و برسی بۆ نییە!... ئەوەی برسی دەیزانی تێر بەلایدا ناچێ!..

بارام دەیزانی وتەکانی کاروان لەسەر چ کەلێك شەن دەکەن...

- کاروان گیان مەسەلەی ئێمە، تێر و برسیەتی نییە، مەسەلە سەرەکییەکەمان راست کردنەوەی ئەو هەڵانەیە کە کردوومانن و بوون بە مایەی برسیەتی و بێ دەرەتانێ و لانەوازیمان، لە ناو جغزی ئەو دنیایەدا لای داوین و پشتگوێ خراوین.

دیار بوو ئەو جۆرە بابەتانە لە بەندینخانەدا کاروان و هاوار لەگەڵ کەسانی تردا ئەوەندە شەن و کەویان کرد بوون، ببوون بە رێس و گوریسی پیرەژنەکە، ئەوانە ئێستا شەوقی بەربوون و بە ماڵ شابوونەوەیان لەلایان پەردەی بە رووی مەسەلەکانی تردا، دابوو، بۆیە حەزیان لەو وردەکاری ئەو جۆرە مەسەلانە نەبوو.

کە گەیشتنە ناو شار یەکسەر روویان کردە ئەو گەڕەکەی کە ماڵی هاواری تیا بوو، یەکێك بوو لەو گەڕەکانە کە خەڵکی گوندە دەرکراوەکان لە پەنای شاردا خۆیان حەشار دابوو، هەر یەك کۆلێتێکی بۆ خۆی لە قوڕ و دار دروست کرد بوو، دەبوو بەر لەوەی بگەیتە بەر ماڵیان بە سەر ئەو بەردە بازانەدا باز بدەی کە بۆ بازدان بەسەر سیانە پەنگ خواردووەکەی بەر ماڵیان دانرابوو، هاوار حەزی لێ نەبوو، بارام و کاروان تا ماڵەوە لەگەڵیدا بچن، بارامیش پێی خۆش بوو شاد بوونەوەی هاوار و دایکی ببینێ، لەبەر دەرگادا چەند منداڵێکی رووتەڵەی رەنگ پەڕیوو هەڵ تووتا بوون، گەورەکەیان، بە هاتنی ئەو سێ زەلامە، ترسی لێ نیشت، بە لام کە هاواری برای باوەشی پیا کرد و ماچی کرد، ترسەکەی نیشتەوە و هاواری کرد...



- کاکە هاتەوە!.. کاکە هاتەوە!...

دیار بوو دایکیان، لە ماڵ دەرچوو بوو، بۆ ئەوەی هەندێ پووش و پلاش و قاقەزە کۆنە و موقابا بۆ سووتەمەنی خڕ بکاتەوە.

منداڵە گەورەکەیان زوو بە شوێن دایکیدا غاری دا... دواناوەندییەکەیان لە ژێر پەتوێکی شڕدا راکشا بوو، پەڕۆیەکی سەوز لە مەچەکی بەسترا بوو، وەك ئاگر دەسووتا، سەر سنگی وەك دەمەی کوورە دەیدەمان، تووشی گرانەتا و سێبەرو ببوو، ئەمە ئەو منداڵە بوو کە لەبەر دەمی دەرگای دادگادا لە کۆشی دایکیدا سەیری هاتووچۆی بەر دەرگاکەی دەکرد.. بارام کە دەستی لە پشتی خشان زۆر گەرم بوو، لە باوەشی کرد و داوای لە هاوار و کاروان کرد فریای خەستەخانەی بخەن.. لەو کاتەدا دایکی هاوار، بە هەڵە داوان بازی بەسەر بەردە بازەکەدا دەدا، لە دوا بەردە بازدا کەوت و لە خۆشیاندا لە خۆی چوو، ئەو پووش پلاشەی کە خڕی کرد بووەنەوە رژانە ناو سیانەکە...

بارام زوو فریای کەوت و هەندێ ئاوی بە دەم و چاویدا پژان بە ئاگای هێنایەوە..

- هاوار گیان.. ئەوە تۆی!؟..

دایە گیان.. بەڵێ.. ئەوم..

- دایە بە قوربانت بێ...

بارام کە زانی دایکەکەش هێزی تیا نییە، بە پەلە هەر دووکیانی سوار پیکابەکەی خۆی کرد و بەرەو خەستەخانە کەوتە رێ...

خەستەخانەش وەك ئاشی بە تاڵی لێ هاتبوو، بەڵام بارام بە هێزی پارە، منداڵەکەی بە دکتۆری پسپۆر سپارد و فریای ئەو خێزانە کلۆڵە کەوت... بەر لەوەی لێیان جیا بێتەوە بە هاواری راگەیان کە سبەی لە ماڵەوە بێ و نەچێتە دەرەوە، چونکە کاری پێی هەیە دێتەوە لای..

***

کاروانیش لەمە گەیشتە ماڵەوە، هەراو زەمزمەی خۆشی دەستی پێ کردوو هەموو هاوسێکان بۆ چاوڕوونی بە سەریاندا رژان، ئەو گەردو گومانانەی کە بەر دڵی مەلا جەوهەریان سەبارەت بە بارام تەنیبوو رەوینەوە و نەیدەزانی بە چ زارێك سوپاسی بکات، ئەوان لە ناو خۆشیدا مەست ببوون و بارامیش پەلەی بوو بگاتەوە لای منداڵەکانی خۆی...

مەلا جەوهەری بانگ کردە کەنارەوە و پێی وت:

- مەلا جەوهەر، نیازی هەر پڕۆژەیەکت بۆ کاروان کرد، حەز دەکەم پرس بە من بکەی...

مەلا جەوهەر باش لە مەبەستەکەی بارام حاڵی نەبوو، چەند رۆژێك بوو وتەکەی بارام لە مێشکیدا گینگڵەی دەدا و پەی بە مەبەستەکە نەدەبرد، ناحەقی نەبوو، وتەکەی مانایەکی بەر بەرەڵڵای دەبەخشی و بەر فروان بوو..

بارام که گەیشتە ماڵەوە، یەکسەر بە شلێری کچی وت:

- کاروانی مەلا جەوهەر بەر بوو..

هێشتا وتەکەی لەدەمی نەترازا بوو، شلێر بەبێ هەدەرانە وتی:

- تۆخوا راستییە؟!. کاروان بەر بوو؟!.

بارام بۆ زێدە دڵنیایی کردنی:

- من چووم هێنامەوە.. خۆم بووم بە کەفیلی...

- تۆخوا بابە گیان بووی بەکەفیلی؟!..

- بەڵێ...

بارام کە دی شلێری کچی بە بیستنی بەربوونی کاروان رەنگی سوور هەڵگەڕا، زانی ئەو هەستەی کە دەربارەی کاروان شلێر هەیبوو راستە و خۆشەویستی لە نێوانیاندا بنجی داکوتاوە...

***

سەردار لە سەر سەفەر بوو، بۆ جێبەجێکردنی کۆنترێتێکی بارزگانی لە هەندەران خۆی ئامادە کرد بوو، کەسی لە بارام دڵسۆز و دەست پاك تر شك نە دەبردو بۆ ئەوەی ماڵ و کار و بارەکانی خۆی پێی راسپێرێ بە پەلە تەلەفوونی بۆ کرد. ماوەیەك پێکەوە دانیشتن و لە بارەی ئەو کۆنترێتەوە، بیر و ڕای خۆیان دەربڕی، سەردار گەلێ شتی لەو بارەیەوە بۆ روون بووەوە، پتر دڵنیا بوو کە بارام بیروبۆچوونەکانی لەو پەڕی راستی دان...

دایکی زریان زانیبووی بارام دێت، جوانترین جلی لەبەر کرد بوو، بە عیشوە خۆی دەنواند... بەڵام هیچ بارامی نەدواند..

بارام چاوی بە شوێن لەعلی خاندا گێڕا، نە دەنگی نە رەنگی نەبوو، تەنانەت زریانیشی لە دوور و نزیکەوە نەدی، سەیرە! لە دڵ خۆیدا دەیوت:

کەی ئەم کۆشکە وا بێ دەنگ و دامرکاوە بووە! ئەو سەیر و سەفایەی جارانە، داپۆشرا بوو، وەك بە تەگبیرێکی تایبەتی ئەوە ساز درابێ وابوو...

دوای خوا حافیزی، لەسەر خۆ بەبێ ئەوەی ئاوڕ بەم لاو بەو لادا بداتەوە لە کۆشکەکە هاتە دەرەوە، لە گەراجەکەدا ئۆتۆمبیلەکەی راگرتبوو، دوو سێ جار سولفی لێ دا وەری نەگرت، وەك ئێستری چەموش سینی کرد، ناچار بۆدێیەکەی هەڵدایەوە و سەیری ماشینەکەی دەکرد، دەستی لە هۆڕینەکەی کەوت و لە پڕ دەنگی دایەوە، لەو کاتەدا، ئافرەتێك کە بە لێچکی سەر پۆشەکەی دەم و چاوی خۆی داپۆشیبوو تێدەپەڕی بە بێ هەستی بە هۆڕێنەکە راچڵەکی و(وەی) یەکی کرد دەستی



لەسەر پۆشەکەی بەر بوو.. بارام ویستی داوای لێبوردنی لێ بکات کە دەم و چاوی ئافرەتەکەی دی سەرسام بوو:

- جوان!!؟..

بەروویدا راما، تاسا... لەسەر خۆ:

- جوان خان!!؟.

جوان لە شوێن خۆیدا هەڵۆەسەی کرد و دەیڕوانییە بارام

- ئەوە لێرە چی دەکەی!؟..

- ئەی تۆ لێرە چی دەکەی!؟..

بارام بە وەرامددانەوەی پرسیارەکە.. تاسا..

- من؟!

- بەڵێ تۆ!

وەك دەبینی...

- منیش وەك دەبینی..

بارام دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو، نەیدەزانی چی بڵێ...

تەنانەت ئەوەشی بە بیردا نەهات پێی بڵێ مەڕۆ بتگەێنم... تا بە هۆش خۆی هاتەوە، جوان سواری تەکسییەك بوو و تێی تەقان.. بارام لە شوێن خۆیدا راما... بەبێ مەبەستانە کە سولفی ئۆتۆمبێلەکەی لێ دا یەکاو یەك کسپەی لێوە هات و کەوتە کار کردن...

دیتنی جوان لەو شوێنە داو، لە رووداو وەستانەوەی بەو شێوەیە سەرو بەری هۆشی بارامی بە سەر یەکدا رمان دوای سەروبەرکردنی کاروبارەکانی ماڵەوە و سەردانی پەریخان و منداڵەکانی خونچە، دەیویست لە کونجێکی ماڵەوە دا، دوور لە هەرا و هاژەی کارو کردەی ژیانی رۆژانەی، خۆی بداتە بەر بیر و وردە تێبینیەکانی خۆی و هەندێ لەوەی کردوویەتی و لەوەی دەیکات رابمێنێ و بزانێ لە کوێوە دەستی پێ کردووە و بەرەو کوێ دەڕوا و تا چ رادەیەك جەڵەوەی کارەکانی و خواستی خۆی لە دەست گرتووە... کە لەگەڵ خۆیدا کەوتە خەڵوەتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ وەك جاران دەتوانێ سەر قاڵییەکانی خۆی یەك بەیەك راگرێ و بیانداتە بەر تیشکی هۆشی و کێش و سەنگیان بکات و هەر یەك لە خانەی خۆیدا دایبنێ و ئاسوودەەی بکات، بەتایبەتی مەسەلەکەی جوان پەرت و بڵاوێکی وای لە هۆشیا دروست کرد بوو شتەکانی تری پێ رکێف نەدەکران..

جوان شایستەی هاوسەرێك بوو بۆ جوانی و گەنجییەکەی هاوشانی بێ و لە بواری کارو بازرگانیش دا کارامە بێ، ئەو دوو سیفەتەش لە بارامدا هەبوون، جوانیش خۆی کە بە نامە بۆ بارام کردەوە ئەو دوو شتەی رەچاو کرد بوو، وێڕای ئەوەش ئەو دڵەی کە بۆ یەکەم جار پێشوازی لە ئەڤین کرد ئەو تیرەی

بەر کەوت کە پەنچەی نەرمی بارام تێی سرەوندابوو.. خۆ خۆی دەیتوانی ئەو سامانەی بۆی ماوەتەوە سەرپەرشتی بکات و لە بازاڕی بازرگانی دا گەشەداری بکات و پەکی نەکەوێت، بەڵام ئەی دڵی، ئەی ئەو جوانییەی بۆ کێی هەڵگرێ، خۆ مرۆڤ هەر جارێك دەژی، کە مرد ناگەرێتەوە کە پیریش بوو ئێسکی قورس دەبێ، ئەو گاڵتەی بەو ژیانە دەهات کە بێوەژن بوون دوای مێردە مردووەکانیان رەبەن دەمانەوە، خۆ ئەگەر پیاو بووایە وا نەدەبوو، کەواتە بۆ وەك ئەوان نەکات، بۆ ژیانی خۆی بە فیڕۆ لە دەست بدات، کێ لەو دیوو هاتووەتەوە تا خەبەری یەقینی لابێ..

بارام ئەو راستییەی سەرەوەی دەربارەی جوان دەزانی..

ئەوەشی دەزانی وەرام نەدانەوەی نامەکەی جۆرە گێلییەك بوو رووی دا، دەیوت:

کاشکا وا نەبووایە، دەنا تووشی ئەو نووچاندنەوە نە دەبووم، ئەوە بوو پێی وت:" منیش وەك تۆ!" یانی چی: منیش وەك تۆ؟ بەر هەر مانا و مەبەستێکت بدایە، دەیگرتەوە دەیوت:

- تۆڵەی خۆی لێم کردەوە؟!..."

دیارە ئەویش دەستی تێکەڵاوە؟ رەنگەوا بزانێ: من پێیان هەڵ خلیسکاوم؟

تا ئەویش وا بێ، گشت بۆ چوونەکان لە ژێر رەشماڵی ئەو وتەیەدا جێیان دەبێتەوە! کە منیش وەهامە..

باشە گریمان زوو وەرامی نامەکەیم دایەوە.

ئەی چۆنی زانی لەعلی و دایکی زریان هەر یەکەیان دەیەوێ بە لای خۆیدا رامبکێشێ!؟ ئەوە بوو لە نامەکەیدا هاتووە" وریابە هەڵت نەخلیسکێنن" ئەی چۆنی زانی:" یەکێکیان تاوسی رەنگاڵە یە و بەرو دامێنی تەواو نییە ئەویتریان دەتوانێ دەنکە شقارتە لە دەریادا بدۆزێتەوە"! تۆ بڵێی بە بۆنەی حاجی مێردییەوە تێکەڵاویان نەبوو بێ؟ ئەویش دەستێکی چەپەڵی خوارەوەیان بوو بێ؟! یان ئەو دەستی ناو لنگانی خوارەوەیان بوو بێ؟.. دەبێ و دووری بۆ مەڕۆ وا بێ" لە هەموو رووێکەوە لە گشت بارەیەکەوە، جوانی هەڵگێڕ و وەرگێر دەکرد کەچی لەبەر چاوی نە دەکەوت، تا دەهات وێنای لە دەروونیدا ورشەدار تر دەبوو... وێنەی دایکی زریان و لەعلی نەیان دەتوانی ورشە و پرشەی جوانییەکەی جوان لە دڵیدا کز بکەن... قەت وا تێ نەکەتبوو ئەو بێ عەقڵییەی کردی بۆ ئەو زۆر بوو، بیری لەوە دەکردەوە چۆنی پینە بکات... خۆ ئەگەر رۆژێك هات ناچار بوو دەستی هاوسەر بۆ پان بکاتەوە و یان هەر نەیکردەوە وای لا باش بوو ئەو کەم تەرخەمییەی دەربارەی نەنواندبایە... وا بە سووك تەماشای نەکردبایە، خۆ سووکایەتی پێ نەکرد بوو، بەڵام وەرام نەدانەوەی نامەکە لە چاو جواندا سووکایەتی دەنواند، وا بەروویان تەقایەوە و وتی:" منیش وەك تۆ ..."

***



شلێر کە زانی باوکی بە تەنها دانیشتووە، دەیویست دەرفەتێکی وا وەربگرێ و لە بارەی ماڵی مەلا جەوهەرەوە بیدوێنێ، چووە تەنیشتی و بێ یەك و دوو وتی:

- بابە.. کەی دەچیتە ماڵی مەلا جەوهەر؟...

بارام یەکسەر زانی شلێری کچی ئەو پرسیارەی بۆ کرد، ئەو چۆن دەیتوانی ناو دڵی خۆی بخوێنێتەوە وەهاش پەی بە نیازەکەی شلێری برد کە مەبەستی چییە، ئەوەی شلێر گەرەکییەتی و بە ئاشکرا ناتوانێ دەری بڕێ ئەم لە زووەوە بیری لێ کردووەتەوە بۆیە وتی:

- خەیرە بچم بۆ ماڵیان؟...

بۆیە وای وت تا زیاتر شلێر هەڵبنێ لە دووتۆی قسە بۆندارەکانیدا نیازەکەی دەربخات.

- ئەی ناچیتە لایان چاوەروونیان لێ بکەی؟..

- ئەی نەم وت: من خۆم هێنامەوە و خۆشم بووم بە کەفیلی!

- ئا... زانیم... ئەی لە ماڵەوە چاوروونیان لێ ناکەیت!..

وەرامەکەی بارام قوفڵدانی بابەتەکە بوو، کەچی شلێر بەزیرەکانە پەنجەرەیەکی تری لەسەر بابەتەکە کردەوە... بارامیش رووناکی خستە ناویەوە و وتی:

- حەز دەکەی تۆش لە جیاتی دایکت بڕۆ چاوروونیان بکە.

شلێر گەشایەوە.

- ئەی بۆ لەگەڵ خۆتدا نامان بەی؟...

- دەتان بەم باشە؟...

شلێر لەخۆشییا خەریك بوو باڵ بگرێتەوە، بۆیە نەیزانی دوای:(دەتان بەم باشە)کەی باوکی چی بڵێ... بارامیش هەندێ مات بوو، لە دواییدا خونچەی زەردەخەنەیەکی لە رووی شلێردا تنگانەوە و وەك لە ناخی ئەوەوە هاتبێتە دەرەوە، رووی تێکرد:

- شلێر!؟.

- بەڵێ..

با ئێمە وەك خەڵکی تر نەبین، شت لە یەکتری نەشارینەوە، تۆ کچی گەورەمی و سۆمای هەردوو چاومی، حەز دەکەم بە ئاشکرا و راشکاوی پێکەوە قسەیەك هەیە بیکەین.

- فەرموو...

- رات لە کاروانی مەلا جەوهەر چییە؟...

شلێر بە ناو هێنانی کاروان لە خۆشیدا حەپەساو دڵە کوتێی پێکەوت و نەیزانی چی بڵێ...

- ها.. چیت وت.

- مەبەستت چییە؟...

- دەبێ مەبەستم چی بێ؟!!.
- تۆ نالێی بە راشکاوی قسە بکەین
- راست دەکەی...
کەوا بوو با پێت بڵێم: ئەگەر رووم لێ نرا و دواوای تۆیان بۆ کاروان کرد... چۆن وەرام بدەمەوە...
شلێر لە خۆشیدا خۆی گرت و بێ دەنگ بوو..
بارام رووی تێکردەوە:
- ها.. چیت وت:
- خۆت چۆنی بە باش دەزانی با وا بێ...
- یانی تۆ رازیت؟!
- تۆ و دایکم رازی بن، بە رازی بوونی ئێوەیە..
- نا رازی بوونی من بە رازی بوونی تۆیە... من بە دڵی تۆ دەکەم...
شلێر مات بوو ئیتر دەنگی نەکرد...
بە هێنانەوەکەی کاروان و بوونی بە کەفیلی و شێوەی قسەکانی ئەوەیان دەردەبڕی کە هەستی بە خۆشەویستی نێوانیان کردووە و بۆیە بێ دەنگ بوو..
لەو کاتەدا یەکێك لە دەرگای دا، شلێر حەزی نەبوو لەو ساتەدا میوانی ئێسك گران روویان تێبکات لەوە پەکیان بدات کە بچن دایکی بێننەوە و بۆ چاورورونی بۆ ماڵی مەلا جەوهەر برۆن... کە دەرگا کرایەوە، مەلا جەوهەر هاتە ژوورەوە، شلێر بە رێزو رووێکی گەشەوە پێشوازی لێ کرد:
- شلێر باوکت لە ماڵە...
- بەڵێ فەرموو...
مەلا جەوهەر گەلێ بابەتی جۆراو جۆر و ریس و گوریسی بۆ بارام هێنانە پێشەوە، نەی دەزانی لە چ لایەکەوە بابەت و هۆی هاتنەکەی بخاتە بەردەمی بارام... خۆ بارام چاك لە بن زمانی مەلا جەوهەر حاڵی بوو، ئەو سەراو و دەراوە و ئەو کۆلکە حەدیس خوێندنەوە لە پای چییە.. ئاخر پیاو کە دەستی کورت بوو، زمانی خوازبینی کورت دەبێ و درەنگ بنی بەرە هەڵدەداتەوە،، بارام لە دڵەوە گاڵتەی بەو هەلرشتنی هەمانە گزافانە دەهات کە مەلا فووی پیا دەکردن بۆ ئەوی هەڵدەرشتن، وازی لێ هێنا تا بە تەواوی بە هەموو چوار دەوردا پەلو پۆی کوتا، بە تەواوی رێی دەربڕینی مەبەستەکەی لێ ئالۆز بوو، تا لە دواییدا ئەو قسەیەی هاتەوە یاد پێی وتبوو:(نیازی هەر پرۆژەیەکت بۆ کاروان کرد حەز دەکەم پرسێ بە من بکەی..)
تۆزێ راما و وتی:
- کاك بارام.. وا هاتم پرست پێ بکەم...



- پرسی چی؟!
- ئەی خۆت نەتوت: نیازی هەر پرۆژەیەکت بۆ کاروان هەبوو حەز دەکەم پرسێ بە من بکەی!..
قوربان کاروان هەراسانی کردووین و داناکەسێ..
- چی دەوێ؟
- دەیەوێ وەك هەزاران گەنج و هاوتەمەنی خۆی بە جێمان بێڵێ و بڕوا..
- بۆ کوێ؟!
- بەرەو هەندەران...
- بەرەو هەندەران!!.
- لە خۆی بێزار بووە، ئەو کاروانەی جاران لەرێ کوردستاندا وەك پۆڵا نەدەچەمایەوە، ئەمڕۆ وا نەماوە و لە داخ زۆڵە کوردا دەیەوێ سەری خۆی هەڵگرێ... خەمی ئەوەمە کوڕەکەم لەدەست دەرچێ.. خۆت دەزانی هەر ئەو تاقە کوڕەم هەیە...
- ئەی بۆ نایبەسیتەوە...
- چۆن چۆنی؟!..
- ژنی بۆ بێنە...
مەلا جەوهەر بە وتەکەی بارام هەناسەیەکی بە بەر خۆیدا هێنایەوە، چونکە بەری قسەکانی خستەوە سەر ئەو هێڵەی کە ئەو مەبەستی بوو، بەڵام نەیدەزانی چۆنی بە سەریا بڕوات..
- ئەوەی ئەو دەیەوێ لە ویزەی ئێمەدا نییە و ئەوەش ئێمە دەمانەوێ ئەو گاڵتەی پێی دێ.. ئێستاش هاتووم بۆ لای تۆ، وا پرست پێ دەکەم...
بارام تۆزێ راما...
- ئەوەی ئەو دەیەوێ ئەگەر دەستی بکەوێ دادەساکێ...
- من ئامادەم، چی دەڵێی وایە، یارمەتییە هەر شتێ هەیە...
- کاك بارام ئەو بە دڵی خۆی دەکات..
بارام قسەکەی پچڕان...
- ئەی ئێوە بۆ بە دڵی ناکەن...
- بەدڵی دەکەین، ئەگەر ببێ سەر بەرزییە بۆمان.. تۆزێ مات بوو.. ئەی بۆ پەنام بۆ هێناوی.. ئەو دەڵێ: یان ئەو یان هەندەران..
- ئەو کێیە؟..
ئەوە کە؟!.. ناتوانم لە حزورتا بیڵێم..
- ئەها.. تێگەیشتم!.. ئەی بۆ نایڵێی!؟

مەلا جەوهەر کشایەوە ناو قەوارەکەی خۆی، زانی بارام لە مەبەستەکەی حاڵی بووە، بۆیە خۆی بۆ وەرگرتنی بڕیاری بارام ئامادە کرد...

بارام رووی کردە مەلا جەوهەر...

ئەگەر وەها بێ کچ کچی خۆم و کوڕ کوڕی خۆم...

هێشتا وتەکە لە دەم بارامدا تەواو نەبوو، مەلا جەوهەر پەلاماری دا دەستی ماچ بکات، بەڵام بارام دەستی خۆی کشانەوە و یەکتریان ماچ کرد...

مەلا جەوهەر لە خۆشیاندا وا کرایەوە خەریك بوو لە ژوورەکەدا جێی نەبێتەوە...

بارام ویستی لەنگەری مەسەلەکە رابگرێ بۆیە وتی:

- بە مەرجێ کوڕ و کچە هەر دووك بە حەزی خۆیان بێ..

- قوربان لە حەز بەدەرە..

بە وردە پێکەنینەوە!...

- بە حەزی من و تۆ نییە...

مەلا جەوهەر لە خۆشیا هەر ئەوەندەی پێ وترا:

بەڵێ وایە... زۆر راستە، زۆر...

مەلا جەوهەر ویستی بڕوا، بارام رای گرت و پێ وت:

ئێستا کە گەڕایتەوە، کاروانم بۆ بنێرە، پێی بڵێ: بێت کارێکی پێویستم پێی هەیە... مەلا هیچ خەمت نەبێ لە ئەمڕۆوە بە دوا کاروان کوڕی هەر دووکمانە... چی پێویستی زەماوەند و تفاقی ماڵ هەبێ لەسەر خۆم، خەمت نەبێ و دڵنیا بە..

شلێر لە پشت دەرگاوە گوێی لە خوازبێنییەکەی مەلا جەوهەر گرتبوو، بە پێی هەڵبەزین و دابەزینی بابەتەکە ئەویش لە پشت دەرگاوە تووشی دڵە کوتێ و هەڵچوون و داچوونی دەبوو، کە باوکی وتی: کچ کچی خۆم و کوڕ کوڕی خۆم، پێ وابوو هەشت دەرگای بە هەشتی نیگینداری لەسەر پشت بۆ کرایەوە، پاش چوونی مەلا جەوهەر، بارام شلێری بانگ کرد و پێی وت:

- پیرۆزە...

شلێر خۆی لە گێلی دا..

- چی پیرۆزە...

- یانی گوێت لە من و مەلا جەوهەر نەبوو!؟.

- ؟...

***



بۆ لێخوڕینی پیکاب دەبڵ کابینەکە بارام سویچەکەی دایە دەست کاروان و خۆی لە تەنیشتی دانیشت و بەرەو ماڵی هاوار کەوتنە رێ، هەر چەند بارام دەیزانی کاروان لە هاژوژتنی ئۆتۆمبێل دا ئەوەندە شارەزا نییە، بەڵام لەبەر ئەوی ئەو کاتە بەنزین و سووتەمەنی بە هۆی فشاری نامرۆڤانەی رژێمەوە لەو پەری گرانی دا بوو، ئەوانەی کە خاوەن ئۆتۆمبێل بوون لەبەر گرانی بەنزین نەیان دەهێنانە دەرەوە، ئیتر جادە پان و بەرینەکانی شار وەك تەنها بۆ ئۆتۆمبێلی زەنگینەکان تەرخانکرابن وەهابوون ئەو دەیویست کاروان بە باشی فێری شوفێری ببێ و هەم سامی لە لێخورینی شەقامەکانی شاردا بشکێ و خۆیشی لە تەنیشتییەوە چاودێری دەکرد و لەو بارەیەوە رێنمایی دەدایە، لەسەر خۆ و بەکاوە خۆ کەوتنە رێ..

کاروان لەمە دانیشت و پاڵی دایەوە هەستی بە نەرم و نیانی ناو ئۆتۆمبێلەکە کرد و لە دڵ خۆیدا دەیوت:"پیاوە زەنگینەکان لە ناو ئەو جۆرە نازەدا دەژین بۆیە خۆیان لە قەرەی خەبات و تێکۆشان نادەن" ئەو خەیاڵاتەی سولف لێدانەکەی لە بیر برد، تا بارام بە ئاگای هێنایەوە..

بارام لە دڵەوە زۆر بە کاروان گوشاد بوو، پتر گوشادییەکەی بەوەی بوو کە لەوەتەی چاوی کراوەتەوەوە لەوەتەی ئەو دەیناسێ ئەو کوڕە خەریکی نیشتمانپەروەرییە و لەو مەیدانەدا قاڵ بووە و لە گەرەکەکەشدا کەس بە خراپە ناوی نەبردووە، چەند جارێکیش لە زەمانی رژێمدا بە تۆمەتی پەیوەندی بوونی بە شۆڕشی کوردەوە بەند کراوە، یەکێك هەر بە منداڵی بەو بیرو باوەڕە گۆش کرابێ دەبێتە هەوێنی هۆش و گیانی هەرگیز بەری نادا... هەر لەبەر ئەوە بارام بە ئاسانی کردی بە زاوای خۆی و ئێستاش دەیەوێ لە تەك خۆیدا بیباتە ناو کۆڕی هەرمان و کاسبییەوە لە رێدا پێی وت:

- من و تۆ و هاوار بەیەکەوە کار دەکەین و ئەم ئۆتۆمبێلەش دەخەمە بەر دەستی تۆ.

کاروان لە ناخەوە گەشایەوە و دەنگی نەکرد...

جا چی لەوە باشتر بوو لە رۆژێکی وەك ئەمڕۆی پڕ قات و قڕی و نەبوونی دا وا بە کامی دڵی خۆت بگەی.. شلێری خۆشەویستی ببێ بە هاوسەری، سەرچاوەی بژێوی و کاروکاسبی لەگەڵ خەزووریدا بەو ئاسانییە باوەشی بۆ بکاتەوە.. چی لەوە باشتر هەیە... بەڵام بەشدار کردنی هاواری بۆ ساغ نەبووەوە، ئایا لەبەر ئەوە بوو: دەیەوێ تۆڵەی ئەوەی بۆ بکاتەوە کە بە هۆی بەرمیلەکەی ئەوەوە ئەو دەردە سەریەی بە سەردا هات، یان شتێکی تر هەیە و ئەو نایزانێ..

لە دڵەوە دەیوت: تۆ بڵێی ئەوەی رەچاو نەکرد بێ کە:

یەکگرتنی سێ زەلامی تۆمەت بۆ داتاشراوی لەو چەشنە لە رۆژێکی وەك ئەو رۆژەدا تۆمەتەکەیان قەبە تر دەکات؟ تۆزێ گومان لەسەریان خڕ دەکاتەوە.. خۆ لە رۆژێکی وا دا مرۆڤ هەر تۆمەتی درایە پاڵی لە چاو خەڵکەکەدا هەر ئەوەیە، وەك مۆری داغمە لێی نابێتەوە، با تۆمەتەکە پیرۆزیش بێ، جا چی لە تۆمەتی نیشتمان پەروەری پیرۆز تر هەیە، ئێمەی کورد لەسەر تۆمەتێ پیرۆز

راهاتووین، داگیرکەرانمان کە بە خیانەت و عوسات تاونباریان دەکردین مەبەستیان ئەوە بوو خۆمان ولاتی خۆمانمان خۆش دەوێ و ولاتپارێزی دەکەین، جا چی لەو تۆمەتە پیرۆز ترە... داخ ئەوەیە، ئەوانەی ئەو تۆمەتە دەدەنە پاڵ یەکتری، تفی بەرەو ژوورە بەر خۆیان دەکەویتەوە...

***

بارام و کاروان هێشتا لە بەردە بازەکانی بەر دەرگاکەی ماڵی هاوار نەپەڕیبوونەوە ئەوبەر، منداڵەکان و دایکەکەیان ڕاپەڕین، وەك چاوەڕوانی فریاکەوتەیەك، یان میوانێکی ئازیز بن، شڵەژان و گەشانەوە، ئەو پارووە نانەی ناو دەمیان کە لە برساندا کەمیان دەجوی، زوو قووتیاداو لێوی خۆیان بە قۆڵ و پشتی دەستیان پاك کردەوە و هەڵسانەوە سەر پێ، ئەو پەتووە شڕەی کە لەسەری نانیان خوارد بوو پێچایانەوە و گرمۆڵەیان کرد، ئەو پێڵاوە شڕانە کە ڕۆخ دەرگاکەیان گرتبوو دایکەکە زوو لای دان، زاروڵەکان بە چاوی مات و پڕ پرسیاری ساوانەی بێ گەردەوە ڕوو بە هاتنەکەی بارام ڕاوەستان، هاوار بۆ پێشوازی هاتە دەرەوە، ئەو برە پارەیەی کە وەك خەرجی بەرباخەڵ بە هەر بەندێکی ئازاد کراو دەدرا، جۆرە بوژاندنەوەیەکی بە بەر لەشی سەرجەمی گشت ئەندامەکانی ماڵدا هێنا بوو، ئازار و غەم و کوێرەوەری و هەتیوو باری، باری لاوازیان لەسەر لێو و دەفەی سنگی دایکەکەدا نەخشاند بوو، ئەو جووتە مەمکانەی کە سەرچاوەی ژیان و گەورە کردنی حەوت کۆرپە بوون وەك هەنگڵی هەمانەی بەتاڵیان لێ هاتبوو، ئەوەندە چەق ببوون توانای دەرپەراندنی کراسە تەنکەکەیان نەمابوو، منداڵە نەخۆشەکە تازە لەرزوو تاکەی ڕسکا بوو، بەڵام هێشتا بە تەواوەتی نە هاتبووەوە سەر خۆی، ئەو لە هەمووویان پتر چاوی بڕیبووە بارام و کاروان، وەك بە زمانی ساوایانەی ناوەوەی بڵێ:

(ئەوە بو منی گەیاندە نەخۆشخانە..!).

دایکە کە لە گەڵ ئەوەشدا کە کوێرەوەری تەڕی لە لەشیدا چك کرد بوو، ئافرەتێکی قسەزان و چاپووك بوو، کە لەگەڵ بارامدا کەوتە قسە، هەوڵی دەدا سنگە ڕەقەکەی بە یەخەی کراسەکەی داپۆشێ، دەربەس بەوە نەبوو کە جار جار دەستی لە کراسەکەی بەر دەبوو تەواو سنگی دەردەکەوت، وەکو ساجە کەل و شك و ڕەق بوو بووەوە.. لەتافی لاویدا وەکو مەڕ مەڕی سوور و سپی بریسکاوەتەوە و لە بن سوخمەی خامەکی سەوزدا دوو گومبەتی زێڕین و بریسکەدار سەما و حەی حەیان کردووە.. کێ لەم ئافرەتە گەورەترە؟! لەگەڵ ئەو هەمموو دەردە سەریە دا بووە بە سەیوان بۆ حەوت منداڵ، بۆیە وەك چلۆسکی ڕەقی لێ هاتبوو، حەوت منداڵ لە ئەستۆیدایە و بەو هەمموو دەردەوە برژاوە.. ئای چەند بە سۆزەوە ڕووی کردە بارام و وتی:

– بە قوربانت بم.. کوڕم بۆ کوێ دەبەی...

– خەمت نەبێ... پێکەوە کار دەکەین...



– سەرگەردانت بم.. بە دەورتا گەڕێم، مەیەڵە کوڕم تێکەڵاوی ئەو ئەم ببێ لەوە زیاتر تاقەتی ماڵ وێرانیم نییە.

(ئاماژەی بە منداڵەکان دا) چاوما لە خوا و ئەو تاقە برایەیە.. تۆ خوا مەیەڵە خۆی لە قەرەی سیاسەت بدا..

بارام پڕ بە دڵ گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو، چاك لە کزەی دڵی تێدەگەیشت...

– خەمت نەبێ...

– بڕوانە بۆ حاڵمان ئەوجا دەزانی چی دەڵێم... حەز ناکەم هاوار تێکەڵاوی لەگەڵ کەسانی سیاسەتباز دا بکات...

بارام پێکەنینێکی نەرمی بە سەر قسەکانی دا.

– خەمت نەبێ... سیاسەتبازەکان تازە سوار بوون، تا لێیان نە قەومێ دانابەزنە لامان... ئێمەش ئاوڕیان لێ نادەینەوە و دژیشیان ڕاناوەستێن، بەڵام کە لە ڕێی ڕاست لا بدەن دایکی نیشتمانیان لێ هان دەدەین....

دایکەکە نەیزانی کە بارام لە خۆشی قسە بە سۆزەکانی ئەودا وای وت، دەنا مەبەستێکی وای لە دایکی نیشتماندا نەبوو بۆیە وتی:

– دایکی نیشتمان کێیە؟!...

– دایکی نیشتمان؟!.. پێت بڵێم یان پێت نەڵێم؟!..

بارام ویستی جۆرە خۆشییەك بخاتە دڵ ئەو خێزانەوە کلۆڵەوەو وا بکات کە پێی ئالوودەبن.

– دایکی نیشتمان.. ئەو ئافرەتەیە کە نابەزێت، ئەوەی نەوەی نوێ پێڕا دەگەینێ... تۆیت...

بارام لە جیاتی ئەو ماوەیە کە هاواری تیا بە ناحەق بەند کرابوو برە پارەیەکی لە زەرفێکی ئاوسادا، ئامادە کردبوو، دەستێکی بەسەر منداڵە نەخۆشەکەدا هێناو، زەرفە پارەکەی دایە دەستی و پێی وت:

– ئەوە کێك و نوقڵە، تا ئێمە لە بەردە بازەکە نەپەڕینەوە دەستی لێ نەدەی، ئەوجا بیدە دەست دایکت، باشە؟!

– باشە...

وا دیار بوو هاوار بە دایکی نەوتبوو: بارام خاوەن ئەو بەرمیلەیە کە ئەوی لە پادا گیرا، دەنا دایکی هاوار وا بە ئاسانی و بێ پرس و خواس لێی نەدەگەڕا، لای کەمییەوە هێنان و بردنی پۆلیس و گەڕەلاوژەکانی دادگا وەك هەڵڕشتنی سکاڵای دەروون بۆ دەگێڕایەوە، وێڕای ئەو بارە کەوتووەی و نەبوونی و تازییە باری و منداڵی ورد، تووشی چەرمە سەرێییەکی وەهایان کرد با بە دەواری شڕی نەکات، گرتنی هاوار و ئەو چەرمەسەرێیە ئەوەندە کاریان تێ کرد بوو هەر کەس قسەی لەگەڵدا

بكردايه يەكسەر ئەو كارەساتەى لە نووكەوە بۆ دەگێڕايەوە، كەچى بۆ بارامى نەگێڕايەوە، بە وا ديار بوو هاوارى كوڕى پێى نەوتبوو ئەوە خاوەن بەرميلەكەيە...

***

لە كۆشەى فرۆشگاكەدا هەر سێكيان دانيشتن، بارام ئەو رۆژەى بە ياد هاتەوە كە لە وێدا بۆ يەكەم جار لەگەڵ زرياندا و دووەم رۆژ لەگەڵ ئەو و باوكى دا يەكتريان ناسى و بۆندى بەيەكەوە كار كردنيان بڕيار دا، ئەو بەياد هاتنەوە هۆشى بە لاى ئەو بيرە دا راكێشا كە هەميشە دەيوت: ئەم گەردونە دەوران دەورانە و لە ناو بێژنگێكى گەورەدايە و دەستێكى نهێنى دەى سووڕێنێ، ئەم جيهانەش لە ناويدا سەرگەردانە و ساتێك لە بزوتن ئارام ناگرێ، بێ ئاراميیەكەى نهێنييەكانى (مان) و بەردەوام بوونى دەدركێنێ... ئاوايە ژيان هەر ساتەى لە رووێكەوە خۆى پيشان دەدا و، هەميشە لەخۆ نوێكردنەوە ناكەوێ.. لەوە زياتر نەيهێشت بيرى بە ناو خۆيدا رۆبچێ... رووى كردە كاروان و هاوار:

– ئەم فرۆشگايە هى من نييە، هى پياوێكە بە ئەمانەت بە منى راسپاردووە، شوێنى كڕين و فرۆشتنى دەرگا و پەنجەرە و شتمەكى بيناسازى و بەرميل و ترانسفۆرم ئێركۆدێشن و جۆرەها ماشين و ئامێر و كەل و پەلە، خاوەنەكەى ئەو مافەى بە من داوە كە رام لە كێ بێ بە مانگانە بە كرێى بگرم، وا منيش ئێرە بە ئێوە رادەسپێرم، ئێوەش دەبێ بە دڵسۆزى و دڵپاكى كارەكان ئەنجام بدەن، رۆژانەش خۆم سەرتان لێ دەدەم... كاروان بەو پيكابە كارەكانى ناو شار دەكا رووى كردە هاوار:

– تۆش لێرە سەرپەرشتى ئەم فرۆشگايە دەكەى، لەمەو دواش فێر دەبێ چۆن چۆنى كارەكان ئەنجام دەدەى...

بۆ ئەوە تەواو شتەكانى ناو فرۆشگاكەيان پيشان بدا و نيازيشى وا بوو ئەو شتەى كە دەيويست بە هاوارى پيشان بدا بيكات بە شتێكى كتوپڕى و هاوارى پێ تاقى بكاتەوە...

بە ناو فرۆشگاكەدا گەڕاندنى تا گەيشتنە ئەو سووچەى كە بەرميلەكەى تيا دانرابوو، بارام رووى كردە هاوار و وتى:

– ئەم بەرميلە دەناسييەوە؟!...

هاوار يەكسەر بەرميلەكەى ناسييەوە واقى وڕما... زوو بەرميلەكەى وەرگێڕا، ئەو ناوەى پيشانى بارام دا كە بە بۆيەى سەوز لەسەرى نووسرابوو:

– ئاى!.. ئەم نووسينە واى بەسەر مندا هێنا...

بارام دايە قاقاى پێكەنين و سەرنجى كاروان و هاوارى بۆ بنى نووسينەكە راكێشا و وتى:

– ئەوە دەسنووسى ئەڤينى كچمە لەمە فێرى نووسين بووە، ناوى خۆى و ساڵى لە دايك بوونى خۆى لە دار و ديوارى ماڵەوە نووسيووە... سەيركەن لەبن ناوەكەدا ساڵى (1988) نووسراوە...



هاوار و كاروان سەيرى يەكتريان كرد... هاوار بە داخەوە وتى:

– شوێن نەمابوو لێى بنووسێ، ئەم بەرميلە نەبێ... بارام رووى تێ كرد:

– دەزانم چى دەڵێى ئەى نازانى رووداوەكان بە كۆن و نوێيانەوە سەرەتا لە شتێكى وا بێ بايەخى كەمەوە سەريان هەڵداوە...

كاروان بۆ دڵدانەوەى هاوار و پەسەند كردنى وتەكەى بارام وتى:

– ئەمە لێرە وا بوو، ئەى بۆ باسى ئەو پياوە ريش سپييە ناكەى كە ئەوانى ئەولا گرتبوويان... بڵێ لەسەر چى و بە تۆمەتى چى گرتبوويان، هەر لەبەر ئەوە بوو كە لە بازاڕدا قەيسى فرۆشتبوو، وتبووى:(زەردە لوو، دەرمانى كۆخە و پەسيوە... زەردە لوو...!)..

بارام بە ئاساييەوە رووى كردە كاروان:

– ئەويش بەربوو!.

– بەڵێ لەگەڵ هاواردا سەر بەسەريان پێ كرا...

رووى كردە هاوار... وا نەبوو...؟

– هاوار سەرى غەمناكى لەقان و دەنگى نەكرد...

بارام بە پێكەنينێكى پڕ بە غەم و پەژارەوە...

– ئێستا ئەو بەرميلە دەيبەينەوە بۆ ماڵ، لەوێ بۆياخێكى سپى دەكەين بۆ ئەوەى بزر نەبێ ناوى كچە بچووكەكەم (كەركووك)ى لەسەر دەنووسين..

هاوار بە تاسەوە.

– بە چ رەنگێك؟!..

– بەرەنگێگ كە دوژمن تۆقێنەر بێ و رەوتى كوردايەتى راست بكاتەوە...

***

2000/11/28

## بەرهەمەکانی نووسەر

| | | |
|---|---|---|
| 1. | سایکۆلۆجییەتی خوێندنەوە | 1969 |
| 2. | بنچینەنی وتنەوەی زمانی کوردی | 1971 |
| 3. | فاڵچی.. درامایە | 1973 |
| 4. | شەوێك لە ژیانی خانزاد.. درامایە | 1977 |
| 5. | گوندەکەم... درامایە | 1981 |
| 6. | خاتو کلاّو زەڕ... درامایە | 1982 |
| 7. | خەونەو خەون نییە... درامایە | 1985 |
| 8. | دابەشبوونی زارەکانی زمانی کوردی- وەرگێڕدراوە | 1987 |
| 9. | دایکی کوردان... درامایە | 1997 |
| 10. | درامای کوردی لە ناو درامای جیهاندا | 2001 |
| 11. | پیری شالیار، ڕۆمان | 2004 |
| 12. | ئەدەبی منداڵانی کورد، بەرگی دووەم | 2005 |
| 13. | ئۆریست کەی دەگەڕێتەوە.. دراما | 2005 |
| 14. | بەرمیلی قوپاو.. ڕۆمان | |

ئەمە جگە لە نووسینی چەندان کورتە چیرۆك و چەندان لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لە مەیدانی ئەدەب و هونەری دراما و پەروەردە، کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاوبوونەتەوە.